پرۆژەی چاپی کتێبی مێخەک

زنجیرەی کتێب: ٥٤

***

**سەرپەرشتی گشتیی زنجیرە:** سۆران خالد




**کتێب:** بنەماکانی نووسینی ئەکادیمی

**بابەت:** نووسینی ئەکادیمی

**نووسەر:** فەرمان حەسەن

**چاپ:** یەکەم

**تیراژ:** ١٠٠٠دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (١٣٢٤)ی پێ دراوە.

**ساڵی چاپ:**٢٠٢٠

**چاپخانە:** مێخەک

**نرخ:** ٥٠٠٠ دینار



mexekbooks@gmail. com٠٧٥٠٤١٤٥٢٥٠  facebook/ktebfroshymexak

## پێڕستی بابەتەکان Index of topics

**بەشی سێیەم:**

## پێشەکی Introduction

نووسین(writing) شێوازێکە لە شێوازەکانی گوزارشتکردنی مرۆڤ لە بیروڕاکانی لە ڕێگەی وشەو ڕستەو کۆمەڵێك دەستەواژەی زمانەوانی و دارشتنیان لە چوارچێوەی بابەتێکی دیاریکراودا، گرنگترین ئامرازی گەیاندن و پەیوەندیکردنی مرۆڤە بە ژینگەی دەوروبەری و هەموو ئەو شتانەی کە چواردەویان گرتووە، پرۆسەیەکە کۆمەڵێك توانست و کارمەیی عەقڵی و هزری و دەستی لەیەك کاتدا لەخۆگرتووە کە پێویستی بە جۆرێك لە هاوڕێکی و گونجانی تەواو لە نێوان چاو دەست و عەقڵ و بیرکردنەوە هەیە، لە هەمان کاتدا پێوستی بە پابەندبوون بە کۆمەڵێك بنەماو داواکاری و هەنگاوی دروست هەیە.

ئەگەر نووسین وەك پرۆسەیەکی عەقڵی و هزری ئالۆز بە مانا گشتیەکەی پێویستی بە شارەزایی و چوارچێوەبەندیەکی دیاریکراو هەبێت، ئەوا نووسینی ئەکادیمی( Academic writing) پرۆسەیەکی زۆر ئاڵۆزترەو پێویستی بە ئاستێکی بەرزی کارامەیی و شارەزایی و پابەندبوون بە کۆمەڵێك یاسا و ڕێسای نووسین و داواکاری زمانەوانی وپەیڕەوکردنی زنجیرەك هەنگاوی هزری و کرداری دروست هەیە، لە سەرووی هەمووشیانەوە دەستپاکی لە نووسین و پابەندبوون بە بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی.

ئامانجی نوسەر لە نووسینی ئەم کتێبە ئاشناکردنی خوێنەری کوردە بە بنەماکانی نووسینی ئەکادیمی بە تایبەت کەسانێك کە سەروکاریان لەگەڵ کاری ئەکادیمی لە زانکۆو ناوەندە زانستی و ئەکادیمیەکاندا هەیە، لە ناویاندا فێرخوازانی زانکۆ کە زۆربەیان وێرای زانینی زمانی بێگانەو خوێندنەوەو نووسین بەزمانی تر، بەلاَم لەگەڕان بە دوای سەرچاوەی زانستی و بەدەستهێنانی زانیاریدا بە پلەی یەکەم پشت بەزمانی دایك کە زمانی کوردیە دەبەستن، هەروەها پڕکردنەوەی کەلێنێکی بچووك لە کتێبخانەی کوردی کە تا ئێستا هەژاریەکی زۆری لەبێ سەرچاوەیی ئەم بابەتەوە پێوە دیارە.

گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە کە نوسەر لە ئامادەکردن و نووسینی نووسینیدا پشتی بە کۆمەڵێك سەرچاوەی جۆراوجۆری پەیوەندار بە بنەماکانی نووسینی ئەکادیمی بە زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی وفەرەنسی بەستووە بە جۆرێك زۆرترین زانیاری دەبارەی نووسینی

ئەكادیمی و لایەنە جیاجیاكانی نووسینی ئەكادیمی لەخۆگرتووە، ناوەڕۆكی كتێبەكەشی بەسەر سێ بەشدا دابەش كردووە، لە بەشی یەكەمدا بە ناساندنی چەمكی نووسینی ئەكادیمی و گرنگترین تایبەتمەندیەكانی نووسینی ئەكادیمی كەپێیانەوە دەناسرێتەوەو بە هۆیانەوە لە شێوازەكانی تری نووسین جیادەكرێتەوە دەستی پێ كردووە، دواتر ڕەگەزە بنەڕەتیەكانی نووسینی ئەكادیمی و هەنگاوەكانی ئەنجامدانی نووسینی ئەكادیمی وەك پرۆسەیەكی هزری و عەقڵی و داواكاریە زمانەوانیەكانی نووسینی ئەكادیمی خستۆتەڕوو. لە بەشی دووەمیشدا گرنگترین جۆر و شێوازەكانی نووسینی ئەكادیمی خستۆتەڕوو كە بریتین لە وتارو ڕاپۆرت و كورتەنامەی زانستی و كورتەتوێژینەوەو سانتێزو توێژینەوەو پەرتووكی توێژینەوەو پێداچوونەوەی پەرتووك و پێداچوونەوە بە توێژینەوەكانی پێشوو و پێداچوونەوەی هاوەڵان گۆڤاری زانستی. هەرچی بەشی سێیەمە كە تایبەتە بە دەستپاكی ئەكادیمی لە نووسیندا تیایدا بە چەمكی دەستپاكی ئەكادیمی و بنەماكانی دەستپاكی ئەكادیمی دەستی پێ كردووە، دواتر چەمكی ناپاكی ئەكادیمی و گزیكردن لە ڕوانگەی زانكۆو ناوەندەئەكادیمیەكان و جۆرو شێوازەكانی گزیكردن و هۆكارەكانی گزیكردن و چۆنیەتی ریگرتن لە گزیكردن و پێداویستیە بنەڕەتیەكانی دووركەوتنەوە لە گزیكردن و ئامرازەكانی ئاشكراكردنی گزیكردن و بەناوبانگترین كەیس و دیاردەكانی گزیكردنی خستۆتەڕوو.

نوسەر

١٧ ی ئەیلولی ٢٠٢٠

## نووسینی ئەکادیمی Academic writing

نووسینی ئەکادیمی (Academic writing) چەمکێکی فراوان و گشتگیرو پەیوەندار بە بوارگەلی زانستی و ئەدەبی جۆراوجۆرە، تا ئێستا پێناسەیەکی گشتی و دیاریکراوی بۆ نەکراوە، چونکە بەکارهێنانی لە هەر بوارێکدا کەوتۆتە ژێر کاریگەری چەندین فاکتەری پەیوەندار بە بوارەکەوە، بەڵکوچەمکێکە زۆرترین پێناسەی بۆکراوە بە جۆرێك هەر نوسەرێك یان شارەزایەکی بواری نووسین لە ڕوانگەی خۆی و ئاراستە زانستیەکەی پێناسەی کردووە، ئەمەش بۆتە هۆی بوونی پێناسەگەلی جیاواز بۆ چەمکەکە، هۆکاری ئەم جیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی میتۆد و جیاوازی ڕێگاکانی لێکۆڵینەوە لە بوارە جیاجیاکانی ئەدەبی و زانستی و تەنانەت لەناو یەك بوار لە ڕشتەی جۆراوجۆردا. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك بنەمای گشتی هەن کە هەموو لایەك لەسەری کۆکن، وەك پابەند بوون بە بنەماکانی دەستپاکی و زمان پاراوی و فۆرماڵیتی ووردبینی وبابەتێتی و بێ لایەنی و بەرپرسیارێتی و ئامانجداری و بەڵگەداری وشیکاری و چڕی و ئالۆزی و دابەشکردنی دەقی نوسراو بەسەر پێشەکی و ناوەڕۆك و کۆتایی.

نووسینی ئەکادیمی(Academic writing) لە پێناسەیەکی کورتدا بریتیە لە شێوازێك لە شێوازەکانی بڵاوکراوەی شیکاری ئامانجدار پشت بەستوو بە بنەمای فۆرماڵیتی و وردبینی لە نووسیندا (Define Academic Writing,www. tutorvista. com). یان بریتیە لە شێوازێك لە نووسین کە پابەندە بە چوار چێوەو هەنگاوگەلێکی کرداری وەك پێکهاتەی فەرمی و سیستم و گەڕان بە دوای توێژینەوەکانی پێشووتر بۆ پاڵپشتی کردنی بیرۆکەکان و ڕەچاوکردنی تۆن و بنەمازمانەوانیەکان و دانانی خاڵبەندی لە نووسیندا. ئەمەش بۆتە هۆی جیاوازی نووسینی ئەکادیمی لەگەڵ جۆرو شێوازەکانی دیکەی نووسینی ئاساییدا( Academic Writing Definition,www. reference. com).

لە فەرهەنگی (Your Dictionary) پێناسەی نووسینی ئەکادیمی کراوە بە بەوەی بریتیە لە هەر نوسراوێك کە هەوڵی هێنانەدی داواکاریەك لە یەکێك لە فاکەڵتی یان زانکۆکاندا دەدات، هەروەها ئەو نوسراو چاپکراوانەش کە مامۆستا و توێژەرەکان دەینوسن و لە کۆنگرەو ناوەندە زانستیەکاندا پێشکەشەی دەکەن، بەڵام لە پێناسەیەکی فراواندا نووسینی ئەکادیمی دەشێت

سەرجەم چالاکی و بەرهەمی نوسراوی وەك وتار و پرۆپۆزەڵ و لێکۆڵینەوەو نامەی ماستەرو تێزی دکتۆرا و بابەتی جۆراوجۆری زانستی ناو گۆڤارە ئەکادیمیەکان و هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوە بە دەقی زاستی لە ناوەندگەلی زانستی و ئەدەبی و ئەکادیمی بگرێتەوە (Definition of Academic Writing,www. grammar. yourdictionary. com)

سوایەڵز و فیك ( Swales and Feak) لە پێناسەی نووسینی ئەکادیمیدا دەڵێن: بریتیە لە شێواز و ڕێکخستنێکی زمانەوانی کە کۆمەڵێك ئامراز و واتا و وشەو پێکهاتەو تایبەتمەندی لەخۆگرتووە بۆ نووسینی لێکۆلینەوەی زانستی و نامەو تێز و ڕاپۆرت و بابەتی زانستی کە بۆتە هۆی جیاوازی ئەم شێوازە نووسینە لەگەڵ جۆرەکانی تری نووسیندا( Swales & Feak ,٢٠٠٥).

نووسینی ئەکادیمی، بریتیە لە نووسینی زاناکان بۆ زنایانی تر ( Academic writing is writing done by Schoras for other scholars)، یان نووسینی فێرخوازان و زانایانی پسپۆر بۆ هاوەڵەکانیان (Dartmouth Writing Program,www. dartmouth. edu). هەروەها پێناسە کراوەبەوەی بریتیە لە شێوازی نووسینی تایبەت بە دام و دەزگا ئەکادیمیەکان. بە واتایەکی تر بریتیە لە شێوازێك مامۆستایان و فێرخوازانی زانکۆ و خوێندنی بالآ بۆ نووسینی وتارو نامەو تێز و پەڕاوی زانستی بەکاری دەهێنن، گرنگترین ئەو وتار و پەڕاوە زانستیانەش بریتین لە نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرا وەك پێداویستیەك بۆ دەست هێنانی بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرا لە لایەن فێرخوازانی خوێندنی بالآوە، هەروەها وتارو بلاوکراوەی زانستی و ڕەخنەی زانستی و توێژینەوەکان و پێداچوونەوەی ئەدەبی ( Literature Review) وتوێژینەوەی بەراوردکاری و مێژووی (Comparative and Historical Studies) و ڕاپۆرتی تاقیگەیی ( Lab Reports) و ئەبستراکت (Abstracts) وەك ئەوەی ( Way link enghish) ئاماژەی پێ کردووە:

Academic writing is a particular style of writing that is characteristic of academic Institutions. In other words, it is a style that is used by undergraduates, graduates, and lecturers when they explore particular academic questions in essays, dissertations, PhD theses, and academic papers"(What is Academic writing, ww w. waylink-english. co. uk).

بەو مانایە نووسینی ئەکادیمی چەمکێکی پەیوەندارە بە بوارە جۆربەجۆرەکانی نووسین و بڵاوکردنەوە، چەندین ڕێگاو شێوازی جیاجیا لەخۆ دەگرێت کە هەرکەیان تایبەتمەندی خۆیان هەیە، بابەتێکە بە شێوازێکی ڕەخنەگرانەی زانستی لەسەر بنەمای عەقڵ و لۆژیك ئامادەکراوەو دابەش کراوە بەسەر پێشەکی و ناوەڕۆك و کۆتایی بە جۆرێك هەموو ڕێ و شوێن و هەنگاوە زانستیەکانی نووسینی ئەکادیمی لەخۆ گرتووە، ئەم تایبەتمەندیەش لە نووسیندا بۆتە هۆی جیاوازی نووسینی ئەکادیمی لەگەڵ شێوازەکانی تری نووسینی ئاساییدا.

## ١-تایبەتمەندیەکانی نووسینی ئەکادیمی Characteristics of Academic Writing

نووسینی ئەکادیمی چەندین کارامەیی گرنگی لەخۆگرتووە، وەك پێکهێنان و دروست کردنی ڕستە (Sentence Structure) و ڕێکخستنی بیرۆکەکان (Organization) و دانانی خاڵبەندی و پەیڕەوکردنی بنەما ڕێزمانیەکان (Grammar and punctuation) و هەوڵدان بۆ تیشك خستنە سەر چەند لایەنێکی گرنگی پەیوەندار بە باب٠ەتی نووسین، بۆیە هەمیشە بە چەند تایبەتمەندیەك دەناسرێتەوەو گرنگترینیان بریتین لە ئاراستەکاری(Orientation) وبابەتێتی (Objectivity) و ڕێکخستن و بەهێزی(Organization and Strength) و زمان پاراوی و (Faultlessness) و ڕەسانەیەتی و تازەگەری(Authenticity and Modernity) و دەسپاکی .(Integrity)




شێوە(١. ١)تایبەتمەندیەکانی نووسینی ئەکادیمی ڕوون دەکاتەوە

## ١.١-ئاراستەكاری Orientation

بواری نووسین بە گشتی دابەش دەبێت بەسەر دوو بواری ئەدەبی و زانستی، هەر بوارێکیش لەو دوو بوارە چەندین ڕشتەی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت بە جۆرێك هەر ڕشتەیەك جەماوەرو خوێنەری تایبەت بە خۆی هەیە، بۆیە هەر بابەتێك كە پەیوەندی بە ڕشتەیەك لە ڕشتە ئەدەبی و زانستیەكانەوە هەبێت ئاراستەی جەماوەرێكی تایبەت دەكرێت كە خوێنەری تایبەتی بوارەكەن، جەماوەری ڕشتە ئەدەبیەكان خوێنەری شیعرو چیرۆك و ڕۆمان و لێكۆڵینەوەو ڕەخنەی ئەدەبین، ڕەنگە بەشێكیان خوێنەری چیرۆك و ڕۆمان بن و بەشەكەی تریان خوازیاری خوێندنەوەی شیعر و ڕەخنەو لێكۆڵینەوە بن، بە هەمان شێوە جەماوەری ڕشتە زانستیەكانیش خوێنەری بابەتی زانستی و ڕشتەی جۆراوجۆری زانستین. لە لایەكی تر هەر بابەتێك ئاراستەی جەماوەرێكی تایبەت لە خوێنەر دەكرێت كەلەگەڵ توانستی خوێندنەوەو ئاستی تێگەیشتنیان لە بابەتەكە گونجاو بێت. بۆ نموونە ئەدەبی منداڵان و نووسین بۆ توێژێكی تایبەتی وەك منداڵ پێویستی بە زمانێكی ساكارو شێوازێكی سادەو ڕوون هەیە بۆ ئەوەی بتوانن بە باشی بیخوێننەوەو لێی تێ بگەن. بەو مانایە نووسینی ئەكادیمی بابەتێكە جەماوەری تایبەت بە خۆی هەیە و ئاراستەی خوێنەرێكی تایبەت دەكرێت، جەماوەری نووسینی ئەكادیمیش بریتین لە مامۆستایان و ئەندامانی دەستەی وانەوتنەوە لە زانكۆ كان و توێژەران و كەسانی ئەكادیمی لە ناوەند و دەزگاكانی توێژینەوەو فێرخوازانی خوێندنی باڵا، پێویستی نووسینیش بۆ ئەم جەماوەرە بریتین لە وردەكاری و ڕاستگۆیی و بابەتی بوون لە نووسین و شارەزایی و دانسقەیی و كارامەیی لە خستنەرووی بیرۆكەو وردەكاری لە شیكردنەوەو سەلماندن، هەروەها دیاریكردنی چەمكەكان و لۆژیكی لە گواستنەوەی بیرۆكە بۆ بیرۆكەیەكی تر و لە بەشێكەوە بۆ بەشێكی تر (للكتابة الاكاديمية، مفهوم الكتابة الأكاديمية، www. sites. google. com).

لە لایەكی تر نووسینی ئەكادیمی ئامانجدارەو یەكێكە لەو ئامرازە گرنگانەی مرۆڤ لە ڕێگەیەوە هەوڵی هێنانەدی ئامانج یان كۆمەڵێك ئامانج دەدات بە مەبەستی دەرخستنی ڕاستی وڕووی ڕاستەقینەی گرفتێك و هەوڵدان بۆ چارەسەركردنی گرفتەكە، كەوابوو نووسینی ئەكادیمی بابەتێكی ئامانجدارەو ئامانج ومەبەستی نووسین یەكێكە لە هەنگاوە گرنگەكانی، جیاوازی ئامانج و مەبەستی نووسینیش لە نووسینی ئەكادیمی لەگەڵ شێوازەكانی دیكەی

نووسینی ئاسایی لەوەدایە کە ئامانجەکان لۆژیکی و گونجاون لەگەڵ قەبارەی نووسین و بواری هێنانەدیان هەیە.

ڕۆشنی ئامانجەکان (Goal and hypotheses) ودەست نیشان کردنیان بە دروستی لەهەر بابەت و پسپۆریەکدا یەکێکە لە مەرجە گرنگەکانی نووسین، ڕوونی گریمانەکانیش بە هەمان شێوە بە تایبەت لە لێکۆڵینەوەو نووسینی ئەکادیمی لە بواری دەروونزانیدا. بەلأم دیاریکردنی گریمانەکان لە سەرەتادا لە هەندێ بابەت ڕەنگە کارێکی سەخت بێت، بۆ نموونە لە لێکۆڵینەوەکانی مرۆڤناسی گریمانە یان بنەمایەکی دیاریکراو نیە، بەلأم ئامانجی دیاریکراویان هەیە کاتێك لە کەلتوری گەلێکی دیایکراو دەکۆڵنەوەو هەوڵی تێگەشتن لە ڕەفتاری ئەو گەلە دەدەن(What is Research,www. explorable. com).

نووسینی ئەکادیمی(Academic writing) بابەتێکە تیایدا نوسەر بە پێی پێویستی بابەت و بواری نووسینەکەی پەیڕەوەی لە ستایلێکی تایبەتی نووسین کردووە، بابەتی نوسراو بە شێوازێکی زانستیانە داڕێژراوە، خستنەڕووی بیرۆکەکان و داڕشتن و دەربڕینیان بە بەکارهێنانی وشەی گونجاو ڕوون و دیاریکراوەو هیچ جۆرە تێکەڵی و ئاڵۆزیەکی تێدا نیە، نوسەر خۆی بە دوور گرتووە لە بەکارهێنانی وشەی بێ سوود و گرنگی بە بەکارهێنانی ئەو وشەو دەستەواژانە داوە کە مەبەست و ئامانجی نووسینیان ڕوون کردۆتەوە، لە داڕشتنی نووسیندا لە جیاتی شێوازی درێژبڕانە پەیڕەوی لە شێوازی کورتبڕانە کردووە تا ئەو ئاستەی بابەتەکە بەو ئەندازەیە کورت نەبێت مانای خۆی لە دەست بدات.

هەروەها نووسینی ئەکادیمی تۆن(Tone)ی تایبەت بەخۆی هەیەو شێوازێکە چەمك و زاراوەی زانستی تایبەتی تیادا بەکار دەهێنرێت، وەك ئاراستەی نوسەر بەرەو بابەت و جیاوازی وشەو ڕستەو پێکهاتەو درێژی وجۆر لە نووسیندا، هەر بابەت یان توێژینەوەیەك باکگراوندێکی زانستی (Scientific background)هەیە کە نوسەر لە ئامادەکردن و داڕشتنیدا پشتی پێ بەستووە، بۆیە شارەزایی لە بابەت و بیرۆکەی زانستی و تیۆر و توێژینەوەی پەیوەندار بە بابەتەکە یەکێکە لە بنەما گرنگەکانی نووسین و مەرجەکانی سەرکەوتن لە نووسینی ئەکادیمیدا.

## ٢.١ -بابەتێتی Objectivity

نووسینی ئەکادیمی(Academic writing) زمانێکی بابەتیە نەك سۆزداری و خودی، بۆیە جەخت لەسەر زانیاری و بەڵگەو شیکاری و ڕاڤەکاری و پێکهینان و بەرهەمەهێنان بە شێواز و دارشتنێکی بابەتی دەکات، بە شێوازیکی بابەتیانە راڤەی دیاردەکان دەکات و هەوڵ دەدات پشت بە بەڵگەو زانیاری سەلمێنراو ببەستێت لە ڕاڤەکردن و گفتگۆکردن دەبارەی دیاردە جیاجیاکان. بۆ نموونە پرسیار کردن لەوەی بوونەوەر چیە ؟وەڵامی ئەم پرسیار پێویستی بە ڕوونکردنەوەو پێشەکیەکی شیکاریانە هەیە بۆ پاڵپشتی بابەتەکە. دواتر دانانی گریمانەو دیاریکردنی شێواز و ڕێگاکانی کۆکردنەوەی زانیاری و شیکردنەوەیان، بێگومان دەرنجام و پێشنیارەکان لە کۆتایی دەقی ئەکادیمیدا خودین و پەیوەندیان بە خودی نوسەر و کۆشش و کارکردنی ئەوەوە هەیە، بەڵام کۆمەڵێك بڕیارو ڕای کەسی نین کە تیایداپشت بە بەڵگەی زانستیەوە نەبەسترێت (الشهرانی، ٢٠١١).

لە نووسینی ئەکادیمیدا توێژەر بەرپرسە لەو بابەتەی دەینوسێت و بە شێوازیکی زانستیانەو بابەتیانە مامەڵە لەگەڵ دەقدا دەکات، چونکە هەست کردن بە بەرپرسیارێتی توێژەر بەرامبەر بە توێژینەوەکەی وای لێ دەکات ڕژد بێت لەسەر خوێندنەوەی قوڵ بۆ بابەتەکەی و گفتوگۆکردن لەگەڵ ناوەندی ئەکادیمی و توێژەرو پسپۆرانی پەیوەندار بە بواری توێژینەوەکەی، هەروەك چۆن ناچاری دەکات پابەند بێت بە دەستپاکی لە نووسین و قبووڵکردنی ڕەخنەو ڕاستگۆیی و دان بەخۆگرتن و گێرانەوەی هەموو بیرۆکەو ڕاستیەکان بۆ خاوەنەکانیان کە لە توێژینەوەکە بەکارهاتوون و کەڵکیان لێ وەرگیراوە(الشهرانی، ٢٠١١).

لە نووسینی ئەکادیمیدا نوسەر یان توێژەر بی لایەنانە مامەڵە لەگەڵ دەق دەکات و هەوڵ دەدات هەڵویستی بێ لایەنی خۆی بپارێزێت، هەر جۆرە لایەنگیریەك بە هەر هۆکارێکی خودی یان کۆمەڵایەتی یان شارستانی بێت بابەتەکە بە لارێدا دەبات و وای لێ دەکات نەچێتە خانەی نووسینی ئەکادیمی، جگە لەوە نووسەر لە نووسیندا خۆی لە هەر جۆرە شێوازێك لە توانج و گاڵتەکردن بە دوور دەگرێت. لە لایەکی تر لە نوسەر نهێنی پارێزەو پارێزگاری لە هەموو ئەو نهێنیانە دەکات کە پەیوەندیان بە بابەتی نووسین یان توێژینەوەکەیەوە هەیە. بۆ نموونە کاتێك بابەتی نووسین پەیوەندی بە وەرگرتنی ڕای کۆمەڵێك کەسەوە هەبێت، یان کاتێك

کۆمەڵگای توێژینەوە پێك هاتبێ لە کۆمەڵێك کەس نوسەر و توێژەری ئەکادیمی پارێزگاری لە نهێنی کەسی و شوناسی کەسەکان دەکات و بە هیچ بیانوو و پاساوێك ناسنامەی ڕاستەقینەیان ئاشکرا ناکات، لە لایەکی تر ئەگەر بابەتی نووسین یان توێژینەوە پەیوەست بێت بە ئاژەڵ و تاقیکردنەوە لەسەر ئاژەڵان چ لە تاقیگە یان مەیدانی توێژینەوە توێژەر ناچارە ڕەچاوی مافی ئاژەڵان(Animal Rights) بکات و مامەڵەی مرۆڤانە لەگەڵ ئاژەڵەکان بکات و وردەکاری لێکۆڵینەوەکە بە نهێنی پارێزراو بهێڵێتەوە.

نووسینی ئەکادیمی(Academic writing) بابەتێکە سوود و گرنگیەکی زۆری بۆ کۆمەڵگا هەیە، مەبەست لەوە ئەو سوودە زانستیانەیە کە لە ڕووی تیۆری و پراکتیکیەوە پێشکەش بە کۆمەڵگاو دام و دەزگا زانستی و ئەکادیمیەکان دەکات، ئەم گرنگیەش لە ڕەزامەندی خوێنەر یان لایەنی تر بە ئەنجامانی بابەتەکە دەردەکەوێت، بۆیە نوسەر لە لە نووسینی ئەکادیمیدا هەوڵ دەدات بە شیوەیەکی بابەتیانە مامەلە لەگەڵ دەرەنجامەکان بکات وبۆ سەلماندنی ئەو دەرەنجامە نوێ و تازانەی بە دەستی هێناوە پشت بەڵگەی زانستی و داتای ئاماری ببەستێت و لەژێر ڕۆشنایی دەرنجامەکان بە شێوازیکی بابەتیانە لێکدانەوەو شیکردنەوە بۆ بابەتەکە بکات و لە کۆتاییشدا دەرەنجامەکانی بەسەر کۆمەلگادا بگشتێنێت.

بابەتێتی(Objectivity)یەکێکە لەوتایبەتمەندیە دیارانەی کە نووسینی ئەکادیمی و توێژینەوە زانستی و ئەکادیمیەکانی پێ دەناسرێتەوە، بەڵام لەڕوانگەی زۆریك لە پسپۆران و شارەزایانی بواری نووسینی ئەکادیمی زۆربەی ئەو توێژینەوە تیۆری و پراکتیکیانەی لە وڵاتانی گەشە سەندوو بە تایبەت وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئەنجام دەدرێن بە کوردستانیشەوە لەو تایبەتمەندیە بێ بەرین، ناونیشانی زۆرێك نوسراوی ئەکادیمی گوزارشتی تەواویان لە ناوەڕۆکی نووسراوەکە نەکردوو، یان ناونیشانی زۆرێك لە توێژینەوەکان لە سەرجەم ئەو یەکانەی لەخۆ نەگرتووە کە توێژینەوەکەیان پێکهێناوە، هەروەها کەم و کورتی لە دیاری کردنی گریمانەو دانانی ئامانجەکان بە ڕوونی و دیاریکردنی گرفتی توێژینەوەو ناساندنی و شیکردنەوەی دەرەنجامەکان بە پێی گریمانەو ئامانجەکانی توێژینەوە.

## ٢.١ –ڕێکخراوی و بەهێزی Organization and Strength

یەکێك لە گرنگترین بنەماکانی نووسینی ئەکادیمی توانستی ڕێکخستن( Organizational ability)ی پێکهاتەو بەشە جیا جیاکانی بابەتی نووسینە، ئەم توانستە یارمەتی کەسی توێژەر دەدات بۆ بەش بەشکردن و ڕیزبەندی کردنی بەشەکانی بابەتەکەی بەسەر بەش و لقی جیاجیا بە شێوەیەکی ڕێکخراو کە هەر بەشێك تەواوکەری بەشکەی تر بێت و پەیوەندیەکی زانستی و لۆژیکیانە بە یەکتریان ببەستێتەوە (العزاوی، ٢٠٠٨). بۆیە نووسینی ئەکادیمی، نووسینێکی پلان بۆ دارێژراوە نوسەر یان توێژەر لە دەستپێکی نووسینیدا پلان بۆ پرۆژەکەی دادەنێت و هەنگاو هەنگاو جێبەجێی دەکات، نووسینێکی ڕێکخراوە بە شێوەیەك دەق پێك هاتووە لە ئەبستراکت و پێشەکی و ناوەڕۆك و کۆتایی، لە خستنەڕوودا ڕەچاوی یەکیەتی بابەت لە نێوان بەشەکان کراوە، هەروەها ناونیشانی سەرەکی و لاوەکی و هێماو ئامرازەکانی خاڵبەندی و پەیوەستکردن بە شێوەیەك دانراون یارمەتی دەر بێت خوێنەر بە باشی لە بابەتەکە بگات ( Features of Academic Writing,www. ٢. elc. polyu. hk).

لە نووسینی ئەکادیمی(Academic writing)دا وردبینی وروونکردنەوە( Precision and Explicitness)یەکی تەواو لە خستنەڕووی تیۆر و ڕاستی و داتای ئاماری وسەرجەم زانیاریەکانی پەیوەندار بە بابەتی نووسین ڕەنگی داوەتەوە، تیایدا نوسەر یان توێژەری ئەکادیمی هەوڵی داوە لە بە شێوازێکی ڕاشکاوانەی ڕێکخراو دەق و زنجیرەی بیرۆکەو پەیوەندیەکان بە ڕوونی و لۆژیکی دابڕێژێت و پێکهاتەی دەق بە گشتی لە ڕووی ڕستەو بیرۆکەو بڕگەو ناونیشانەکان و سەرجەم بەشەکان بەیەکەوە پەیوەست بکات و لەناو چوارچێوەیەکی لۆژیکی و بابەتی جێیان بکاتەوە(الشهرانی، ٢٠١١).

هەروەها توانستی تێبینی کردن(Observation and experimentation ability) و ئەزموون کردن دوو بنەمای گرنگن لە نووسینی ئەکادیمیدا و گرنگترین سەرچاوەن کە نوسەر لە ڕێگەیانەوە هەوڵ دەدات زانیاری و داتای پێویست دەربارەی کێشە یان دیاردەیەکی دیاریکراو کۆ بکاتەوە، مەبەست لە تێبینی کردن ڕۆچوون و قاڵبوونەوەیە لە دیاردەیەك یان درککردنە بە بیرۆکەیەك بە مەبەستی گەیشتن بە هۆکارە ڕاستەقینەکانی دیاردەکەو دەستکەوتنی زانیاری و دەرەنجامی نوێ دەربارەی دیاردەکە، ئەم ڕێگایە زۆر جار تاکە ڕێگایە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری

له کاتێکدا لێکۆڵینەوە لە دیاردەیەك و هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی دیاردەکە بە ڕێگای ئەزموون و تاقیکاری ئەستەم بێت، هەرچی ئەزموونکردنە بریتیە لە تواناو شارەزایی و کارامەیی نوسەر کە لەڕێگەی تێبینی کردنەوە بە دەستی هێناون و پشتیان پێ دەبەستێت لە کۆکردنەوەی زانیاری و داتاکان لە ڕێگەی ئەزموون و تاقیکاریدا.

نووسینی ئەکادیمی (Academic writing) توانستێکی باڵای لێکدانەوەو شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی چەمك و بیرۆکەو زانیاری و داتاکان(Analytical ability)لەخۆ گرتووە، قۆناغی شیکردنەوەی داتاکان (DataAnalysis) لە هەر بابەت و توێژینەوەیەکی ئەکادیمی بە گرنگترین قۆناغ دادەنرێت ، لەم قۆناغەدا نوسەر داتا کۆکراوەکانی خستۆتەڕوو و بە پێی ئەو ئامانجی بابەتەکەی شیکردنەوەو لێکدانەوەی بۆ کردوون، لە کاتیکدا شیکردنەوەی داتا و دەرەنجامەکان پرۆسەیەکی سەخت و ئاڵۆزەو پێوستی بە ئاستێکی بەرزی توانست و کۆششی هزری هەیە، لە باشترین دۆخیشدا نوسەر گرنگی زیاتری بە شیکردنەوەی داتاو دەرەنجامەکان داوە نەك تەنها پشت بەستن بە وەرگرتن و پاڕافرەیزکردنی بابەت و بیرۆکەی کەسانی تر، چونکە خستنەڕووی دەرەنجامەکان و ڕیزبەندی کردنیان بە بێ لێکدانەوەو پێشکەش کردنی دیدو تێڕاونینێکی تازە تەنها پێداچوونەوەیەکە نەك توێژینەوە، بۆ نموونە پشت ڕاستکردنەوەی داتاو زانیاری پێشووتر لە قالبێکی نوێدا وەك ئەوەی لە زۆربەی کاتدا لە بزاڤی توێژینەوەو توێژینەوەکاری کوردی و عەرەبی دەبینرێت.

هەروەها یەکێکی تر لەو تایبەتمەنیە بەهێزانەی کە بە سروشتی نووسینی ئەکادیمیەوە دیارە ئارەزوومەندی و خولیاو حەزی نوسەرە بۆ نووسین (Desire to write)، نوسەر لە دەستپێکی نووسیندا هەست بەوە دەکات تا چەند ئارەزوومەندی کارەکەیەو خوازیاری ئەنجامدانیەتی، تا چەند دەتوانێت بابەتەکە بنوسێت و تیایدا سەرکەوتوو بێت ولە کاتی دیاریکراودا تەواوی بکات، تا چەند دەتوانێت بەسەر ئاستەنگەکانی بەردەمی زاڵ بێت و دەستی بە سەرچاوەو کەرەستەو ئامرازی پێویست بگات، ئەمانەو کۆمەڵێك پرسیاری تر، بەمەش دەرەفەتی سەرکەوتن و داهێنانی بۆ فەراهەمتر دەبێت بە پێچەوانەی نووسینی نا ئارەزوومەندانەو سەپێنراو کە دەرفەتی سەرکەوتن و داهێنانی تیایدا کەم و سنووردارەو تایدا نوسەر لە زۆربەی کاتدا دووچاری تەنگژوە دەروونی دەبێت و هیژ جۆرە خوشی و چێژێك لە کارەکەدا نابینێت.

## ١. ٤ –زمان پاراوی Faultlessness

زمانی ئەکادیمی زمانێکە چڕتر و ئاڵۆزتر(Complexity and Density) ە لە زمانی قسەکردن یان زمانی نووسینی بابەتی ئاسایی، ئەم چڕی و ئاڵۆزیەش لەوەدا هاتووە کە دەقی ئەکادیمی دەقێکی کورت و پوختە بەڵام کۆمەڵێك وشەو دەستەواژەی چڕو واتادار و ڕستەی درێژی لەخۆگرتووە کە نە نوسەری ئاسایی دەتوانێت بینوسێت و نە خوێنەری ئاسایش دەتوانێت بە ئاسانی لێی تێ بگات. زمانێکە پێك هاتووە لە وشەو ڕستەو زاراوە و چەمك و پێکهاتەو دەق و تیۆری هەمەجۆری ئاڵۆز، ئەم زمانەش زمانێکی ڕێزمانیە تەنها کەسانێك دەتوانن بەکاری بهێنن کە لە ئاستێکی بەرزی زانینی زماندان ( Features of academic writing,www. uefap. com).

نووسین بە هەر زمانێك بێت، چ بە زمانی کوردی یان عەرەبی یان ئینگلیزی پەیوەندیەکی پتەوی بە ئاستی ڕۆشنبیری و هزری تاکەکانی کۆمەڵگاوە هەیە. زمان لە نووسینی ئەکادیمیدا زمانێکی فەرمی و ڕێزمانیەو بە هیچ شێوەیەك وشەو دەستەواژەی زاراوەیی و نەشیاوی تیایدا بەکار ناهێنرێت، زمانێکی تایبەتەو بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ گوزارشت لە خودی نوسەر ناکات. نووسینی ئەکادیمیش بەوە لە نووسینی ئاسایی جیادەکرێتەوە کە تیادا ئاستێکی بەرزی زمانەوانی و زمان پاراوی ڕەنگ دەداتەوە، تەنانەت شێوازی داڕشتن و زمانەوانی باش لە نووسینی ئەکادیمیدا پێوەرێکی بنەڕەتیە بۆ بڕیاردان لەسەر باشی و ڕاستگۆیی و بابەتی بوونی وتار و توێژینەوەی زانستی و گرنگی و وەرگرتنیان لە ناوەندگەلی زانستیدا، بۆیە زمانی نووسین لە نووسینی ئەکادیمیدا زمانێکی پاراو بی کەم و کورتی و هەڵەی زمانەوانیە.

دەقی نوسراو بە شێوازی ئەکادیمی، دەقێکی بەهێزە لەڕووی زمان وناوەڕۆك و داڕشتنەوە، ئەم بەهێزیەش گوزارشت لە بیرکردنەوەی قوڵ و بەهێزی زمان وئاستێکی بەرزی ڕۆشنبیری دەکات کە لە دەقی تردا بوونی نیە(الشهراني، ٢٠١١). هەروەها لە دەقی نوساروی ئەکادیمیدا کۆمەڵێك توانستی زانستی و کرداری (Scientific and procedural ability) ڕەنگی داوەتەوە کە پەیوەندیان بە بەهێزی زمان لە داڕشتن و بەگارهێنانی چەك و زاراوەی شیاو بۆ گوزارشتکردن و زانینی زمانی بێگانەوە هەیە(صبيح واخرون، ١٩٩٧).

### ١. ٥-دەستپاکی Integrity

پشت بەستن بە سەرچاوەی زانستی باوەڕپێکراو مەرجی سەرەکی بەهێزی بابەت و ڕاستگۆییە لە نووسیندا، بۆیە دابین کردنی سەرچاوە لە هەر بابەت و توێژینەوەیەکدا نەرخ و بەهای زانستی بابەتەکە دیاری دەکات. لە نووسینی ئەکادیمیدا نوسەر لە سەرەتادا لەو بابەتە دوور دەکەوێتەوە کە سەرچاوەی دەگمەنە وگرنگی بە بابەتێك دەدات سەرچاوە گەلی جۆراوجۆری لەسەر هەبێت تا کات و توانای خۆی بە فیڕۆ نەدات، بۆ ئەوەی نووسینەکەی بەهادار و زانستیانە بێت بۆ ئەو سەرچاوانە دەگەڕێتەوە کە خاوەن بەهای زانستین و لە نووسینەکەیدا کەڵکیان لێ وەردەگرێت. هەروەها لە دەستپێکی کارەکەیدا هەوڵ دەدات زانیاریەکی بەرفراوان دەربارەی بابەتەکەی لەسەرچاوەی جۆراوجۆردا کۆبکاتەوە، چونکە فرە سەرچاوەیی و بەکارهێنانی سەرچاوەی هەمەجۆر بە شێوەیەکی زانستی یەکێکە لەو پێوەرانەی نرخ و بەهای زانستی هەر نامەو توێژینەوەیەك دیاری دەکات.

ئەگەر پشت بەستن بەسەرچاوەی زانستی بەهادار وفرە سەرچاوەیی لە نووسیندا مەرجی بەهێزی و بەهاداری بابەتی نووسین بێت، ئەوا ئاماژە کردن بەسەرچاوەو خاوەنی ڕاستەقینەی سەرچاوەکان چ لە ناو ناوەڕۆك یان لیستی سەرچاوەکاندا بابەتەکە بەهێزترو بەهادارتر دەکات. بۆیە لە نووسینی ئەکادیمیدا نوسەر بە وردی مامەڵە لەگەڵ سەرچاوەکان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان دەکات بە جۆرێك پشت بە کۆمەڵێك سەرچاوەی تازەو کۆنی پەیوەندار بە بابەتی نووسین دەبەستێت و ئاماژەی تەواو بە سەرچاوەکان لە ناو ناوەڕۆك و لیستی سەرچاوەدا دەکات.

دەستپاکی لە نووسیندا ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە بەهێزکردنی بابەت، بە پێچەوانەوە پابەند نەبوون بە بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی لەنووسیندا بابەتی نووسین بەلارێدا نوسەر دووچاری ناپاکی ئەکادیمی و گزیکردن (Plagiarism) دەکات، بۆیە لە نووسینی ئەکادیمیدا نوسەر ئاماژایەکی ڕوون و تەواوی بە سەرچاوەی ئەو زانیاریانە کردووە کە وەری گرتوون، مەبەست لە وەرگرتن تەنها وەرگرتنی نووسین یان بڕگەیەك وەکو خۆی ناگرێتەوە بەڵکو سەرجەم ئەو زانیاریانەیە کە پەیوەستن بە سوود وەرگرتن لە شێوازی نووسین و بیرۆکە و کەرەستەو ئامرازی نووسین و وێنەو گرافیك و هێلکاری و هەر هەزانیاریەکی تر.

## ٦.١ –ڕەسەنایەتی و نوێخوازی Authenticity and Modernity

لە نووسینی ئەکادیمیدا پشت بە بیرۆکەو ڕاوبۆچوونی تازە دەبەسەترێت نەك تەنها گێرانەوەو دووبارەکردنەوەی ڕاوبۆچوونی توێژەرانی ترو دووبارە دارشتنەوەیان لە قالبێکی نوێدا، بەڵکو توێژەر یان نوسەری ئەکادیمی بە گەڕانەوە بۆ توێژینەوەکانی لەمەوپێش دەشێت پشت بە بیرۆکەو ڕاوبۆچوونی توێژەرانی تر ببەستێت بۆ مەبەستی سوود وەرگرتن لە بیرۆکەو دەرنجامەکانیان لە پێکهێنانی بیرۆکەو گریمانەی نوێ و دەستکەوتنی دەرەنجامی تازە دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو. ڕەسەنایەتی هەر بابەتیش بەندە بە تواناو شارەزایی نوسەر لە نووسینی بابەت و خودی بابەتەکە لە گرنگیدانی بە کۆمەڵگاو تازەگەری و داهێنان و بەدەستهێنانی زانیاری و دەرنجامی تازەو نوێ(عنایە، ٢٠٠٨).

نووسینی ئەکادیمی بابەتێکی نوێ و تازە و خاوەن بەهای زانستیە، کاتێکیش بابەتی نوسراو یان توێژینەوە سوود و بەهای خۆی دەبێت کە تازە بێت و جۆرێك لە تازەگەری و داهێنانی نوێی تیایدا بەرجەستە بووبێت. واتە بابەتەکە، بابەتیکی دووبارە نەبێت وپێشتر لە لایەن نوسەری ترەوەنوسرابێت (صبیح واخرون، ١٩٩٧). چونکە نوێکاری و داهێنان بنەمای بنچینەیین لە هەر بابەت و توێژینەوەیەکدا و بابەتی وەرگێردراو و لاسایی کەرەوە بە بابەتی زانستی و ئەکادیمی هەژمار ناکرێت. بەڵام نوێکاریش ئەوە ناگەیەنێت نوسەر یان توێژەر نەتوانێ بابەتێك بنوسێت یان کار لەسەر پرۆژەیەك بکات کە پێشتر لە لایەن کەسانی ترەوە کاری لەسەر کرابێ، بەڵکو دەتوانێت کار لەسەر بیرۆکە یان لایەنێکی تری پەیوەندار بە بابەتەکە بکات کە پێشتر باسی لێوەنەکراوەو پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر و هەوڵی بەردەوامە بۆ گەیشتن بە زانیاری و دەرنجامی تازە دەربارەی بابەتەکە. جگەوە لەوە نوێکاری چەندین لایەنی تر دەگرێتەوە، وەك ڕێکخستنی بابەت و بەشەکانی بە شێوازیکی تازەی دروست و درککردن بە هۆکاری نوێ بۆ ڕاستیە کۆنەکان و بواری تازە بۆ تیۆری نوێ.

## ٢-ڕەگەزە بنەڕەتیەکانی نووسینی ئەکادیمی Essential Elements of Academic Writing

هەر بابەتێك لە چەند ڕەگەزێکی بنەڕەتی پێك هاتووە کە پێکهێنەری بابەتەکەن و ناتەواوی لە هەر ڕەگەزێکدا لاوازی بابەتەکەی دەگەیەنێت. زانکۆی لۆس ئەنجلوس پاسیفیك( Los Angeles Pacific University) لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئاماژەی بە سێ ڕەگەزی سەرەکی بۆ نووسینی ئەکادیمی کردووە کەبریتین لە پێکهاتەی گشتی (Structure) و ڕێکخستن و دارشتن (Formatting) و دوورکەوتنەوە لە گزیکردن(Avoiding Plagiarism) وپابەند بوون بە بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی( Essential Elements of Academic Writing,www. elearning. uc. apu. edu).




شێوە(١. ٢)ڕەگەزەکانی نووسینی ئەکادیمی بە پێی زانکۆی لۆس ئەنجلۆس( Los Angeles Pacific University) پاسیف ڕوون دەکاتەوە

## ٢. ١-پێکهاتەی گشتی Structure

پێکهاتەی گشتی نووسین لە هەر بوارێکدا دابەش دەبێت بەسەر سێ بەشی سەرەکی، ئەوانیش بریتین لە پێشەکی و ناوەڕۆک(Body) و کۆتایی(Conclusion).

### ٢. ١. ١- پێشەکی Introduction

لە پێشەکیدا توێژەر بابەتەکە دەناسێنێت و گرفتی بابەتەکە دەخاتەڕوو، هەروەها ئامانج و گرنگی بابەتەکە ڕوون دەکاتەوەو گریمانەو پرسیارە سەرەکیەکانی پێشکەش دەکات. پێشەکی دەروازەیەکە بۆ خستنەڕووی بابەت و سەرنج ڕاکێشانی خوێنەر بۆ ناوەڕۆک و خوێندنەوەی بابەتەکە، بۆ ئەم مەبەستە توێژەر چەند هەنگاوێك دەگرێتەبەر:

- پێشەکیەك دەربارەی بابەتی توێژینەوەو ئەو هۆکارو پاڵنەرانەی کە دنەی توێژەریان داوە بۆ بڕیار دان لەسەر ئەنجامدانی توێژینەوەو گرنگی ئەنجامدانی توێژینەوەکە.
- خستنەڕووی ئامانجەکانی توێژینەوەو ئەو دەرەنجامانەی کە لە توێژینەوەکەدا بەدەست هاتوون.
- خستنەڕووی گرفتی توێژینەوەو ڕوونکردنەوەی گرفتەکە یان ئەو بابەتەی کە توێژەر هەوڵی چارەسەرکردنی دەدات. واتە پێشکەشکردنی پوختەیەکی ڕوون و بە خوێنەر دەربارەی گرفتی توێژینەوەکە
- خستنەڕووی گریمانەکانی توێژینەوەو ئەو دەرەنجامانەی کە توێژەر پێشبینیان دەکات.
- ڕوونکردنەوەی ئەو ڕەهەندو یەکانەی کە توێژینەوەکەیان لەخۆگرتووە.
- خستنەڕووی ڕوداو داتاو ژمارەی سەرنج ڕاکێش.
- پێناسەکردنی گرفت یان بابەت لە ڕوانگەی جۆراوجۆر کە پەیوەندیان بە بابەتی توێژینەوەکە هەیە.
- وەرگرتن و خستنەڕووی ڕای زاناو کەسانی ناودار.
- خستنەڕووی میتۆدی توێژینەوە، وەك ڕێگاو شێوازی ئەنجامدان و سەرچاوەی زانیاریەکان و چەمك و زاراوەکانی توێژینەوەو ناوەڕۆك و کۆتایی پێشەکی

### ٢. ١. ٢- ناوەڕۆك Body

ناوەڕۆك دڵی توێژینەوەیە، بە پێی پێویستی بابەتەكە ناوەڕۆك دابەش دەبێت بەسەر چەند بەشێك و هەر بەشێكێش لقی جیاجیای لێ دەبێتەوە بە جۆرێك سەرجەم بەش و لقەكان ناونیشانی خۆیان دەبێت. لە ناوەڕۆكدا توێژەر گرنگترین ئەو تیۆرانە دەخاتەڕوو كە پەیوەندیان بە گرفتی توێژینەوەكە هەیە بە لەبەرچاوگرتنی یەكێتی بابەت لە نێوان بەشەكان. بۆ ئەم مەبەستە پێویستە توێژەر پابەند بێت بە چەند هەنگاوێكی گرنگ:

- سەرجەم بەش و لقەكان بە شێوەیەكی لۆژیكی و ڕوون پاڵپشتی بابەتی توێژینەوەكە بكەن.
- بابەتەكان بە پێی گرنكی و بە شێوەی زنجیرە بە باشترین ڕێگا ڕێكخرابن. بۆ نموونە بابەتی یەكەم تەواوكەی بابەتی دووەم بێت و بابەتی دووەمیش ئەڵقەی پەیوەندی نێوان بابەتی یەكەم و بابەتی سێیەم بێت.
- دووركەوتنەوە لە خستنەڕووی هەر زانیاریەك كە پەیوەندی بە بابەتی لێكۆڵینەوەكە نەبێت.
- خستنەڕووی بیرۆكەی پاڵپشت لە ناو ناوەڕۆكی بەش و لقەكان.
- دووركەوتنەوە لە خستنەڕووی ئەو زانیاریانەی سەرچاوەیەكی دیارو ڕوونیان نیە.
- بەستنەوەو گرێدانی ناوەڕۆك بە پێشەكی و بەشی كۆتایی لێكۆلینەوەكە.

### ٢. ١. ٣- كۆتایی Conclusion

ئامانجی سەرەكی توێژەر لە توێژینەوەدا بەدەست هێنانی چەند دەرەنجامێكی تازەو بەهێزە دەربارەی گرفتی لێكۆڵینەوەكە، بۆیە لە كۆتایی توێژینەوەدا توێژەر دەرەنجامی توێژینەوەكەی دەخاتەڕوو لەگەڵ شیكردنەوەو لێكدانەوەی دەرنجامەكان، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە پابەند بێت بە چەند هەنگاوێكی گرنگ:

- پێشەكیەك دەربارەی گرفتی توێژینەوەكەو خستنەڕووی دەرنجامەكان.
- لێكدانەوەوەی ئەو دەرەنجامانەی بەدەست هاتوون لەگەڵ هاوجووتی و ناهاجووتیان لەگەڵ گریمانەكان و پرسیارە سەرەكیەكانی توێژینەوە.

- ڕوونکردنەوەی سەرجەم خاڵە سەرەکیەکانی توێژینەوەو ئەو دەرەنجامانەی بەدەست هاتوون.
- دووبارەکردنەوەی چەمك و دەستەواژە گرنگەکان و شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی پەیوەندی نێوانیان.
- بەکارهێنانی وشەو دەستەواژەی گرنك بۆ پەیوەست کردنی بڕگە بە بڕگەیەکی ترو ڕستە بە ڕستەیەکی تر.
- ئاماژەکردن بە ئاستەنگانی بەردەم لێکۆڵینەوەو ئەم دەرەنجامە تازانەی بەدەست هاتوون.
- ئاماژەکردن بە بڕۆکەو پێشنیاری تازە بۆ توێژینەوەی داهاتوو.




شێوە(١. ٢)پێکهاتەی گشتی نووسینی ئەکادیمی و پەیوەندی نێوان بەشەکانی ڕوون دەکاتەوە

## ٢.٢-ڕێکخستن و دارشتن Formatting

لە نووسینی ئەکادیمیدا نوسەر یان توێژەر پابەندە بە پەیڕەوکردنی فۆرم و شێوازێکی تایبەت لە نووسین بە پێی یاسا و ڕێساکانی شێوازەکە بابەتەکە دادەڕێژێت و ڕێکی دەخات، بۆ نموونە نووسینی بابەتی ئەکادیمی لە بوارەکانی دەروونزانی و کۆمەڵزانی و پەروەردەو کارگێڕی و زانستە سیاسیەکان نوسەر ناچار دەکات پابەند بێت بە پەیڕەو کردنی یاساو ریساکانی ستایلی ئاپا(APA)کۆمەڵەی دەروونزانانی ئەمەریکی ( American psychological Association). هەروەها نووسینی بابەت لە بوارەکانی زانستە مرۆییەکانی وەك مێژوو و فەلسەفەو زمان و ئاینەکان نوسەر پابەند دەکات بە پەیرەوکردنی یاساو ریساکانی هەردوو ستایلی(MLA) کۆمەلەی زمانی نوێ(Modern Language Association) و (CMS) ستایلی شیکاگۆ(The Chicago Manual of Style). هەروەها نووسین لە بوارەکانی فیزیك و گەردوونزانی(Physics and Astronomy) نوسەر یان توێژەر ناچار دەکات پابەند بیت بە ستایلی(AIP) ی پەیمانگای فیزیکی ئەمەریکی(American Institute of Physics). هەروەها نووسین لە بواری بایۆلۆژی پێویستی بە پابەندبوونی نوسەر بە ستایلی(CSE)ی ئەنجومەنی نوسەرانی زانست (Council of Science Editors)ی هەیە. نووسین لە بواری پزیشکیدا پێویستی بە پابەندبوون بە ستایلی (AMA)ی کۆمەلەی پزیشکانی ئەمەریکی (American Medical Association) هەیە. نووسین لە هەندێ بواری زانستی و ئەدەبی تردا نوسەر ناچار بە پابەندبوون بە ستایلی هارڤارد (Harvard) دەکات.

نووسین یان ئەنجامدانی توێژینەوە بە پێی فۆرمی ئاپا (APA)ی کۆمەڵەی دەرونزانی ئەمەریکی (American Psychological Association) پێویستی بە گرتنەبەری چەند هەنگاوێکی زانستیانەی تیۆری و پراکتیکیە. مەرجی یەکەم لە دەستپێکی نووسیندا بوونی ناونیشانێکی دروستە، ناونیشانێك بۆ بابەتەکە کە کێشەیەك بخاتەڕوو بە ئامانجی بەدەستهێنانی زۆرترین زانیاری لەسەر لایەنە گرنگەکانی کێشەکە بە جۆرێك هەموو ئەو یەکانە لەخۆ بگرێت کە بابەتەکە بەیەکەوە دەبەستێتەوە و دوورکەوتنەوە لە زاراوەو وشەی بی سوود. پێویستە نوسەر لە سەرتادا چەند ڕێنماییەکی گشتی لەبەرچاو بگرێت، وەك:

- چاپەکەی نووسینەکە جوان بێت و کاتی پێویستدا نەبێت هیچ جۆرە ڕەنگکارێیەکی تیادا بەکار نەهێنێت.
- فۆنتی ١٢ و تایپی (Times New Roman)بەکاربهێنرێت کاتێك توێژینەوەکە بە زمانی ئینگلیزی بوو. بەڵام لە کاتی نووسین بە ڕێنووسی کوردی واباشە بە فۆنتی ١٤ و (Unikurd Goran) یان ئەلیکەی سەحیفە(Ali_K_Sahifa) و بە زمانی عەرەبیش فۆنتی(Arial)یان(Courier) بەکار بهێنرێت و نێوان دیرەکانیشی ١. ٥ بێت.
- ئەگەر بابەتی نووسین توێژینەوەی زانستی بوو توێژەر ناوی خۆی و ئەدرێسی ئیمێلەکەی و ناوی سەرپەرشتیاری توێژینەوەکە و دوو ماموستا لە لیژنەی هەڵسەنگاندنی توێژینەوەکە لەسەر لاپەڕەی یەکەم لە خوارەوەی ناونیشانی توێژینەوەکەدا دەنوسێت. دواتر لە لاپەڕەی دووەمدا، توێژەر سوپاسی هەموو ئەو لایەنانە دەکات کە لە کاتی ئەنجامدانی توێژینەوەکەدا بە شێوەیەك لە شێوەکان هاوکاریان کردووە و یارمەتیان داوە. هەروەها سوپاسی تاقیگەو ئەو دەزگایانە دەکات کە لە کاتی ئەنجام دانی توێژینەوەکەدا کاری پراکتیکی و کرداری تیا ئەنجام داوە.
- دەست بە جێبەجی کردنی هەنگاوە تیۆری و پراکتیکەیکانی دەکات کە بە کورتەی توێژینەوە دەست پێ دەکات و بە ڕاسپاردەو پێشنیارەکان کۆتایی دێت.

بۆ نموونە لە پوختەی توێژینەوەدا توێژەر کورتەی توێژینەوەکە بەچەند دێرێك دەنوسێت کە لە ٥٠ دێر و نیو لاپەڕە زیاتر نیە، لەگەڵ نووسینی کورتەی توێژینەوەکە بە زمانی ئینگلیزیلە هەمان لاپەڕەدا بە دوای یەك. ئامانج لە نووسینی کورتەی توێژینەوە یارمەتی دانی خوێنەرە بۆ ئەوەی بەبێ خوێندنەوەی ناوەرۆکی توێژینەوەکە بزانیت بابەتەکە چیەو ئەو دەرەنجامانەی بەدەست هاتوون چین، وە چ میتۆدێك بەکارهاهێنراوەو پشت بە چ تیۆریك بەستراوە.

یان چوارچێوەی تیۆری توێژینەوەکە بەسەر دوو یان سێ بەش دابەش دەکات بە جۆرێك هەربەشێکیان ناو نیشانی خۆی هەیە و چەندین لقی جیاجیای لێی دەبێتەوە، لەبەشی یەکەمدا بابەتەکە لە ڕوانگەی چەند تیۆریك و لەبەشی دووەمدا چەند بابەتیکی پەیوەندار بە گرفتەکەو

لە ڕوانگەی لەبەشی سێیەمیشدا تیڕوانینی هەندێك توێژەر تر دەخاتە ڕوو و هەوڵ دەدات بیرۆکە بنەڕەتیەکان بە جوانی دیاری بکات و پوختەیان بکات.

## ٢. ٣-دوورکەوتنەوە لە گزیکردن Avoiding Plagiarism

دوورکەوتنەوە لە گزیکردن و پەیرەوکردنی بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی لە نووسیندا یەکێکە لە ڕەگەزە هەرە گرنگەکانی نووسینی ئەکادیمی، بۆیە پێوستە نوسەر لە دەستپێکی کارەکەیدا ورد بێت لە بەکارهێنانی سەرچاوەو ئامازەکردن بە سەرچاوەکان لە نێو ناوەڕۆك و لیستی سەرچاوەکاندا، بە پێچەوانەوە ئامازەنەرکردن بە سەرچاوەکان بە مەبەست بیت یان بێ مەبەست هیچ بیانوویەکی بۆ نیەو دەچیتە خانەی ناپاکی و گزیکردنی زانستی. هەروەها پێویستە نوسەر لە ڕێگەی بەکارهینانی پرۆگرامە ئەلکترۆنیەکانی کانی تایبەت بەئاشکراکردن و و دەرخستنی گزیکردن وەك پرۆگرامی (Turnitin) و (WriteCheck. com) و (Plagiarism. org) پشکنین بۆ بابەتەکەی بکات و لە دروستی و پاکی نووسینەکەی دڵنیا بێت ئینجا بریاری کۆتایی لەسەر بدات.

## ٣-هەنگاوەكانی نووسینی ئەكادیمی The steps of academic writing

نوسەر لە دەستپیكی نووسین(Prewriting)دا پێویستی بە هەڵبژاردن و دیاریكردنی بابەتی نووسین(Choosing and narrowing Topic)هەیە، بۆ ئەم مەبەستە بابەتێكی گشتی هەڵدەبژێرێت و لە نێو بابەتەكەشدا تەوەرێكی تایبەت دیاری دەكات، دواتر لە نێو تەوەرە تایبەتەكەدا جەخت لەسەر خاڵێكی دیاریكراو دەكات وكاری لەسەر دەكات، دوای هەڵبژاردنی بابەت، نوسەر پێوستی بە ئەنجامدانی كرداری بیربارین (Brain Storming) هەیە كە بۆ ئەم مەبەستە دەتوانێت سوود لە سێ ئامرازی گرنگی وەك لیست(list) ونووسینی سەربەست (Free writing)و كۆكردنەوە(Assembly)وەربگرێت وەرسێ ئامرازەكەش بەیەكەوە بەكار بهێنێت. كە دەشێت لە رێگەی كرداری بیربارینەوە بابەتەكەی بناسێنێت و راڤەو شیكردنەوەی بۆبكات و دووبارە دارشتنەوەی بۆ بكات و هەڵسەنگاندن بۆ بیرۆكەكانی بكات (الكتابة الأكاديمية، مهارات الكتابة الأكاديمية، www. sites. google. com). یەكێك لە گرنگترین ئەو كارانەی كە پیویستە نوسەر لە دەستپێكی نووسینی ئەكادیمیدا ئەنجامی بدات بە دەست هێنانی زۆرترین سەرچاوەی زانستی باوەرپێكراوە كە وای لێ دەكات لە هەر سەرەتاوە بەرچاو روونیەكی باشی هەبیت دەبارەی ئەو بابەتەی لێی دەكۆڵێتەوە.




شێوە(١. ٤)چۆنیەتی هەڵبژاردن و دیاریكردن بابەت لە دەسپێكی نووسینی ئەكادیمی روون دەكاتەوە

نووسینی ئەکادیمی کارامەییەکە وەك هەرکارامەییێکی تر بە ڕاهینان و کار لەسەر کردنەوە گەشە دەکات و پەرەدەستێنێت، ئەمەش پێوستی بە بەرنامەیەکی تۆکمە و ئەنجامدانی چەند هەنگاوێکی کرداری هەیە، وەك:

## ۲.۱ –پلان دانان Planning

مەبەست لە پلاندانان بە شێوەیەکی گشتی ئامادەکاری و بڕیاردانە لە ئێستا بۆ گەیشتن بە چەند ئامانجێکی دیاریکراو و هێنانەدی ئەو ئامانجانە لەئاییندەدا. مرۆڤ بۆ لە گرتنەبەری هەر کارێك یان پرۆسەیەك پێویستی بە دانانی پلانی کارکردن هەیە، بۆیە لە دێرزەمانەوە بۆ ئەنجامدانی ئیش و کارەکان و ڕێکخستنی ژیانی پلانی داناوە، بۆ ئەم مەبەستە چەندین جۆر وشێوازی جۆراوجۆی پلاندانی داهێناوە، بەلآم لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا جۆر و شێوازی پلاندانان گۆڕانی بەسەر داهاتووە، چونکە هەر پلانێك دەبێت لەگەڵ سروشتی کارو پێداویستی و داواکارییەکانی سەردەم بگونجێت.

لە ڕووی زمانەوانیەوە پلاندانان (Planning) بریتیە لە دیاریکردن و جێگیرکردنی بیرۆکە لەسەر کاغەز لە شێوەی وێنە یان نووسین بە جۆرێك وێنەو نووسینەکان دیارو ڕۆشن بن و گوزارشتی تەواو لە ئامانج و مەبەستی پرۆژەیەك لە پرۆژەکان بکات، نادیاری و ناڕوونی بیرۆکەکانیش لەسەر کاغەز دەبیتە هۆی لێڵی و ناڕۆشنی پلانەکە لە هزردا و بە پێچەوانەشەوە.

لە ڕووی زانستیەوە پلان(Plan) چەندین پێناسەی جیاوازی بۆ کراوە، لە سادەترین پێناسەدا بریتیە لە ئامادەکارییەکی ڕێکخراو بە ئامانجی چارەسەرکردنی کێشەکان و گۆڕانکاری لە کۆمەڵدا. یاخود بریتیە لە پرۆسەی هەڵبژاردنی ئامرازی گونجاو بە مەبەستی جێبەجی کردنی پرۆژە یان کارێکی دیاریکراو و بڕیاردان بۆ کارکردن لە ئاییندەدا.

پلان(Plan) و پلاندانان(Planning) چەندین جۆرو شێوازیان هەیەو جیاوازیشیان دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێکی وەك:

- پرۆسەی پلاندانان و جۆر و شێوازی پلانەکان بە پێی کات و ڕۆژگاردا گۆڕانی بەسەردا هاتووە.
- جیاوازی پلاندانان بە هۆی جیاوازی کۆمەڵگاکانەوە.
- جیاوازی بنەما ئایدیۆلۆژی و ئابووریەکانی نێوان ولآتان.

- جیاوازی پسپۆری توێژەر و نوسەران و پێشینەی ئایدیۆلۆژی و فکری و رۆشنبیریان.
- جیاوازی میتۆد و هەنگاوەکان و کەرەستەو ئامرازەکانی لێکۆڵینەوە لە زانستە جیاجیاکان و رشتەی جۆراوجۆر لەناو یەك زانستدا (فرج، ٢٠٠٩).

پرۆسەی پلاندان(Planning)دابەش دەبێت بەسەر چەند پێکهاتەیەك، بە بڕوای وۆتۆن (Wootton) و هۆرن(Horne)پلاندانان چوار پێکهاتەی سەرەکی لەخۆدەگرێت:

- شیکردنەوەی واقیع (من کێم)
- دەست نیشانکردنی مەبەست (بۆ کوێ بڕۆم)
- دیاریکردنی ئامراز یان کەرەستە (چۆن بڕۆم)
- دیاریکردنی پێوەرەکان (لە کوێ بوەستم)

(Wootton&Horne,١٩٩٧)




**خشتەی ژمارە(١. ٥)پێکهاتەکانی پلان و پرۆسەی پلاندانان بە پێی وۆتۆن(Wootton) و هۆرن(Horne) ڕوون دەکاتەوە**

نووسینی ئەکادیمی(Academic writing) پرۆسەیەکی فەرمی و ڕێکخراوەو بە بێ بوونی پلان و دارشتنی پلانێکی گونجاو سەرکەوتوو نابێت، بۆیە لە دەسپێکی نووسیندا توێژەر یان نوسەر پێویستی بە دانانی پلانێکی تۆکمە هەیە بۆ کارکردن، یەکەم شت کە پێوستە بیکات دیاریکردنی کاتی دەسپێك و تەواوکردنی نووسینەکەیە بۆ ئەوەی بزانێت لە چ کاتێکدا دەست بە نووسین دەکات و کەی کۆتایی پێ دەهێنێت، دواتر پێویستی بە کۆکردنەوەی کەرەستەو ئامرازی نووسین و خوێندنەوەو هەڵهێنجان و کورتکردنەوەو ڕێکخستنی بیرۆکەکانە، ئینجا دیاریکردنی کاتی گونجاو بۆ نووسین لە شەو ڕۆژدا لەگەڵ دەست نیشانکردنی ڕێگاکانی نووسین لە کاتی دەستنوسی یان تایپکردندا، هەروەها دیاریکردنی شوێنی نووسین ئایا لە ماڵەوە دەنوسێت یان باخچە یان نووسینگە یان قاوەخانە یاخود هەر شوێنێکی تر، پابەندبوونیش بە پلانەکە بە تەواوەتی دەبێتە هۆی ئەوەی نوسەر ئاراستەیەکی دروست و بەرهەمدار لە کارکردندا بگرێت (الموسى، ٢٠١٤).

پلان دانان (Planning)چەندین سوود و گرنگی بۆ نوسەر هەیە، گرنگترین ئەو سوودانە بریتین لە:

- دیاریکردنی ئامانجەکانی نووسین و هەڵبژاردنی ناونیشانی بابەتی نووسین.
- دیاریکردنی ڕێگاو شیوازەکانی نووسین و زاڵ بوون بەسەر ئەو کۆسپ و تەگەرانەی کە ئەگەری هەیە بێنە بەردەم پرۆژەی نووسین.
- دیاریکردنی بیرۆکە بنەڕەتیەکانی بابەتی نووسین بە شێوازێکی ڕوون و تەواو بە جۆرێك لێڵی و نادیاریەك لە بابەتەکەدا بەدی نەکرێت.
- دیاریکردنی هۆکارەکانی هەڵبژاردنی بابەت و ڕوونکردنەوەیان.
- هەڵسەنگاندنی بابەتی نووسین و دیاریکردنی ئاستی توانستی نوسەر لە بەدواداچوون و بەردەوامی لە نووسیندا.
- دیاریکردنی هەنگاوە تیۆری و پراکتیکیەکان لە نووسیندا.
- بەکارهێنانی وەك نەخشە ڕێگایەك بۆ دیاریکردنی کاتی دەست پێکردن و تەواوکردنی نووسین.
- سوود وەرگرتن لە کات و ئەنجامدانی پرۆژەی نووسین بە کەمترین تێچوو.

## ٢.٣ – نەخشەی هزری Mindmap

دوای پلاندانان لە هەنگاوی سێیەمدا نوسەر پێویستی بە دانانی نەخشەیەکی هزریە. نەخشەی هزری یان عەقڵی(Mindmap) بریتیە لە وێنەیەکی ڕوونکەرەوەیی لەسەر پارچە کاغەزێکدا تیایدا نەخشەی بابەتەکەو هەموو ئەو لایەنانەی پەیوەندیان بە بابەتەکە هەیە دەکێشریت. نەخشەیەکە لەناو مێشکەوە دەخرێتە سەر کاغەز یان دیوارێك بە شێوەیەك هەموو کات لەبەرچاوەو یارمەتیدەرە بۆ بیرهاتنەوەی ئەو شتانەی کە بیرکەوتنەوەیان قورسە، تەنانەت بە سەیرکردنی نەخشەکە توێژەر هەموو ئەوشتانەی بەیەك جار دەکەوێتە بەرچاو کە ڕەنگە بیرهاتنەوەیان بەیەکەوە سەخت بێت.

چەمکی نەخشەی هزری (Mindmap) لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی ڕابردوویۆ یەکەم جار لە لایەن دەروونزانی بەریتانی تۆنی بوزان[1](Tony Buzan) داهێنرا، دواتر پەرەی پێ داو ڕوونی کردەوە کە وێنەکیشانی هزری کارەکان ئاسان دەکات و فشار لەسەر مێشك کەم دەکاتەوەو چارەسەری زۆرێك لە گرفت و کێشەکان دەکات و هاوئاهەنگیەك لە نێوان مێشك و نەخشەکە دروست دەکات.

[1] تونی بوزان(Tony Buzan) نوسەرو پەروەردەکاری بەریتانی و مامۆستای یادەوەری و داهێنەری نەخشەی هزری(Mindmap) یە.ساڵی ١٩٤٢ لە لەندەن(London)لە دایك بووە.ساڵی ١٩٦٣ زانکۆی کۆلۆمبیای بەریتانی(University of British Columbia) تەواوکردووەو ڕشتەکانی دەروونزانی و زمانی ئینگلیزی و ماتماتیکی لەو زانکۆیەدا خوێندووە،زیاتر لە ١٠٠ کتێبی دەربارەی عەقڵ و مێشك و فێربوون بلاوکردۆتەوە،یەکێکە لە وانەبێژە جیهانیەکان و ساڵی ١٩٩٤ لە لایەن گۆڤاری فۆربس (Forbes)لە نێوان پێنج وانەبێژدا بە یەکێك لە باشترین وانەبێژەکانی جیهان هەڵبژێردراوە، سەرنوسەری گۆڤاری مێنسا(MENSA)ی نێودەوڵەتی بووە، ساڵی ١٩٧٤پێشکەشکاری پرۆگرامی داهێنانی نوێ بووە لە کەناڵی بی بی سی (BBC) و خاوەن سایتێکی فەرمیە لەسەر تۆڕی (http://www.thinkbuzan.com).

نەخشەی مزری (Mindmap) چەندین تایبەتمەندی گرنگی لەخۆگرتووە، گرنگترین ئەو تایبەتمەندیانە بریتین لە:

- دروستکردن و بەکارهێنانی ئاسانە و پرۆسەی فراوانکردن و پۆلینکردنی بابەتەکانیشی تیایدا ئاسانە.
- نەخشەیەکە هەمیشە لەبەرچاوەو دەبینرێت، بەمەش پرۆسەی بیرهاتنەوەو درککردن بە پەیوەندی نێوان بابەتەکان ئاسان دەکات.
- هۆکارێکە بۆ فراوان بوونی پرۆسەی بیرکردنەوەو خەیاڵکردن و زیادبوونی پاڵنەرێتی و بەدەست هێنانی دەرنجامی باشتر.
- هۆکارێکە بۆ دۆزینەوەی بیرۆکەی تازەو نوێ.
- هۆکارێکی گرنگە بۆ بەیکەوە بەستنەوەی بابەتەکان و ئەنجامدانی هەنگاوی کرداری (ابراهیم، ٢٠١٤).

نەخشەی مزری(Mindmap) ئامرازێکە بۆ یارمەتی دانی عەقڵ و کەمکردنەوەی پاڵەپەستۆ لەسەر عەقڵ ، تەکنیکێکی تازەیە بۆ وێنەکێشانی مەیدانی توێژینەوەو ئەو بابەتانەی پەیوەندیان بە بواری تویژینەوەکە هەیە بە شێوەیەك لەسەر نەخشەیەکی کاغەزی سەرجەم لایەنەکانی پەیوەندار بە بابەتەکە دیاری دەکرێت و بە پێی گرنگیان پۆلین دەکرێن، بەجۆرێك:

- وێنەیەکی تەواو دەربارەی بابەتی نووسین دەبەخشێت بە جۆرێك هەر بە سەیرکردنی نەخشەکە نوسەر تەواوی لایەنەکانی پەیوەندار بە بابەتەکەی دەبینێت.
- وێنەیەکی تەواو دەربارەی ئێستای نوسەر دەبەخشێت، لە رێگەیەوە دەزانێت ئامانجی چیەو لە کوێ دەست پێ بکات و گەیشتۆتە کوێ وئاستەنگەکانی بەردەمی چین.
- وا لە نوسەر یان کەسی توێژەر دەکات بتوانێت زۆرترین زانیاری لەسەر نەخشەیەکی کاغەزی کۆبکاتەوەو رێکیان بخات.
- یارمەتی توێژەر دەدات بتوانێت هەموو ئەو بیرۆکانەی لە مزرو مێشکیدایە بیخاتە سەر کاغەزێك و بیانبینێت.

- پارمەتی توێژەر دەدات بتوانێت هەر هەڵەیەك لە پلانی کارکردنیدا هەبێت ڕاستی بکاتەوەو چارەسەری گونجاو هەڵبژێرێت(فوائد الخرائط الذهنية، www. annajah. net).
- پارمەتی نوسەر دەدات بتوانێت زانیاریەکان بە شێوەیەکی ئاسان کورت بکاتەوە.
- وا لە نوسەر دەکات بە خێرایی زانیاریەکانی بیربکەوێتەوە (الرفاعي، ٢٠١٣).

نەخشی هزری(Mindmap) ئامرازیکە بە چەندین جۆر و بە بەکارهینانی چەندین کەرەستەو ئامرازی جۆراوجۆر دروست دەکرێت، دەشێت لە شێوەی دارێك یان هێلکاریەك بە دەست بکێشرێت، یان بە بەکارهێنانی پرۆگرامی کۆمپیوتەری وەك پرۆگرامی(Map-it) یان پرۆگرامی تری وەك (Mind View) کە پرۆگرامێکی خۆراییە نەخشەکە دروست بکرێت. لەگەڵ ئەوەی پێوستی بابەت نوسەر ناچار دەکات چ ڕێگایەك بۆ دروستکردنی بەکار بهێنێ، بەلام بە شێوەیەکی گشتی ڕێگای بەکارهێنانی پرۆگرامی کۆمپیوتەری ئاسنتر و خێراترە لە ڕێگای دەستی و چەندین سوودی گرنگی هەیە، وەك:

- بەخێرایی دروست دەکرێت و ڕێك دەخرێت.
- بە ئاسانی فراوان دەکرێت و زیادی و کەمی تیایدا دەکرێت.
- دەتوانرێت بە نەخشەکانی ترەوە ببەسترێتەوە.
- دەشێت لەگەڵ نەخشەکەدا وێنەو خشتەو گرافیك و هەر ئامرازێکی تری ڕوونکردنەوە بەکاربهێنرێت.
- دەتوانرێت بە پێی پێویست بەسەر چەندین لاپەڕەدا پۆلین بکرێت.
- دەتوانرێت بە ئاسانی بۆ پرۆگرامەکانی وۆرد(Ward) و پاوەرپۆینت (PowerPoint) وپرۆگرامەکانی تری وەك(Hypertext Markup Language) بگوێزرێتەوە و لە ڕێگەی ئەو پرۆگرامانەشەوە چی پێویست وەربگیرێت(Benefits of using Mindview,www. matchware. com).




**شێوه(١. ٦)چۆنیەتی دروستکردنی نەخشەی هزری بە بەکارهێنانی پرۆگرامی(Mind View) ڕوون دەکاتەوە**

نەخشەی هزری(Mindmap)بۆ لێکۆڵینەوە لە سەرجەم بوارەکانی ژیان بەکاردەهێنرێت ، وەك بەکارهێنانی بۆ مەبەستی لیکۆلینەوە لە ژیان و بەرهەمی کەسانی تر کە چۆن کاریان کردووە و چ ڕێبازێکیان بۆ کارکردن بەکارهێناوە. بۆ نموونە، لێکۆڵینەوە لە شیعری کوردی پێویستی بە کێشانی نەخشەیەك هەیە تیایدا قۆناغەکانی شیعری کوردی بەسەر کلاسیك و ڕۆمانتیك و ڕیالیزم و شیعری نوێ دابەش کرابێت، دواتر بزاڤی شیعری کوردی لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکاندا، ئینجا ناوی شاعیرەکان و پۆلین کردنی شیعرەکانیان بەسەر شیعری نیشتیمانی

و ئایینی و موناجاتات وخۆشەویستی و جوانی سروشت. . تاد. یان لێکۆڵینەوە لەباری دەروونی کۆمەڵێك نەخۆشی تووشبوو بە شیزۆفرینیا و فۆبیاو دڵەڕاوکێ و خەمۆکی لە یەکێك لە سەنتەرە دەروونیەکاندا پێویستی بە نەخشەیەك هەیە تیایدا نەخۆشیە دەروونیەکان بەسەر دڵەراوکێ و خەمۆکی و فۆبیاو شیزۆفرینیا دابەش کرابێت، ئینجا دابەشکردنی هەر نەخۆشیەك لەو نەخۆشیانە بەسەر لق و جۆرەکانیان و دیاریکردنی ئەو هۆکارانەی پەیوەندیان بە هەر یەکێك لەو نەخۆشیانەوە هەیە، دواتر دەست نیشان کردنی ئەو بوارانەی کە پێویستە بۆ یەکەم جار کاریان لەسەر بکرێت، بۆ ئەمەبەستەش ژمارە یان ڕەنگ یاخود کێشانی بازنەیەك بە ڕەنگێکی جیاواز بەکاردەهێنرێت. بەڵام گرنگترین شت لە ئامادەکردنی نەخشەی هزریدا ئەوەیە نابێت ئاماژە بەو لایەنانە بکرێت کە پەیوەندیان بە بابەتەکەوە نیە.




شێوە(۱. ۷)هێڵکاری نەخشەی هزری نەخۆشیە دەروونیەکان ڕوون دەکاتەوە

## ۳.۲ –خوێندنەوە Reading

خوێندنەوە(Reading) بە مانا گشتیەکەی بریتیە لە هەڵهێنجانی واتاو کورتکردنەوەیان لە بابەتی چاپکراو نوسراودا، یان توانستی جیاکردنەوەی هێمای واتاکانە لە بابەتی نوسراودا. پرۆسەیەکە بە تەنها لە ناسینی هێماکان(وشە، ڕستە) کورت نابێتەوە، بەڵکو زنجیرەیەك پرۆسەی عەقڵی و مەعریفی و ویژدانی بەیەکەوە گرێدراروی وەك هەستیاری و بە ئاگایی و درککاری و بیرهاتنەوەو تێگەیشتن و چێژ و هەڵچوونە. بەو واتایە خوێندنەوە پرۆسەیەکی بیرکاری ئاڵۆزە پێك دێت لە ڕاڤەکردنی هێماکان و پەیوەستکردنیان بە واتا، دواتر ڕاڤەکردنی واتاکان بە پێی ئاستی شارەزایەکانی کەسی خوێنەر. کەوابوو خوێندنەوە دوو پرۆسەی بەیەکەوە گرێدراو لە خۆ دەگرێت و بریتین لە:

- پرۆسە میکانیکیەکان Mechanical processes

  ئەم پرۆسانە پەیوەستن بە بینین و ئاستی بینینی خوێنەر بۆ پێکهاتەو ڕستەو وشەو پیتی نووسراو لە ڕێگەی کۆئەندامی بینینەوە، هەروەها دەربرینیان بە یارمەتی کۆئەندامی ئاخاوتن.
- پرۆسە عەقڵیەکان Mental processes

  بریتین لە کۆمەڵێك پرۆسەی عەقڵی وەك تێگەیشتنی ڕاشکاوانە و ڕاستوخۆ و تێگەیشتنی بەشەکی ناڕاستەوخۆ و چێژ وەرگرتن و لە خوێندنەوەو ڕەخنەگرتن و هەڵسەنگاندنی بابەت و ڕاڤەکردنی.

خوێندنەوە(Reading) بە یەکێك لە گرنگترین ئامرازەکانی فێرکردنی مرۆڤ دادەنریت، چونکە مرۆڤ لە ڕێگەیەوە پەرە بە زانست و زانیاریەکانی دەدات و بەهۆیەوە دەتوانێت دەرگا داخراوەکانی ژیان بە ڕویدابکاتەوە. ئامرازی سەرەکی پێشکەوتنی هەر تاك و کۆمەڵگایەکە، کۆمەڵگای خوێنەر کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو و خوێندەوارەو تاکی خوێنەریش تاکێکە بیردەکاتەوەو بەردەوام هەوڵی فێربوونی شتی تازەو بەدەست هێنانی زانیاری زیاتر دەدات، چونکە خوێندنەوە هۆکاری سەرەکی پرۆسەی بیرکردنەوەیەو بیرکردنەوەش هۆکاری سەرەکی پێشکەوتنە.

خوێندنەوە(Reading) ئامرازێکی کاریگەری چالاککردنی عەقڵ و جولاَندنیەتی، لە ڕێگەیەوە توانستە عەقڵی و مەعریفیەکانی مرۆڤ گەشە دەکەن ومرۆڤ باشتر دەتوانێت لە دیاردەکانی دەوروبەری تێ بگات و درك بە پەیوەندی نێوانیان بکات و بە ورەو باوەڕی پۆلاَیینەوە بەرەنگاری کێشەو داواکاریە ژینگەییەکان ببێتەوە، لە ڕێگەیەوە کارامەییە خودیەکانی مرۆڤ گەشە دەکەن وهەستی بڕوا بەخۆ بوونی لا زیاد دەبێت، باشتر دەتوانێت دەست نیشانی هەڵبژاردەکانی بکات و لایەنە پۆزەتیف و نێگەتیفەکانی شتەکانی دەوروبەری لە یەکتر جیا بکاتەوە و لە زۆربەی کاتدا پشت بە خۆی ببەستێ. مرۆڤ لە ڕێگەی خوێندنەوەوە دەتوانێت پەرە بە زانست و زانیاری و پسپۆریەکەی بدات لەو بوارەی کە کاری تێدا دەکات. لە ریگەی خویندنەوەوە دەتوانیت هەنگاو بەرەو نووسین بنێت و بەردەوامی لە خوێندنەوەو خوێندنەوەی زیاتر وای لێ دەکەن ڕۆژ بەڕۆژ باشتر و جوانتر بنوسێت.

لە ڕاستیدا هەنگاوی یەکەم لە دەسپێکی نووسینی ئەکادیمی لە هەر بابەت و پسپۆریەکدا دوای پلاندانان بە خوێندنەوەو بەدەست هێنانی زانیاری لە پسپۆریەکەدا دەست پێ دەکات، ئینجا زانین و ئاشنا بوون بە ڕێگاو شێوازەکانی نووسین. بۆ ئەم مەبەستە نوسەر دەتوانێت سوود لە سەرجەم کەناڵەکان وەربگرێت کە پەیوەندیان بە پسپۆری و بابەتەکەیەوە هەیە. خوێندنەوەی گۆڤاری زانستی و کتێبی ئەکادیمی هۆکاری یەکەمن بۆ ئەوەی بتوانێت زانیاری و شارەزایی لە پسپۆیەکەیدا پەیدا بکات و کەڵەکەیان بکات و نموونەی ناوازە لە خوێندنەوەو شێوازی نووسینیان وەربگرێت، لە ڕێگەیانەوە دەتوانێت دەست نیشانی ئەو هۆکارانە بکات کە وا دەکەن بابەتەکە بچێتە خانەی نووسینی ئەکادیمی وشیاوی بلاَوکردنەوە بێت. دواتر دەتوانێت بیرۆکەکان کورت بکاتەوەو یەکیان بخات و شیکردنەوەیان بۆ بکات، دوای خوێندنەوەی هەر بابەتێك یان برگەی هەر کتێبێك دەکرێت دەست نیشانی هەندێ ڕستەو چەمکی ڕەسەن بکات بۆ ئەوەی لە نووسینەکەدا بەکاربهێنێت و کەڵکیان لێ وەربگرێت، هەروەها دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی تری نوسراو یان ئەلکترۆنی بۆ ئەوەی بیرۆکەی ترو پێشنیاری تری دەست بکەوێت ولە نووسینەکەدا کەڵکیان لێ وەربگرێت.

## ٣. ٤ –نووسین Writing

مێژوونووس وکۆمەڵناسی گەورە ئیبن خەلدون(ابن خلدون) لە پێشەکیەکەیدا(المقدمە) دەڵێت:خەت و نووسین لە گرنگترین داهێنانی مرۆڤن و بریتیە لە وێنەو شێوەی پیتەکان بۆ گوزارشت کردن لە وشەو ئەو شتانەی لە ناخی مرۆڤەکاندایە. یەکێکە لەو تایبەتمەندیانەی مرۆڤ لە بوونەوەرەکانی تر جیادەکاتەوە، لە ڕێگەیەوە مەبەستەکانی بۆ دوورترین شوێن دەنێرێت و هاوکاریەکانی پێشکەش دەکات و داوای هاوکاری دەکات، هەروەها لە ڕێگەیەوە هەواڵ و زانست و زانیاری هەمەجۆر وەردەگرێت وشارەزایی و کارامەییەکانی زیاتر دەبێت(إبن خلدون، ٢٠٠٨).

نووسین (Writing) چەمکێکە پێناسەگەلی زۆری بۆ کراوە، بەلاّم سەرجەم پێناسەکان لە ناو یەك بازنەدا دەخولێنەوە، ئەویش ڕاڤەکردنی پرۆسەی نووسین و چۆنیەتی ئەنجامدانیەتی، پرۆسەیەکی ئالۆزە تیایدا توانست و لێهاتوویی نوسەر ڕۆڵێکی گرنگ دەبینن لە وێناکردنی بیرۆکەکان و وێنەکێشانیان لە پیت و وشەو ڕستە و پێکهاتەی دروست لە ڕووی زمانەوانیەوە. هەروەها توانست و لێهاتوویی لە بەکارهێنانی شێوازی هەمەجۆر و بیرکردنەوەی قوڵ و خستە ڕووی بیرۆکەکان بە ڕوونی و بەدواداچوون و چارەسەرکردنیان، دواتر بژارکردن وپێداچوونەو بە پێکهاتەو بیرۆکەکان وکۆنترۆڵکردنی (ربابعە، ٢٠١٦).

نووسین(Writing) جۆرێکە لە توانست و کارامەیی عەقڵی و دەستی کە لە یەك کاتدا نوسەر پرۆسەیەکی داهێنەرانەی گرنگ ئەنجام دەدات، توانست و کارامەیی لە پێکهینانی جۆرێك لە گونجانی دەروونی لە نێوان چاو دەست و عەقڵ و بیرکردنەوە، چونکە پرۆسەی بیرکردنەوە پرۆسەیەکی ئۆتۆماتیکیە لە هەمان کاتدا. بۆیە لە پێناسەیەکی سادەدا دەشێت پێناسەی چەمکی نووسین بکرێت بەوەی بریتیە لە ڕێگایەك بۆ گەیشتن و گوزراشت کردن لە هەستەکان.

نووسین(Writing)پرۆسەیەکی سەخت وئالۆزەوپەیوەندی بە کۆمەڵێك کارامەیی بنەڕەتیەوە هەیە، ناکارامەیی و نەشارەزایی لە نووسیندا دەبێتە هۆی نزمی بابەتی نوسراو و بە نووسینی ئەکادیمی هەژمار نەکرێت، بۆیە مەرجە لە سەرتادا توێژەر یان نوسەر بە باشی لەو بابەتە بگات کە لەسەری دەنوسێت و ئامانجی نووسینی ڕوون و ئاشکرا بێت و جەماوەرەکەی بناسێت و بزانێت بۆ کێی دەنوسێت، ناکارامەیی و نەشارەزاییش لە نووسیندا لە زۆربەی کاتدا نوسەر ڕووبەڕووی چەندین هەڵەی زەق و گەورە دەکاتەوە، وەك:

- گەڕان و لێکۆڵینەوە لە زانیاری فرەمەبەست وکۆکردنەوەیان.
- سەرنەکەوتن لە ڕێکخستنی بابەت و گوزارشت کردن لە ڕوانگەی تەسك و پشتگوێ خستنی پێداچوونەوە بە ڕەشنوسی بەرایی.
- جیاوازی نێوان بابەت و جەماوەر. واتە ئەو جەماوەرەی کە بابەتەکەی بۆ نوسراوە.
- هەڵەی زمانەوانی وەك زۆربڵێی و درێژدادڕی و نووسینی ڕستەی درێژ لە ناو پەڕەگرافدا لەگەڵ نەبوونی یەکیەتی بابەت لە نێوان بەش و لقەکانی ناو بابەتەکەو نەبوونی پێشەکی و کۆتاییەکی گونجاو.
- بەکارهێنانی چەمکی نادیار و ناڕۆشن و پەنابردن بۆ شێوازێکی زمانەوانی نامۆ لە گوزارشت کردندا (نحو كتابة افضل، www. siironline. org).

نووسین(Writing) پەیوەستە بە خوێندنەوەو دوو پرۆسەی تەواوکەری یەکترن، بەردەوامی لە هەردووە پرۆسەکەدا دەبێتە هۆی زیادبوونی ئاستی زانیاری و شارەزایی و کارامەیی لە نووسیندا. زۆربەی نوسەر و بیرمەندە گەورەکانی جیهانیش لە ئەنجامی خوێندنەوەو نووسینی بەردەوامەوە توانیوویانە ببن بە نوسەری گەورەو چەندین شاکاری بێ وێنە پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکەن. زاناو دەروونشیکانی ئۆتریشی سیگمۆند فرۆید[٢](Sigmund Freud) پێش ئەوەی دەروونزان و تیۆریست و پزیشك وچارەسەرکاری دەروونی بێت، ئەدیب و نوسەرێکی گەورە بووەو زۆربەی کاتی خۆی بە خوێندنەوە ونووسین بەسەر بردووە، شەونخوونی لەگەڵ خوێندنەوەو نووسینی بەردەوام نەك تەنها کردوویەتی بە نوسەرێکی گەورە، بەڵکو بۆتە یەکێك لە زانا هەرە گەورەکانی بواری دەروونزانی و دامەزرێنەری قوتابخانەی دەروونشیکاری کە یەکێك بوو لە دیارترین و کاریگەرترین قوتابخانەی دەروونی لە سەدەی بیستەمدا. نوسەرو

[٢] سیگمۆندفرۆید (Sigmund Freud) ساڵی١٨٥٦ز لە دایك بووەو ساڵی ١٩٣٩ ز کۆچی دوایی کردووە،دامەزرێنەری قوتابخانەی دەروونشیکاریەو لە ساڵی ١٩٠٠ز لە نوتریش دایمەزراندووە ،پزیشك و ئەدیب و دەروونزان بووە،لە لێکۆڵینەوەکانیدا جەختی زۆری لە سەر نەست و ڕۆڵی سێکس و ڕووداوەکانی پێنج ساڵی یەکەمی منداڵی کردووە،چەندین تیۆری داهێناوە لە بواری دەروونزانی و بە کارەکانی خزمەتێکی گەورەی بە بوارەکانی کۆمەڵناسی و ئەدەب و هونەر کردووە.

ڕۆمان نووسی گەورەی ئەمەریکی ئێرنست هەمنگوای(Ernest Hemingway)[٣]پێش ئەوەی تفەنگچی و نیشانە شکێنێکی بێ وێنە بێ، پێش ئەوەی ماسیگرو دەریاوانێك بێ لە قولایی دەریاکاندا ڕاوی ماسی بکات، خوێنەر ونوسەرێکی گەورەو بلیمەت بووە، خوێندنەوەو نووسین هاورێی هەمیشەیی بووە بە شێوەیەك هەموو ڕۆژی لەگەڵ گزنگی بەیانی لەخەو هەستاوەو دەستی بە خوێندنەوەو نووسین کردووە، تا دواجار توانیوویەتی چەندین بەرهەمی ناوازە لە بواری ئەدەبی چیرۆك و ڕۆماندا پێشکەش بکات و شێوازەکەشی لە نووسیندا ببێت بە یەکێك لە کاریگەرترین و جوانترین شێوازەکانی نووسین لە سەدەی بیستەم.

نووسینی ڕۆتین و بەردەوامی لە نووسیندا دەبێتە وا دەکات نوسەر باشتر و جواتر بنوسێت بە مەرجێك بۆشایی نەکەوێتە نێوان هەردوو قۆناغی خویندنەوەو نووسین، گرنگیدان بە تاقیکردنەوە لەسەر شێوازی نووسینی جۆراوجۆر و وەرگرتنی ڕاو و سەرنج و پێشنیاری کەسانی پسپۆر وشارەزا لە بواری نووسین دەبێتە هۆی دڵنیایی زیاتر وناسینی هەڵەکان و ڕاستکردنەوەی هەڵەو ناتەواویەکان و باشترکردنی شێوازی نووسین (الموسی، ٢٠١٤).

---

[٣] ئێرنست هەمنگوای (Ernest Miller Hemingway) نوسەرو ڕۆمانووسی گەورەی ئەمەریکی هەمەنگوای ساڵی ١٨٩٩ لە خێزانێکی مام ناوەند و باوکێکی پزیشك و دایکێکی مۆزیسیان لە دایك بووە،ساڵی ١٩٦١ کۆچی دوایی کردووە.لە جەنگی جیهانی یەکەمدا وەك سەربازێك بەشداری لە جەنگەکە کردووەو دوای گەرانەوەشی بۆ ئەمەریکا وەك پاڵەوانێکی مەزن پێشوازی لێ کراوە.یەکێك بووە لە چیرۆکنوس و ڕۆمان نوسەمەزنەکانی سەردەمی خۆی،لەماوەی ژیانیدا چەندین شاکاری گەورەی نوسیووە، بەناوبانگترینیان: مردن لە ئێوارەدا (Death in the Afternoon)، لافاوی بەهار(The Torrents Of Spring)، ماڵئاوایی لە چەك(Goodbye Weapon)، براوە شتێك بەدەست ناهێنێ(Winner Take Nothing)،تەپۆلکە سەوزەکانی ئەفریقیا(Green Hills of Africa)،زەنگەکان بۆ کێ لێ دەدرێ( For Whom the Bell Tolls).دوایین ڕۆمانیشی پیرەمێرد و دەریا (The Old Man And The Sea)، کە یەکێکە لەو ڕۆمانانەی بۆسەر زۆربەی زمانەکانی جیهان وەگێردراوە(Ernest Hemingway,www.biblio.com) لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی ڕابردووشدا لە لایەن مامۆستا شێرکۆ بێکەس کراوە بەکوردی و مامۆستا شوکر مستەفا پێیداچۆتەوە و ئەمینداریتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان لەچاپی داوە .

### ٣. ٥ –پێداچوونەوە Review

پێداچوونەوە(Review)بە دەق یەکێکە لە گرنگترین ئەو کارانەی نوسەر دوای نووسینی بابەتە یان بەشێکی دیاریکراوی بابەتەکەی ئەنجامی دەدات و بە دیدیکی ڕەخنەگرانەوە بە بابەتەکەیدا دەچێتەوە، ئامانج لە پێداچوونەوە ڕاستکردنەوەی دەقە لە هەڵەو لادانی چەمك و لێدوانی بێ مانا و ڕوونکردنەوەی بیرۆکەی نارۆشن و هێنانەدی گونجان لە نێوان ڕەگەزەکان و هاوسەنگی و گشتگیدا، پێداچوونەوە ئامرازێکە بۆ باشترکردنی دەق و گەیشتن بە شێوازێکی نایاب لە کۆتاییدا، بۆیە پرۆسەکە پێویستی بە چەندین جار دووبارە کردنەوە هەیە بە مەبەستی دڵنیا بوون لە دروستی ناوەڕۆك و هەڵەی زمانەوانی و خاڵبەندی و پێکهاتەی دەق بە گشتی. لە پرۆسەی پێداچوونەوەدا نوسەر دەتوانێت سوود لە سەرجەم کەناڵە جیاجیاکی تایبەت بە ڕەخنەو پێداچوونەوە چ نوسراو یان ئەلکترۆنی وەربگرێت، دەتوانێت لە دارشتن و ڕێکخستی ڕستەو بەکارهێنانی یەکەو چەمکو زاراوەکاندا سوود لە شێوازە جیا جیاکانی نووسین وەربگرێت، هەروەها دەتوانێت سوود لە فەرهەنگ و ئینسکلۆپیدیای زمانەوانی وەربگرێت و لە بەکارهێنانی چەمك و واتاو زاراوەکاندا بە شێوەیەکی دروست پشتیان پێ ببەستێت. پێویستە نوسەر کاتی تەواوی بۆ پێداچوونەوە لەبەر دەست بێت، ئەگەر کاتی پێویستی بۆ پێداچوونەوە نەبێت ئەوا لە بنەڕەتدا کاتی گونجاو وپێویستی بۆ نووسین نەبووە، کاتێك نەتوانێت پێداچوونەوە بکات، لە کۆتایی پرۆسەی نووسین و پێداچوونەوە نوسەر دووچاری ماندووبوون و جۆرێك لەبارودۆخێکی وەستانی هزری بوو و نەیتوانی زیاتر بیربکاتەوەو دوا وشە بۆ بابەتەکەی بنوسێت و بڕیاری کۆتایی لەسەر بدات، دەشێت کۆمەڵێك ڕێگا بگرێتە بەر کە یارمەتی دەرن بۆ هەڵگەڕانەوەی بارودۆخەکەو ئاراستەگریەکی هێمنانەی باشتر لەگەڵ نووسیندا، وەك:

- بەردەوامی لە نووسین و بڕوا هێنان بەوەی نووسین پرۆسەیەکی بەردەوام و لەسەرخۆیە هەر بیرۆکەیەك دەبێتە هۆی دروست بوونی بیرۆکەی تر. هەروەها گەڕانەوە بۆ ڕای پسپۆر و کەسانی شارەزا لە بابەتەکەدا و کەڵك وەرگرتن لە تێبینی و بیروبۆچوونەکانیان.
- دەست هەڵگرتن و وازهێنان لە نووسین بۆ ماوەیەکی دیارکراو و دووبارە گەڕانەوەو سەری بە ڕوانگەو دیدێکی تازەو نوێ (نحو كتابة افضل، www. siironline. org).

## ٦.٣ –پاكنووسى Revision

دواى پرۆسەى پێداچوونەوە بە دەق، دواجار پێویستە توێژەر یان نوسەر بژارى بابەتەكەى بكات و چارەسەرى هەر جۆرە كەم و كورتى و ناتەواویەكانى بكات پێش ئەوەى بریارى كۆتاى لەسەربدات و پەسەندى بكات. لە پرۆسەى بژاركردندا توێژەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ كۆمەڵێك بنەماو ڕێنمایى لە نووسینى ئەكادیمیدا، وەك پشت بەستن بە ڕاستى و بەڵگەى زانستى و داهێنان و دوور كەوتنەوە لە وشەى بێ سوود و دووبارەكردنەوەى وشەكان و پەیڕەوكردنى شێوازى كورت بڕى لە نووسیندا و دووركەوتنەوە لە بەكارهێنانى دەستەواژە و زاراوەى نامۆ و بوونى یەكیەتى بابەت لەنێوان بەشەكانى دەقدا. لە ژێر ڕۆشنایى ئەم بنەمایانەدا دەشێت سەرجەم كەم وكورتیەكانى نووسینەكەى نەهێلێت وبابەتەكەى بگەیەنێتە ئاستێكى بەرز كە بچێتە خانەى نووسینى ئەكادیمى و شیاوى بلاَوكردنەوە بێت.

پرۆسەى پاكنووسى (Revision) دووبارە خوێندنەوەى بابەت و كۆنترۆڵكردن و ڕاستكردنەوەى هەڵەكان لەخۆدەگرێت، بۆیە بە گرنگترین پرۆسە دادەنرێت لە كۆتایى نووسیندا تیایدا نوسەر هەوڵى نەهێشتنى هەڵەو هەمواركردنەوەى بابەتەكە دەدات لە ڕێگەى:

- ڕاستكردنەوەى هەڵە ڕێنوسیەكان كە لە ئەنجامى خێرایى و جەختكردنى زیاتر لەسەر زانیارى ڕووى داوە.
- ڕاستكردنەوەو هەمواركردنەوەى هەڵە زمانەوانیەكان لە دەقدا.
- ڕاستكردنەوەى ئەو هەڵانەى لە شێوازى نووسیندان. بۆ نموونە لادانى وشەى نەگونجاو دانانى وشەى گونجاو لە شوێنیدا، یان هەمواركردنەوەى ئامراز و پیتەكان و دەربڕینى لاواز وگۆڕین و دارشتنەوەیان بە شێوەیەكى بەهێزتر.
- پێداچوونەوە بە خاڵبەندى و دانانى ئامرازى خاڵبەندى گونجاو لە شوێنى پێویست (خليل و الصمادى، ٢٠٠٩).
- لادان و سڕینەوەى هەر زانیاریەك لە دەقدا كە پەیوەندى بە بابەتى سەرەكى نووسینەكە نەبێت.
- هەوڵدان بۆ دڵنیابوونى تەواو لە دروستى ناونیشانى بابەت و بوونى یەكیەتى بابەت لە نێوان بەشەكانى دەقدا.

## ٤-داواكاریە زمانەوانیەكانی نووسینی ئەكادیمی Language requirements of academic writing

زمان(Language) ئامرازێكە بۆ تێگەیشتن و گەیشتن لە لایەن مرۆڤ و ئاژەڵەوە بەكاردێت، بەڵام جیاوازی زمانی مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵ لەوەدایە، مرۆڤ سەربەستەیەكی تەواوی هەیە و كۆمەڵێك دەنگ بەكار دەهێنێت بۆ تێگەیشتن كە بەردەوام لە گۆڕاندان، هەرچی ئاژەڵە كۆمەڵێك دەنگ بەكار دەهێنێت و زمانەكەشی سنوورداره. هەروەها زمان ئامرازێكە بۆ گەیاندن و تاكە ڕێگایەكە بۆ ئاڵوگۆڕكردنی زانیاری و پاراستن و گەیاندنی كەلتورو زانیاری لە نەوەیەكەوە بۆ نەوەیەكی تر.

لەڕووی زمانەوانیەوە زمان(Language) وكەرەستەی زمان دەنگە، بەڵام ژمارەی دەنگەكان لە زمانێكەوە بۆ زمانێكی تر جیاوازە. پێوەرێكی دەنگیە بۆ لەیەكتر گەیشتن بەكاردێت، بە ڕشتەی وتن و بیستن لە كۆمەڵێكی دیاریكراودا كاردەكات. یان كۆمەڵێك دەنگ و واتاو ڕێسایە، لێكدانی دەنگ و واتاكان ڕێساكان دروست دەكات و بە هۆی بوونی ئەو ڕێسایانەشە مرۆڤ فێری زمانی تر دەبێت.

لە ئەنسكلۆپیدیای بەریتانی(Encyclopaedia Britanica) پێناسەی زمان كراوە بەوەی بریتیە لە گوزارشت كردن لە بیرۆكەكان (Ideas) بە دەنگی ئاخاوتن (Speech- Sounds) كە لە وشەدا كۆدەبنەوەو ڕستەیەك پێك دەهێنن هەڵگری كەرەستەی فیكری بێت. هەروەها پێناسە كراوە بەوەی بریتیە لە توانست و كارامەییەكانی مرۆڤ بۆ گەیشتن و كارلێكردن و فێربوون لە ڕێگای ئاخاوتن و گوێ گرتن و خوێندنەوەو نووسین لە چوار چێوەی سیستمێكی عەقڵی و دەرروونی و سادەو ئاڵۆز لە هەمان كاتدا (Robins & Crystal, ٢٠١٥).

زانایانی بواری زمانزانی هەریەكە لە گۆشەنیگایەكەوە پێناسەیەی زمانیان كردووەو تا ڕادەیەك دیدو تێروانیەكانیان بۆ زمان و پرۆسەی زمانەوانی لە یەكتر جیاوازن، ئەو جیاوازیەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئاراستە زانستی و زمانەوانیەی كە هەریەكە لە زمانزانەكان پێڕەویان كردووە لە لایەك، لە لایەكی تر هەرەیەكەیان لە كات و سەردەمێكی جیاواز لە ئەوانی لە زمان و بنەما زمانەوانیەكانی كۆڵیوەتەوە، تەنانەت تا ساتەوەختی ئەمڕۆش نەك ڕایەكی یەكگرتوو بەڵكو جیاوازیەكی زۆر لە نێوان زانایانی بواری زمانەوانی لە تێڕوانیان بۆ سروشتی زمان و

ڕیشەو بنەماکانی فێربوون و وەرگرتنی زماندا هەیەو ناکۆکی و مشت و مڕێکی زۆریان لەسەر ئەو بابەتە لە نێواندا هەیە بە جۆرێك زۆریەی بیروراکان دابەش بوونە بەسەر دوو ئاراستە، ئارساتەیەکیان پێی وایە زمان خۆرسکەو لە ڕانگەی ئاراستەی تردا زمان وەرگیراوەو مرۆڤ وەك هەر شتێکی تر لە ژینگە فێری دەبێت و وەری دەگرێت، یەکێك لە بەناوبانگترین ئەو زانایانەش کە لە زمان و بنچینە زمانیەکانی کۆڵیوتەوەو لە لایەن زۆریك لە هەوادارانی زمان و توێژەرەانی بواری لێکۆلینەوە لە زمان پشت بە بیروبۆچوونەکانی دەبەسترێت زاناو فەیەلسوف و زمانزان و بیرمەندی گەورەی ئەمەریکی نۆم چۆمسکی[4](Noam Chomsky )یە کە پێی وایە زمان بریتیە لە کۆمەڵێك ڕستەی دیاری نەکراو و هەر ڕستەکیش لە کۆمەڵەکەدا دیاریکراوە لە ڕووی درێژیەوەو پێك هاتووە لە کۆمەڵێك ڕەگەزی دیاریکراو. لە کاتێکدا زانایانی تر لە گۆشەنیگایەکی تردا پیناسەی زمانیان کردووە، بۆ نموونە لە ڕوانگەی ڕۆمان جاکوبسۆن (Roman Jacobson)[5] زمان بریتیە لە سیستمێکی گەیاندنی کۆمەلآیەتی پێك هاتووە لە کۆمەڵێك هێماو گوزراشتی دەنگی کەبە شێوەیەکی هەرەمەکی وەرگیراون، بەو مانایەش زمان

---

[4] نۆم چمسکی(Noam Chomsky) مامۆستای زمان و فەیلەسوفی ئەمەریکی،ساڵی ١٩٢٨ز لە ویلایەتی پەنسلڤانیا(Pennsylvania) لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە دایك بووە،میژوونوس و رەخنەگرو چالاکوانی سیاسی و یەکیە لە زانا بەناوبانگەکانی بواری لێکۆڵینەوە لە زانین و زانستی لۆژیك.مامۆستای زمانەوانی فەخری پەیمانگای ماساچوستسی تەکنەلۆژیا ( Massachusetts Institute of Technology)یە کە بۆ ماوەی زیاتر لە ٥٠ساڵ کاری تێدا کردووە،زیاتر لە ١٠٠ کتێبی دانسقەی دەربارەی بابەتەکانی جەنگ و ئاشتی و هونەر و زمان و زانستە مرۆییەکان چاپ و بلاوکردۆتەوە.یەکێکە لە ڕۆشنبیرە هەرە بەرزەکان لەسەر ئاستی جیهان و لە ڕاپرسیەکدا لە ساڵی ٢٠٠٥ ز بەیەکەم مرۆڤی ڕۆشنبیر لە جیهان ناوزەدکراوە.هەروەها چۆمسکی باوکی زانستی زمانەوانی نوێ(Linguistics talk) و کەسایەتی سەرەکی فەلسەفەی شیکاری (Analytic philosophy) و زۆریك لە زانستەکانی وەك ژمیریاری و ماتماتیك و دەروونزانی کەوتوونەتە ژێر کاریگەری بیرو بۆچوونەکانی.

[5] ڕۆمان جاکوبسۆن(Roman Jacobson) زانای زمانزان و ڕەخنەگری ئەدەبی ڕووسی لە تشرینی یەکەمی ١٨٩٦ز لە دایك بووە.یەکێك لە پێشەنگانی قوتابخانەی شێوەکاری ڕووسی( Formalism Russian School) و زمانزانێکی گەورەی سەدەی بیستەم بووە،لە بوارەکانی زمان و شیکردنەوەی پێکهاتەی زمان و ئەدەب و شیعر و هونەر چەندین بابەت و بەرهەمی ناوازەی پێشکەش کردووە. لە تەممووزی ١٩٨٢ز کۆچی دوایی کردووە.

شتێکی خۆرسك نیەو وەرگیراوە نەك وەك ئەوەی چۆمسکی بۆی چووە. بەڵام زانای زمانەوانی فردیناند دو سۆسیر[٦](Ferdinand de Saussure) بڕوای وایە زمان سیستمیکی گونجاو هاوڕێکە لە نیشانەو هێمای جیاواز ئامادەیە لە هزری هەر تاکێك لە کۆمەڵدا و بە شێوەی هەرەمەکی لە ڕێگەی چالاکیە کرداریەکانی وەری گرتووە. هەرچی ئیدوارد ساپیر[٧]( Edward Sapir)ە پێی وایە زمان وەك ڕێزمان و زمانی پەتی ڕێگایەکی مرۆیی نا ڕەمەکیە بۆ گواستنەوەی بیرۆکەو هەست و ئارەزووەکان بە یارمەتی سیستمێك لە هێمای وەرگیراو بە شێوەی هەرەمەکی. جیاوازی نێوان ئەم پێناسانەو دیدو تێڕوانینی هەریەك لە زاناکان بۆ زمان بە ڕۆشنی دیارە، بەڵام لە هەمان کاتدا تەواوکەری یەکترن (الجبوری، ٢٠١١).

لە ڕووی کەلتور و ڕۆشنبیریەوە زمان(Language) دیاردەیەکی ڕۆشنبیریە، چونکە ڕۆشنبیری و کەلتوورە جیاوازەکان بە وردی زمان و توانای گوزارشتکردنی ماناکان لەیەکتری جیا دەکرێنەوە، لە هەمان کاتدا دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیشە، چونکە زمانی کۆمەڵگا داب و نەریت و بەهاو پێوەرەکان و هەڵچوون و تەنانەت جووڵەی تاکەکانیشی پێك هێناوە.

---

[٦] فردیناند دو سۆسیر(Ferdinand de Saussure) زمانزانی سویسری بەناوبانگ سوسیر ساڵی ١٨٥٧ز لە ژنیف(Genève)دایك بووە،بە دامەزرێنەری زانستی زمانەوانی نوێ و باوکی قوتابخانەی بونیاتگەری زانستی زمانەکان دادەنرێت،لە بەناو بەناگترین ئەو زانایانە بووە کە گرنگیەکی زۆری بە لێکۆڵینەوەی وەسفی داوە لە بواری زمانەوانی،بڕوای بوو زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیەو لێکۆڵینەوە لە زمانیش پێویستی بە لێکۆلینەوە لە مێژووی مرۆڤ و زمان هەیە،یەکێك بوو لەو زانایانەی گرنگیەکی زۆری بە زمانەکانی هیندۆ ئەورووپی و لێکۆڵینەوە لەو زمانانە داوە،یەکەم زانابوو پێی وابوو لە لێکۆڵینەوەی زمانەکان دەکرێت گرنگی بە زانستی ئاماژەکان بدرێت و پێشنیاری ناوی سیمیۆلۆژی (Semiology) بۆ زانستی ئاماژەکان کردووە.ساڵی١٩١٣ کۆچی دوایی کردووە.بەناوبانگترین بەرهەمەکانیشی(Recherche dans la linguistique générale)ە سێ ساڵ دوای مەرگی خۆی لە ساڵی ١٩١٦ز بلاوکراوەتەوە.

[٧] ئیدوارد ساپیر (Edward Sapir) زانای زمانزان و مرۆڤناسی ئەمەریکی بەڕەچەڵەك ئەڵمانی ساپیر،ساڵی ١٨٨٤ز لە ئەڵمانیا لە دایك بووە،کاتێك منداڵ بووە لەگەڵ باوانی ئەڵمانیایان جێ هێشتووەو بەرەو ئەمەریکا کۆچیان کردووە،یەکێك بووە لەو زانایانەی بەشداریەکی کارای هەبووە لە بەرەوپێش بردنی زانستی زمانەوانی، گرنگی بە کاریگەری دوولایەنەی نێوان زمان کەلتور داوە،هەوڵی داوە لە پەیوەندی نێوان جیاوازیە زمانەوانیەکان لە لایەك وجیاوازیەکانی وێناکردنی کەسی بۆ جیهانی دەرەوە بکۆڵێتەوە.ساڵی ١٩٣٩ز کۆچی دوایی کردووە.

لەرووی بایۆلۆژی و فسیۆلۆژیەوە زمان و ئاخاوتن وەك هەر دیاردەیەکی ودەروونی و عەقڵی بنەمای فسیۆلۆژی و بایۆلۆژی خۆی هەیە، کۆئەندامی دەماری ناوەندی و لەگەڵیشیدا کۆئەندامی هەناسەدان بەشدارە لە دروست کردنی دەنگ و ئاخاوتن، واتە لە مێشکی مرۆڤداچەند ناوچەیەکی تایبەت بە لە پرۆسەی زمان وقسەکردن هەیە و گرنگترین ئەوناچانەش هەردوو ناوچەی برۆکا (Broca)و ڤێرنیکا (Wernicke)ن لە مێشکی پێشەوەدا.

زمان(Language)پەیوەستە بە بیری مرۆڤ و یەکەم ئامرازی بیرکردنەوە لە گوزارشتکردندا زمانە، گوزارشتکردن بیرۆکەیەکە دەشێت دابڕێژرێت کاتێك کەسی خوێنەر یان بیسەر بیخوێنیتەوە یان گوێ بیستی بێت و لێی تێ بگات، چونکە بیری مرۆڤ بە بێ زمان تەنها پرۆسەیەکی ناوەکی و لێڵەو زمانیش بە بێ بیر تەنها زۆربڵێیە، بەڵکو مرۆڤ بە هۆی بیرکردنەوەی رووت و کۆنترۆڵکردنی هزرەکانیەوە خۆی لە زۆربڵێی و زۆر وتن و زۆر نووسینی پوچ و بێ مانا دەپارێزێت و هەوڵ دەدات بە وردی گوزارشت لە هزرو بیرەکانی بکات.

لە روانگەی دەروونزانی، زمان(Language) دیاردەیەکی دەروونیە، چونکە زمان بیر و هزرە کاتێك دەگاتە ئاستێکی بەرزی زمانەوانی و لە هەمان کاتدا دیاردەیەکی دەروونیە کاتێك دەگاتە ئاستێکی بەرزی پێگەیشتن و گوزراشت کردن لە دۆخەکان، یەکێك لە گرنگترین ئامرازەکانی گوزارشت کردن لە دۆخە دەروونیەکان زمانی هێماو ئاماژەکانە، بۆ نموونە مامۆستا پەنجەی شایەتمانە دەخاتە سەردەمی تا فەرمان بەسەر فێرخوازەکاندا بکات بۆ ئەوەی بێ دەنگ بن، یان هەندێ وڵات هێمای وەك هەڵۆ و باز دەکەن بە دروشم بۆ ئەوەی بەهێزی خۆیان نیشان بدەن. بەڵام زمانی هونەری بە بەکارهێنانی وێنەو رەنگ و مۆزیك و سەما گوزارشتێکی شارستانیانەو مێژوویانەی هەر تاك و گەل و نەتەوەیەکە، هەرچی زمانی زانستی ئەکادیمیە لە گشت زمانەکانی تر داماڵرا و رووتترە، چونکە زمانی زانست لە بەرزترین ئاستدا هاوکێشەی ماتماتیکی بەکاردەهێنێت (شکشك، ٢٠٠٨).

لەرووی زمانەوانیەوە چەندین خاڵی هاوبەش لە نێوان نووسینی ئەکادیمی و جۆرەکانی تری نووسین هەیە، بەڵام جیاوازی نێوانیان دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی زمانی زاستی و توانستی زمانەوانی وپێکهاتەی زمان و بە هێزی میتۆد و لۆژیکی زمانەوانی لە نووسینی ئەکادیمیدا.

تایبەتمەندی نووسینی ئەکادیمی و سروشتی پەیوەندی نێوان زمان و بیرکردنەوە لە نووسیندا چەندین داواکاری زمانەوانی هەیە، وەك:

### ٤. ١– کارامەییە زمانەوانیەکان language skills

کارامەییە زمانەوانیەکانی مرۆڤ بریتین لە چوار جۆر و بەیەکەوە کارامەیی زمانەوانی مرۆڤ پێك دەهێنن کە پەیوەستن بە دروستی هەستەوەرەکان و توانستە عەقڵیەکان و تواستی بیرکردنەوەو بەکارهێنانی دەست، وەك:

#### ٤. ١. ١–کارامەیی ئاخاوتن Talking skill

ئەو کارامەییە بە پلەی یەکەم پشت دەبەستیت بە بەکارهێنانی زمان و گەروو و دەنگەژێکان و شوێن و دەرچەی پیتەکان لە دەم و زار و دەرهاویشتنی پیتەکان و دروستی دەربڕین و هەموو ئەو لایەنانەی پەیوەندیان بە دەنگ و ئاخاوتن و قسەکردن و گەیاندنی زارەکیەوە هەیە.

#### ٤. ١. ٢–کارامەیی بیستن Listening skill

ئەو کارامەییە پشت دەبەستێت بە هەستی بیستن و پەیوەستە بە پێشوازی کردن لە وشەو ڕستەو گوزارشتی وتراو.

#### ٤. ١. ٣–کارامەیی نووسین Writing skill

بریتیە لە کارامەیی بەکارهێنانی پیت و وشەو ڕستەو هێماو ژمارەی وتراو و نووسین و تۆمارکردنیان.

#### ٤. ١. ٤–کارامەیی خوێندنەوە Reading skill

بریتیە لە کارامەیی بینین یان بەرکەوتن لای کەسانی نابینا دەربارەی پیت و وشەو ڕستەو گوزارشت و دەقی نوسراو. ئەو چوار کارامەیە بەشێکن لە کارمەیی فێربوون و توێژینەوەو نووسینی زانستی (الشهراني، ٢٠١١).




**شێوە(١. ٨) کارامەییە زمانەوانیەکان ڕوون دەکاتەوە**

## ٤. ٢ – شێوازەکانی گوزارشتکردنی زمانەوانی Styles of linguistic expression

زمان(language) پێکهاتەیەکی ئاوێتەییە، وشەکان یەکەی بنچینەیی زمانن کە پێك هاتوون لە ناو و ڕاناو و فرمان و ئاوەڵناو و ئامرازەکانی تر. بۆیە لە نووسینی ئەکادیمی لە چوارچێوەی بابەتدا گرنگی دەدرێت بە بەکارهێنانی وشە ودەربڕین و داتاشین و دانانیان بە شێوەیەکی دروست، وەك دارشتنی ناونیشانەکان و پێکهێنانی برگەو ڕستەو بەشەکانی نووسین بە گشتی، جگە لەوە نووسینی ئەکادیمی چەند شێوازێکی تایبەت لە گوزارشتکردنی زمانەوانی هەیە کە خۆی لە بەکارهێنانی وشەو ڕستەو خستنەڕوویان بە شێوەیەکی دروست دەنوێنێت، ئەوەی کە دەقی نوسراوی ئەکادیمیشی لە نوسراوی ئاسایی جیاکردۆتەوە گرنگی دانە بە وشەو وشەکاری و دارشتنیان بە شێوەیەکی گونجاو (الشهرانی، ٢٠١١).

زمان (language) شیرێکی دوو سەرە بەدەست نوسەر، ڕەنگە زمان ببێتە هۆی بەهێزبوونی لۆژیکی توێژینەوە و بەرەو دەرنجامی زانستی و بابەتی باوەڕپێکراوی ببات، لە وانەشە بەرەو ئاراستەیەکی هەڵەو خەڵەتێنەری ببات بە شێوەیەك لۆژیکی بێت لە ڕووی ڕوخسارەوە، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆك و پەیوەندی لۆژیکیەوە پڕ هەڵەوهەڵەکاری بێت. ئەم بابەتە لە زانستی لۆژیکدا(Science logic) بە هەڵە لۆژیکیەکان(Fallacies) ناو دەبرێت، بەپێوەری زانستی و میتۆدی و لۆژیکیش بریتیە لە بە درۆخستنەوە (Falsification) کە میتۆدیکی ڕەخنەگرانەیە چاودیری لۆژیکی تویژینەوە دەکات هەر لە گریمانەکان و پێشەکی تا میتۆد و دەرەنجامەکان وسەرچاوەکان بۆ گەیشتن بە ڕاستگۆی توێژینەوەو دڵنیابوون لە دروستی دەرەنجامەکانی. هەندێ جار توێژەر ئەم هەلە لۆژیکیانە بێ مەبەست ئەنجام دەدات، بۆیە گرنگە لە زمانی نووسینی دڵنیا بێت و بەرەو هەڵەی لۆژیکی نەیبات (زکور، ٢٠٠٧).

شێوازە زمانەوانیەکان کە لە نووسینی ئەکادیمیدا جۆراوجۆرن و بە گرنگترین پێوەر بۆ هەڵسەنگاندن و بڕیاردان لەسەر نووسین دادەنرێن، سەبارەت بەو بابەتە نوسەرو بیرمەندی عەرەب جابری(محمد الجابری) لە زنجیرەی کتێبەکانیدا دەربارەی ڕەخنەگرتن لە عەقڵی عەرەبی و ئیسلامی ئاماژە بە سێ جۆر شێوازی نووسین دەکات:

### ٤. ٢. ١–شێوازی ڕاگەیاندن Rhetorical Style

پشت دەبەستێت بە شێوازەکانی ڕەوانبێژی و وشەکاری و یاری کردن بە وشەو گوزارشت و واتا فراوانەکانی، ئامانج تیایدا ناسینی جۆر و ئاستێکی دیاریکراو نیە، هەروەها سەلماندنی ڕاستی گریمانەیەکی زانستی و وەلآمدانەوە بە پرسیارگەلی زانستی نیە لە بوارێك لە بوارەکانی مەعریفی و مرۆیی و گەردوونی.

### ٤. ٢. ٢–شێوازی ناساندن Cognitive Style

بریتیە لە شێوازی زانین (Knowledge) و لێکۆڵینەوە لە کێشەو دیاردەکان وسەلماندن و پۆلێنکردنیان، دەرەنجامەکانیشی شایانی بەکارهێنان و تێگەیشتن و شیکارین.

### ٤. ٢. ٣–شێوازی سەلماندن Brilliant Style

بریتیە لە شێوازی لێکۆڵینەوەی زانستی بە بەکارهێنانی لۆژیك و ڕێگای میتۆدی زانستی بە مەبەستی سەلماندن یان ڕەت کردنەوەی گریمانەیەکی دیاریکراو، یان وەلآمدانەوە بە پرسیارگەلێکی لۆژیکی و دەرخستنی ڕاستی و شتی لیلّ و نادیار لە بوارێك لە بوارەکانی ژیاندا (الجابری، ١٩٨٤، ١٩٨٦).




شێوە(١.٩)شێوازەکانی نووسین بە پێی دیاریکردنی جابری ڕوون دەکاتەوە

## ٤. ٣–جەخت كردن لە دروستی واتا زمانەوانیەكان Ensure the integrity of linguistic meanings

هەر وشە یان دەستەواژەیەك ئەرك و ڕۆڵی تایبەتی خۆی هەیە لە پێكهێنانی ڕستەدا و گوزارشت لە یەكێك لەم چوار واتایانە دەكات، واتای یەكەمیان بریتیە لە واتای زمانەوانی (Meaning of linguist) كە سەرچاوەكەی فەرهەنگ و ئینسكلۆپیدیای زمانەوانین. واتای دووەمیان بریتیە لە واتای زاراوەیی یان چەمكی (Meaning of terminology) كە سەرچاوەكەی ئەدەبیاتی مەعریفی پەیوەندار بە بە چەمك و زاراوەكانی بابەتەكەیە. بەلاّم واتای سێیەمیان بریتیە لە واتای كرداری (Procedural meaning) كە پەیوەستە بە ئامانجەكانی توێژەر و توێژینەوەو سنوور و میتۆدی توێژینەوە. هەرچی واتای چوارەمیانە بریتیە لەواتای دەقی نوسراو(Meaning of the context of written text) كە پەیوەستە بە واتای گشتی دەقی نوسراو دەربارەی بابەتێكی دیاری كراو.

لەلایەكی تر، هەر وشەیەك دوو واتای هەیە، واتایەكیان ڕاستەقینە(Real meaning) و ئەوتریان خواستراو(Metaphorical meaning)، هەروەها هەر وشەیەك هاوواتای خۆی هەیە یان نزیكن لە یەكتر و لە ڕووی زمانەوانی و زاراوەییەوە هەمان واتا دەبەخشن ، زۆر جار وشەیەك واتای شتێكی دیاریكراو دەدات و دەشێت بۆ شتێكی تری نزیك لەو شتە بەكار بهێنرێت، لە هەمان كاتدا چەندین واتا گوزارشت لە یەك وشە یان دەبڕین دەكەن، مانای وشەكانیش ڕۆڵێكی گرنگیان هەیە لە واتای گشتی ڕستەدا، ڕستەش هەڵگری واتای بیرۆكەیەكە، هەر پەرەگرافێكیش واتەیەك دەبەخشێت. واتاو پەیوەندی واتایی نێوان بەشەكانیشە هێزی واتاداری گشتی بابەتەكە دیاری دەكات و دەری دەخات كە بابەتێكی واتادارو تەواوە. هەروەها هەر بابەتێك لە چوار چێوەیەكی لۆژیكی تایبەت داڕێژراوە پێك هاتووە لە چەند بیرۆكەیەكی یەك بە دوای یەك و تەواوكەری یەكتر و سێ واتای سەرەكی لەخۆگرتووە:

- واتای یەكەمیان پەیوەندی بە مەبەستی نوسەر خۆیەوە هەیە، ئامانجی نووسینی چیە و دەیەوێت چی بە كەسانی تر بگەیەنێت، ڕەنگە نوسەر لە گەیاندنی واتاكە بە پلەیەك سەركەوتوو بێت و لەوانەشە سەركەوتوو نەبێت، سەركەوتن و سەرنەكەوتنیش لە گەیاندنی واتاكە بە پلەی یەكەم بەندە بە توانستی زانستی و زمانەوانی نوسەر.

- واتای دووەمیان پەیوەندی بە کەسی خوێنەرەوە هەیە کە چۆن لە واتای بابەتەکە دەگات، ئەم تێگەیشتنە بە تەنها ناوەستێتە سەرتوانستی نوسەر و کارامەییە زانستی و فیکری و زمانەوانیەکانی، بەڵکو بەندە بە توانست و کارامەیی خوێنەریشەوە بۆ تێگەیشتن لە واتای بابەت.
- واتای سێیەمیان بریتیە لە مانای ڕاستەقینەو ئەو ڕاستیانەی بابەتەکەیان پێکهیناوە، ئەمەش بە پلەی یەکەم بەندە بە هەوڵ و کۆششی فیکری و زانستی کەسی نوسەر و کارامەییە فیکری و زانستیەکانی(الشهراني، ٢٠١١).

هەروەها یەکێکی لە داواکاریە زمانەوانیە گرنگەکانی نووسینی ئەکادیمی بەکارهێنانی چەمك و زاراوەو زمانی ژمارەو هێماکان بە دروستی( Proper use of concepts, terminology language numbers and symbols). چەمك و زاراوەکان لەهەر بابەت و چالاکیەکی مرۆییدا زمانی تایبەت بەخۆیان هەیە، ئەمەش بۆتە هۆی جیاوازی زمانی زانستی لە بوارەجیاجیاکانی زانستی و مەعریفی و جیاوازی جۆری نووسینی ئەکادیمی لەگەڵ لەگەڵ جۆریکی تریان. بەکارهێنانی زمانی چەمك و زاراوەکان بە دروستی بەرزی ئاستی زاستی و مەعریفی و کارامەیی و شارەزایی کەسی نوسەر نیشان دەدات و دەبێتە هۆی ئەوەی خوێنەر بە باشی لە بابەتەکە بگات، لاوازی لە بەکارهێنانیشیان دەبێتە هۆی لاوازی دەرەنجامەکان و ڕەنگدانەوی نێگەتیڤی دەبێت بەسەر بەهای زانستی دەقی نوسراو. لە لایەکی تر، زمان بە تەنها بریتی نیە لە پیت و وشەکان، بەڵکو سەرجەم ژمارە و هێماو کورتکراوەکان و داتا بەیانیەکان و ئامرازە زانستی و زمانیەکان لەخۆدەگرێت کە توێژەر یان نوسەر لە لێکۆڵینەوەکەدا بەکاریان دەهێنێت. بۆیە گرنگە نوسەر یان تویژەری ئەکادیمی توانست و کارامەیی پێویستی لە بەکارهێنانی ئەو زمانەدا هەبێت (الشهراني، ٢٠١١). لە لایەکی دارشتنی ناونیشانی بەهێز(Strong wording of titles) لە ڕووی زمانەوانیەوە گرنگیەکی زۆری هەیە لە نووسینی ئەکادیمی و پێویستە گوزراشت لە ناوەڕۆك و ئامانج و سنوور و میتۆد و داواکاریە گشتیەکانی بابەتی نوسراو بکات. ناونیشانێکی پوخت وکورت کە سەرجەم یەکەکان بەیەکەوە ببەستێتەوەو ناونیشانی لقە لاوەکیەکیانیش گونجاو ڕێك بن لەگەڵ ناونیشانی سەرەکی و بە پێی چوارچێوەو لۆژیکی نووسین دانراوبن.

## ٤. ٤-پێکهێنانی ڕستەو بڕگەی دروست Correct formatting of sentences and paragraphs

بێگومان وشە یەکەی بنچینەیی پێکهاتەی زمانە وهەر وشەیەکیش واتایەکی تایبەت بە خۆ دەبەخشێت، بەلآم مانای وشەکان پەیامێك ناگەیەنن ئەگەر لە ڕستەیەکی تەواودا( Useful sentence)ڕێك نەخرێن، ڕستەش بریتیە لە گوزارشتێکی زمانەوانی واتاو بیرۆکەیەکی سەربەخۆی لەخۆگرتووە، هەروەها سەرەتاو کۆتایی هەیە کە بە ئامرازەکانی خاڵبەندی وەك هەمیشە بەخاڵ کۆتایی دێت. لە نووسینی ئەکادیمیدا کۆمەڵێك ڕستە هەن ڕستەی سەرەکین لەگەڵ کۆمەڵێك ڕستەی لاوەکی یان شیکاری کە پاڵپشتی بیرۆکەو واتای ڕستە دەکەن، بۆیە پێویستە لە دەقی نوسراودا ڕستەکان گونجاو تەواوکەری یەکتر بن، واتە ڕستە دەبێت تەواوکەری ڕستەی پێش خۆی وسەرتایەك بێ بۆڕستەی داهاتوو. هەرچی بڕگەیە (Paragraph) بریتیە لە کۆمەڵێك ڕستەی بە یەکەوەگرێدراو و واتادار، یان بە واتایەکی تر بریتیە لە ڕستەیەکی بابەتی(Topic Sentence) کە لە کۆمەڵێك ڕستە پێك هاتووەو بیرۆکەی سەرەکی(Main Idea) بڕگەیان لەخۆگرتووە. لە هەر بڕگەیەکدا ڕستەی سەرەتا یان دەسپێك و ڕستەی سەرەکی یان لاوەکی و ڕستەی کۆتایە هەیە، هەروەها ئامرازی پەیوەندی و خاڵبەندی لە نێوان ڕستەکاندا هەیە کە هۆکاری گونجان و یەکانگیری و ڕۆشنی بیرۆکەو واتای گشتی بڕگەکەن. ڕێکخستنی لۆژیکانەی ڕستەکان(Logical Order)و بەکارهێنانی وشەو زاراوە کلیلیەکانیش(Key Words) بەڵگەن لەسەر بیرۆکەی بەشی ڕستەکان و بیرۆکەی سەرەکی بڕگە (Hoffman et al,٢٠٠٦).

یەکێکی تر لە داواکاریە زمانەوانیەکانی نووسینی ئەکادیمی بەکارهێنانی ئامرازەکانی پەیوەندیە بە دروستی(Correct use of splicing tools)، ئامرازەپەیوەندیەکان هەمیشە ڕستەیەك بە یەك دەبەستنەوە یان دەکەونە نێوان دوو ڕستە لە بڕگەیەکدا، هەروەها نێوان بڕگەکان و بەشە جیاجیان و بەشە سەرەکیەکان کە پێك هاتوون لە پێشەکی و ناوەڕۆك و کۆتایی. بەکارهێنانی ئەم ئامرازانە بە دروستی دەبێتە هۆی گونجان و یەکگرتووی دەقی نوسراو لە یەکەیەکی بابەتی دیاریکراودا، هەروەها جیاکردنەو ڕیزبەندی (Excellence and sequencing) و ڕێکخستن (Organization) و بەراوردکردن (Comparison) و پۆلینکردن (Category) و بەستنەوەی بیرۆکەکان (Linking ideas) بە یەکتر و ئاسانکاری گواستنەوەی بیرۆکەیەك بۆ بیرۆکەیەکی

تر و بەشێك بۆ بەشێکی تر ( What is Academic writing, ww w. waylink-english.
.(co. uk

هەروەها بەکارهێنان و یاریکردن بە کەرەستەوئامرازە زمانەوانیەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە (linguistic tools for critical thinking) یەکێکی ترە لە داواکاریە زمانەوانیە گرنگەکانی نووسینی ئەکادیمی، توانست و کارامەییە زمانەوانیەکانی بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانە ( Critical Thinking) گرنگترین توانست و کارامەیی پێویستن لە نووسینی ئەکادیمیدا. بۆیە نوسەر یان توێژەری ئەکادیمی پێویستی بە ئاستێکی بالآی ئەم توانستە هەیە لە پرۆسەکانی لێکدانەوە و پوختەکردن پێداچوونەوەو بژارکردنی هەموو هەموو ئەو زانیاریانەی گوێ بیستیان دەبێت یان دەیان خوێنێتەوە، ئەویش کەسێکە هەڵگری کارامەیی فیکری و زانستی و زمانەوانیەو توانای لێکدانەوەوپرسیارکردن(Analysis and inquiry)وگومان(Doubt)وپوختەکردن (Revision) و پەیوەستکردن(Connectivity) و پێداچوونەوەی بەردەوام وداهێنانی تازەی هەیە، هەروەها کەسێکە توانای پەسەنکردنی زانیاری و ڕەتکردنەوەو بڕیاردان و هەڵویست وەرگرتنی هەیە لە ڕوانگەیەکی زانستی و زمانەوانی لە چوارچێوەی عەقڵ و لۆژیکدا (الشهراني، ٢٠١١).

## جۆرەکانی نووسینی ئەکادیمی Types of Academic Writing

نووسینی ئەکادیمی بابەتگەلی جۆراوجۆری لەخۆگرتووە، گرنگترین ئەو بابەتانەی دەچنە خانەی نووسینی ئەکادیمەوە بریتین لە وتار (Essay) و ڕاپۆرت(Report) و کورتەنامەی زانستی (Summary paper)و سانتێز (Synthesise)کورتە توێژینەوە( Mini research paper)و توێژینەوە (Research)وپەرتووکی توێژینەوە(Book research) و پێداچوونەوەی پەرتووک (Book review) و پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو و (Literature review) وپێداچوونەوەی هاوەڵان(Peer review) وگۆڤاری زانستی(Journal).




شێوە(٢. ١)جۆرەکانی نووسینی ئەکادیمی دەخاتەڕوو

## ١-وتار Essay

وشەی وتار، لە زمانی کوردیدا لە بەرامبەر وشەی (المقاله) عەرەبی و (Essay) ئینگلیزیدا بەکاردەهێنرێت، ئەم وشەیەش لە بنەڕەتدا لە وشەی(Attempt)ی فەرەنسی وەرگیراوە، چونکە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٥٧٠ز لە لایەن ئەدیب ونوسەری فەرەنسی میشێل دو مۆنتێن[٨] (Michel de Montaigne)بەکار هاتووە کاتێك هەوڵی دا بیروبۆچوونەکانی بخاتە سەر کاغەز و بە شێوازێکی زانستیانە گوزارشتیان لێوە بکات.

وتار(Essay)بریتیە لە کورتە نووسینێکی زانستی یان ئەدەبی یان فەلسەفی دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو کە بیرۆکە یان کۆمەڵێك بیرۆکەی بەیەکەوەبەستراوی لە خۆگرتووە بە ئامانجی چارەسەرکردنی کیشەیەکی دیاریکراو. یاخود دارشتنێکی کورتە دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو پێویستی بە شارەزایی و کارامەیی و ئاستێکی باڵای توانستی رێکخستن و دەست نیشانکردن ولێکدانەوەو شیکردنەوەی بابەتەکان هەیە. بە واتایەکی سادەو کورت بریتیە لە پارچە نوسراوێکی مامناوەند لە ڕووی نووسینەوە بە شێوازیکی سادەو ساکار دەنوسرێت و تیایدا هەوڵی چارەسەرکردنی بابەتێك لە بابەتەکان دراوە(الرشیدی، ٢٠١٧). یان بریتیە لە دەقێکی نوسراو کە بە دەوری بیرۆکەیەکدا خولاوەتەوەو گفتوگۆی بابەتێکی کردووە، هەر لە سەرەتای پەیدابوونیەوە پەیوەستە بە بواری ڕۆژنامەگەری و ئامانجیشی سەرەکیشی بریتیە لە ڕازی کردنێکی فیکری بە ڕێگایەکی هاندەرانەی چێژبەخش نەك هەڵچوونی ویژدانی (زهدی و ابوزید، ٢٠٠٩).

وتار(Essay) لە ڕوانگەی جونسۆن(Johnson) بریتیە لە چوارچێوەکی ئەدەبی کە لەسەر بنەمایەکی ڕێکخراو نە نوسراوە. بەڵام لە ڕوانگەی مۆریە(Moreh)پارچە پەخشانێکی مام

---

[٨] میشێل دو مۆنتێن (Michel de Montaigne):ساڵی ١٥٣٣ز لە شاتۆ دو مۆنتێن () لە فەرەنسا لە دایك بووە،بە پێشەنگی وتاری نوێ لە ئەوروپا دادەنرێت و یەکێك بووە لەو نوسەر فەرنسیانەی زۆرترین کایگەری هەبووە لە بزوتنەوەی ڕێنیسانسی فەرەنسا.زۆر کاریگەر بووە بە فەیلەسوفەکانی گریکی کۆن بە تایبەت نوسینەکانی ئەرستۆ(Aristotle) .گرنگی بە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی یۆنانی و لاتینی داوە.لە ماوەی ژیانیدا چەندەها وتاری نوسیوەو سەرجەم وتارەکانی لە سێ بەرگدا بلاوکردۆتەوە.ساڵی ١٥٩٢ز کۆچی دوای کردووە.

ناوەندە بە دەوری بابەتێکی دیاریکراو یان بەشێکیدا دەخولێتەوە. لە ئینسکلۆپیدیای بەریتانی (The British Encyclopedia) پێناسەی وتار کراوە بەوەی بریتیە لە پارچە پەخشانێکی مام ناوەند لە ڕووی کورتبڕی و درێژبڕی کە واتا بەخشە بەو لایەنەی نوسەر لە نزیکەوە لێی دواوەو بە شێوازێکی وا نوسراوە خوێنەر بە باشی و بە خێرایی لێی تێ بگات. لە فەرهەنگی ئۆکسفۆردا (Oxford Dictionary) وتار بریتیە لە نوسراوێکی کورت دەربارەی بابەتێکی تایبەت یان لقێك لە لقەکانی بابەتەکە کە بە شێوازێکی نارێکخراو سنووردار نوسراوە. هەروەها (محمد عوض محمد)نوسەری کتێبی هونەری وتاری ئەدەبی (فن المقالة الادبية) پێناسەی وتاری بەوە کردووە کە بریتیە لە پارچە پەخشانێك چارەسەری بابەتێکی تایبەت بە نوسەر دەکات (خليل و الصمادي، ٢٠٠٩).

لە ژێر ڕۆشنایی ئەو پێناسانەدا، وتار(Essay) پارچە پەخشانێکی کورتە تیایدا لێکۆڵینەوە لە بابەتێك دەکرێت بە ئامانجی چارەسەرکردنی گرفتێك گرفتەکان، جۆرێکی تایبەتە لە نووسین کە فۆرمێکی تایبەت بە خۆی هەیەو لە جۆرەکانی دیکەی نووسین جیادەبێتەوە. ژمارەی لاپەڕەکانی کەم و سنووردارەو ناوەڕۆکەکەشی بیرۆکەیەك لەخۆ دەگرێت کە گوزارشت لە ڕای نوسەر خۆی دەکات، گرنگترین ڕەگەزەکانیشی بریتین لە:

- زمان(Language)وتارنووسی پێویستی بەئاستێکی بەرزی زمانەوانی لە بەکارهێنانی وشەو ڕستەو دەستەواژەی زمانەوانی گونجاو و کورت بڕی و ماناداری لە نووسین هەیە.
- بیرۆکە(Idea) وتار هەمیشە بە دەوەری ئایدیاو بیرۆکەیەکدا دەخولێتەوەو نوسەر هەوینی بیرۆکەکەی لە ئەزموونی و خۆی و کەسانی دەورووبەری و خویندنەوەی بەردەوام و ڕۆشنبیری گشتی وەرگرتووە.
- سۆز(Emotion)ڕەگەزیکی تری وتارنووسیە کە زیاتر لە وتاری خودی بەسەر کەسایەتی نوسەر ڕەنگی داوەتەوە نەك وتاری بابەتی(زهدي و أبوزيد، ٢٠٠٩).

## ١.١- چەمکی وتار لە مێژوودا The essay concept in history

چەمکی وتار(Essay)بە ماناو شێوازی تازە کە پەیوەستە بە بواری ڕۆژنامەگەری و ئەدەبی و هونەری و زانستی جۆراوجۆر جیاوازە لە چەمك وشێوازی کۆنی وتارنووسین. لەگەڵ ئەوەی هەندێ سەرچاوە مێژووی وتاری کۆن دەگێرنەوە بۆ فەیلەسوفی چینی کۆنفیشیۆس (Confucius)و فەیلەسوفەکانی گریکی کۆن وەك فیساگورس(Pythagoras) و ئەفلاتون (Plato) و ئەرستۆ (Aristotle)، بەلام زۆربەی سەرچاوە باوەپێکراوەکان سەرتای دەستپێکی وتاریان بۆ دو مۆنتێن (Montaigne) گێراوەتەوە و پەیوەستیان کردووە بە ناوی ئەو نوسەرە فەرەنسیەوە، کاتێك لە سەدەی شازدەهەمدا هەوڵی داوە کتێبێك دەربارەی ژیان و ئاکار بنوسێت و تیایدا پشت بە وەرگرتن و بەکارهێنانی کەلەپوور و ڕۆشنبیری یۆنانی و لاتینەوە ببەستێت. بیرو بۆ چوونەکانشی بە شێوەی پەخشان برگە برگە دابرێژێت بە جۆرێك هەر برگەیەك بیرۆکە و بۆچوونێکی دیاریکراو بخاتەڕوو. بە سوود وەرگرتن و گەڕانەوەشی بۆ کتێبی کۆن لە کاتی نووسیندا توانیویەتی ناوبانگێکی گەوەر پەیدا بکات. مۆنتینی ناوی کتێبەکەی ناوە ئەزموونەکانی مۆنتێنی(Expériences Montaigne)کە یەکەم کاری ناوازەی لەم چەشنە پێشتر لە لایەن هیچ نوسەرێکی تر ئەنجام نەدراوە، بۆیە بە شێوەیەکی بەرفراوان بلاّوبۆتەوە و بۆ زمانەکانی ئینگلیزی و ئیتالی وەرگێردراوە. دوای خوێندنەوەشی لە لایەن فەیلەسوفی ئینگلیزی فرانسیس بیکۆن[١](Francis Bacon)بە ڕادەیەك پێی سەرسام بووەو بۆتە هۆی ئەوەی ئەویش کتێبێکی لەوجۆرە بنوسێت بە ناوی وتارەکان( Essays)کە چەند ئامۆژگاریەکی سیاسی و مۆراڵی لەخۆگرتبوو. بیکۆن هەوڵی داوە وتارەکانی بە شێوازێکی وشك دوور لە شێوازی باو بنوسێت، بە سوود وەرگرتن لە شێوازی کۆن و درککردن بە کاری تازەو داهێنانی نوێ توانی تەکانێکی گەورە بە بزووتنەوەی وتارنوسی بدات لە ئەدەب و نووسینی ئینگلیزیدا. لە دوای بیکۆنیش چەنیدن نوسەر و وتارنوسی تر دەرکەوتن کە ڕۆلێکی گەورەیان هەبووە لە

---

[١] فرانسیس بیکۆن (Francis Bacon) ساڵی ١٥٦١ز لە لەندەن (London) لە دایك بووە.فەیلەسوف و ئەدیبێکی گەورەو دامەزرێنەری ئاراستەی تاقیکاری نوێ لە زاست و فەلسەفە یە.پارێزەرو سیاسەتمەدارێکی بێ وینە بووەو چەندین بەرهەمی ناوازەی لە بوارە جیاجیاکانی ئەدەب و زانست و فەلسەفەو زماندا پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە.ساڵی ١٦٢٦ز کۆچی دوایی کردووە.

بەرەوەپێش بردنی ئاست و شێوازی وتارنووسین. لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی وتار و وتارنوسی بە ڕۆژنامەو بواری ڕۆژنامەگەری تا سەدەی هەژدەهەم پەیوەندیەکی ئەوتۆ نەبووە، بەلاٚم لە سەدەی هەژدەهەمدا نووسینی وتار گۆرانکاریەکی گەورەی بەخۆوە بینی لە بەر :

- دەرکەوتنی کۆمەڵێك نوسەری گەورە لە بواری وتارنوسی و هەمەجۆری ئەو بابەتانەی کاریان لەسەر کردووە کە تیایدا پشتیان بەستووەو بە دەست نیشانکردنی کێشەکانی کۆمەڵگاو هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنیان نەك تەنها تێرامانی کەسی و وەرگرتن لە کتێب و سەرچاوەی کۆندا.
- دەرکەوتنی کۆمەڵێك گۆڤاری جۆراوجۆر کە دەرەفەتی نووسین و بلاٚوکردنەوەی وتاریان بۆ نوسەران ڕەخساندووە.

بوونی ئەم دوو هۆکارە بووە وای کردووە وتارنووسین بچێتە قۆناغێکی پێشەکەوتووتر و وتاریش شێوەو فۆرمێکی جیاواز لە قۆناغەکانی پێشووتر وەربگرێت. دیارترین کەڵە نوسەرانی ئەم قۆناغەش ڕیچارد ستیل[10](Richard Steele) و جۆزیف ئەدیسۆن[11](Joseph Addison) بوون، یەکەمیان گۆڤاری تاتلر (Tatler)ی بلاٚوکردەوە، دواتر بەیەکەوە گۆڤاری چاودێر( The Spectator) یان دەرکرد کە هەردوو گۆڤارەکە ڕۆڵێکی مەزنیان بینی لە گەشەکردنی وتاری نویێ و پەیوەستکردنی وتارنوسی بە بواری ڕاگەیاندن و پێکهینانی شێوازێکی تازەی وتارنوسی

---

[10] ریچارد ستیل (Richard Steele) زاناو سیاسەتمەداری ئێرلەندی (Steele) ساڵی ١٦٧٢ز لە دوبلن (Dublin) لە دایك بووە.لە خوندنگاکانی چارلس هاوس و ئۆکسفۆرد خوێندوویەتی.یەکێك بووە لە هاوڕێ نزیکەکانی جوزیف ئەدیسۆن و بە یەکەوە گۆڤاری چاودێر (The Spectator) یان دەرکردووە.ساڵی ١٧٢٩ز لە کارمارسۆن ویلز (Carmarthen Wales) کۆچی دوای کردووە.

[11] جۆزیف ئەدیسۆن (Joseph Addison) : ساڵی ١٦٧٢ز لە دایك بووە.شاعیرو نوسەر و ڕۆژنامەنوس و شانۆکاریووە.یەکێك بووە لە بەناوبانگترین وتارنوسەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەم وبە بلاٚوکردنەوەی وتارەکانی لە هەردوو بلاٚوکراوەی تاتلەر(Tatler) و چاودێر(The Spectato) لەگەڵ ڕیچارد ستیل(Richard Steele)تەکانێکی تازەیان بە بزوتنەوەی وتارنوسی و ڕەخنەی ئەدەبی داوە، سیاسەتمەدارێکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە، بریکاری وەزیری دەرەوەو بۆ چەندین خول و ئەندامی پەرلەمانی بەریتانیا بووە،ساڵی ١٧١٩ز کۆچی دوایی کردووە.

نزیك له خوێنەرەوە. له سەدەی نۆزدەدەهەمیشدا چارڵس لام [١٢](Charles Lam ) و هەندی وتارنوسی تر هەوڵیاندا به فراوان کردنی بابەت و بواری کارکردنیان له قاوغی سەدەی پێشووتر دەربچن و تەکانێکی تر به بزووتنەوەی وتارنوسی بدەن که بووه هۆی دەرچوونی وتار له بازنەی ئەدەبیاتی فەرەنسی و ئینگلیزی و بلاوبوونەوەی له تەواوی ولآتانی ئەوروپیدا، خێرایی ژیان و پێوستی گۆڤار و ڕۆژنامەکانیش به بابەت ڕۆژ به ڕۆژ بووه هۆی دەرکەوتنی وتاری جیاواز له بواری جۆراوجۆردا، وەك وتاری سیاسی و وتاری کۆمەلآیەتی و وتاری ڕەخنەیی و وتاری هونەری و. . . تاد (صبیح واخرون، ١٩٩٧).

وتار(Essay)و بزووتنەوەی وتارنووسی بەدرێژایی ڕۆژگار تا سەردەمی ئەمرۆ بەچەندین قۆناغی گرنگدا تیّ پەڕیووە، گرنگترین ئەو قۆناغانەش بریتین له:

- قۆناغی لاوازی وبیّ هێزی(wcakness) لەم قۆناغەدا زیاتر گرنگی به وشەکاری و پەیوەستکردنی وتارنووسی به کیشه کۆمەلایەتی و سیاسیەکان درواوە.
- قۆناغی چاکسازی(Righteousness)لەم قۆناغەدا گرنگی به دارشتن ودوورکەوتنەوە له وشەکاری دراوەو بابەتی وتارو وتارنووسیش پەیوەست کراوە به کێشەو گرفتەکانی سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەلگا.
- قۆناغی ئازادی(libcration)تیادا گرنگی به ئازادی وتار و وتارنووسی دراوە.
- قۆناغی سەقامگیری(Straightening)تیایدا وتارو وتارنووسی جۆرێك له سەقامگیری بەخۆوە بینووە.

---

[١٢] چارلس لام (Charles Lam) سالّی ١٧٧٥ز له ئینگلستان له دایك بووە.یەکێك بووە له وتارنووس و ڕەخنه گەورەکانی سەردەمی خۆی.له بواری ڕەخنەگریدا به نوسینی نموونەی شاعیرانی درامای ئینگلیزی(Models of English drama pocts) ناوبانگی دەرکردووە.یەکێك له گرنگترین بەرهەمەکانی چیرۆکەکانی شکسپیر (Tales from Shakespeare)ە که له سالّی ١٨٠٧ز به هاوبەشی لەگەلّ خوشکەکەی ماری لام(Mary Lamb) چاپ و بلاوی کردۆتەوە.بەناوبانگترین بەرهەمەکانیشی له بواری وتارنوسیدا وتارەکانی ئیلیا(Essays of Elia)ن که کۆی وتارەکانی نێوان سالآنی (١٨٢٣-١٨٣٣)ن.سالّی ١٨٣٤ز له لەندەن(London)کۆچی دوایی کردووە.

## ٢.١ –جۆرەکانی وتار The Types of Essay

وتار و جۆری وتارەکان بە پێی بابەتەکانیان لە یەکتر جیادەکرێنەوە، لە ڕووی ناوەڕۆکەوە وتار دابەش دەبێت بەسەر وتاری ڕامیاری و وتاری کۆمەڵایەتی و وتاری ئابووری و وتاری بازرگانی و وتاری مێژوویی و وتاری سایکۆلۆژی . . تاد. لە ڕووی شێوازیشەوە دابەش دەبێت بەسەر وتاری زانستی و وتاری ئەدەبی. لەڕووی کورتی و درێژیەوە دابەش دەبێت بەسەر وتاری کورت و وتاری درێژ. لە ڕووی هەڵوێستی نوسەریشەوە دابەش دەبێت بەسەر وتاری خودی و وتاری بابەتی. لە ڕووی هونەریەوە دابەش دەبێت بەسەر وتاری چیرۆك ئامێز و وتاری نواندن یان شانۆیی و نامەو گەشتنامە. بەڵام لە ڕووی گواستنەوە بۆ جەماوەر دابەش دەبێت بەسەر وتاری خوێنراو وتاری بیستراو و وتاری بینراو (النابلسی، ٢٠٠١). گرنگترین جۆرەکانی وتارەکانیش بە شێوەیەکی گشتی بریتین لە:

### ١.٢.١– وتاری وەسفی و گێڕانەوە Narrative and descriptive Essay

مەبەست لە وتاری وەسفی، وتارێکە بە شێوەی چەند خاڵێکی کورت و پەیوەست بە یەك نوسراوە، هەمیشە چیرۆکێك یان ڕوداوێکی درستکراوەو لە خەیاڵی نوسەرداو تیایدا هونەرو تەکنیکی سەرنج ڕاکێش بەکاردەهێنێت بۆ ڕاکێشانی مەیلی خوێنەرو نزیك کردنەوەی لە بابەتەکە، هەندێ جار چیرۆکی ڕووداوێکە لە ڕابردوودا ڕووی داوە یان ڕەنگە لە داهاتوودا ڕوو بدات. بەڵام وتاری گێڕانەوە وتارێك نیە لە چەند خاڵی کورت پێك هاتبێت، بەڵکو وتارێکی واتارەو پێویستی بە ڕوونکردنەوەو ڕاڤەکردنی تێرو تەسەلی بابەتەکە هەیە. لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی کەس و ڕووداو و شت و مەکەکان لە دەقی وتاری گێرانەوەدا پێویستی بە توانستێکی باڵای هونەری نووسین لە بەکارهێنانی وشەو لێکدانەوەی ئاڵۆز هەیە. بۆ نموونە باسکردنی شۆکۆلاتە لە وتاری گێرانەوەدا پێوستی بە باسکردنی چێژ و لەززەتی خواردنی هەیە، دواتر پێکهاتەکەی (feel) کە لە چی پێك هاتووەو چۆن دروست کراوە، هەروەها کاتێك مرۆڤ هەست بە تام خۆشیەکەی دەکات کە لە بۆنەیەکی خۆشدا دەیخوات. ئامانج لە نووسینی هەردوو وتاری وەسفی و گێرانەوە پێدانی وێنەیەکی ڕوون و ئاشکرای ڕووداوێکە کە نوسەر بینوویەتی یان ڕووبەڕووی بۆتەوە، ئەمەش پێویستی بە تەرخان کردنی برگەکانی بەشی دووەمی وتارەکەیە بۆ باس کردنی وێنەی شوێن و ڕووداو کەسەکان.

### ١. ٢. ٢- وتاری ڕوونکەرەوەیی Persuasive Essay

لەم وتارەدا نوسەر کێشەیەك دەخاتە ڕوو و لێی دەکۆڵێتەوە، وەك خستنەڕووی تیۆرێك یان بابەتێك لە بابەتەکان کە پێوستی بە ڕوونکردنەوەی تێروتەسەلی بابەتەکەو هێنانەوەی کۆمەڵێك نموونەی ڕۆشن هەیە لە ڕوونکردنەوەدا، هەندێ جار نوسەر لە خستنەڕووی نموونەکاندا یەکێکیان هەڵدەبژێرێت و دەیکات بە تەوەری سەرەکی و گفتوگۆ و لێکدانەوەی زیاتری لەسەر دەکات، بەلأم لە زۆربەی کاتدا ئامرازی پێوانەکردن بەکار دەهێنێت بۆ پێوانکردنی ئەو بابەتەی لێی دەکۆڵێتەوە (المقال وانواعه، منتديات غيوم الثقافية، www. ghyoom. net).

وتاری ڕوونکەرەوەیی زۆرجار بە وتاری بەڵگەنامەیی(Argumentative essay) ناو دەبرێت، چونکە نوسەر تیایدا هەوڵ دەدات بە شێوازێکی ڕوون و لۆژیکیانە وتارەکەی بنوسێت و بە بەڵگەو داتای ئاماری ڕاکانی بسەلمێنێت و باوەڕ بە خوێنەر بهێنێت ئەو دەرنجامانەی بە دەستی هێناوە ڕاست و دروستن. زۆربەی ئەو وتارانەی لە بوارە جیاجیاکانی زانستی و بوارەکانی دەروونزانی و کۆمەڵناسیدا دەنوسرێن دەچنە خانەی ئەو شێوازەی وتارنووسین.

### ١. ٢. ٣- وتاری شیکاری Expository Essay

لە وتاری شیکاریدا بابەتێك شی دەکرێتەوە بۆ چەند ڕەگەزێکی جۆراوجۆر تیایدا نوسەر هەر ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکان دەخاتەڕوو و لە برگەیەك یان دوو برگەدا گفتوگۆ و لێکدانەوەیان لەسەردەکات. ئامانجی سەرەکی لە نووسینی ئەم شێوازەی وتارنووسیندا شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی ڕاستی ڕوداوێك یان چیرۆکێکە لە ڕێگەی بەراوردکردن و ڕاڤەکردن و شیتەڵکردن و باسکردن و گێڕانەوەی ڕووداوەکە.

### ١. ٢. ٤- وتاری ڕەخنەیی Critical Essay

لە وتاری ڕەخنەییدا شیکردنەوەی ڕەخنەگرانە بۆ بەرهەمێکی ئەدەبی یان زانستی یان هونەری دەکرێت، تیایدا نوسەر بابەتەکە دەخاتەڕوو وبە تێر و تەسەلی ڕاڤەو شیکردنەوەی بۆ دەکات و هەڵیدەسەنگێنێت. ئامانج لە نووسینی ئەم وتارە هۆشیارکردنەوەی خوێنەرە بە گرنگی بابەت و بارمەتیدانیەتی بۆ خویندنەوەو تیگەیشتنی زیاتر لە بابەت و ناوەڕۆکی بابەتەکە.

### ١. ٢. ٥- وتاری بەراوردکاری Comparative Essay

وتاری بەراوردکاری(Comparative Essay) وەك بە ناوەکەیەوە دیارە وتارێکە تیایدا بەراوردی نێوان بابەتێك یان کۆمەڵێك بابەت دەکرێت. لەم وتارەدا نوسەر بە مەبەستی دەستکەوتنی زانیاری تازە لە ڕێگەی بەراوردکردنەوە لایەنە لێکچوو و جیاوازەکانی دوو بابەت یان کۆمەڵێك بابەتی پەیوەندار بە بوارێکەوە دەردەخات ولێکدانەوەو شیکردنەوەی تێرو تەسەلیان لەسەر دەکات. ئەم بەراوردکرنە هەندێ جار لە نێوان دوو بابەت و هەندێ جاری تر لە نێوان کۆمەڵێك یەکەی گشتی پەیوەندار بە بوارێکی دیاریکراودەکرێت، وەك تیۆرەکان و توێژینەوەکان و کۆمپانیاکان و زانکۆکان و ستراتیژیە ڕامیاریەکان و. . تاد.

### ١. ٢. ٦- وتاری پیشەیی Career Essay

ئەم وتارە ئەرکێکە لە چوارچێوەی کۆمەڵێك یاساو ڕێساو داواکاریدا ئەنجام دەدرێت تیایدا پشت دەبەسترێت بە کۆکردنەوەی زانیاری دروست و ڕاستی بابەتی و پێشکەشکردنیان بە لایەنی پەیوەندار. ئەم وتارە جیاوازە لەسەرجەم وتارەکانی تر بەوەی دەربڕی هەست و بیروڕاکانی نوسەر نیە، بەڵکو ئەرکێکە جێبەجێی دەکات لەسەر داواکاری یان ئاراستەکردنی لە لایەن دەزگایەك کە کاری تێدا دەکات، یان کۆمەڵێك کەس کە بەیەکەوە لە بوارێکدا کار دەکەن بە ئامانجی وەرگرتنی بڕیاری گونجاو دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو، بۆ نموونە پێشکەشکردنی ڕاپۆرتی کارو چالاکی بە ناوەندی کار لەسەر داواکاری ناوەندەکە، یان پێشکەشکردنی ئەزموونێکی زانستی، یاخود پرۆپۆزەلێك بە ناوەندێکی توێژینەوەی زانستی بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە بابەتێك و بە پێچەوانەشەوە پێشکەشکردنی ناوەندەکە بە کەسی نوسەر بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکە.

### ١. ٢. ٧- وتاری ڕۆژنامەگەری Journal Essay

وتاری ڕۆژنامەگەری یەکێکە لەو وتارانەی زیاتر لە هەموو وتارەکانی تر بە خوێنەر دەگات، چونکە نوسەر کەرەستەو زانیاریەکانی وتارەکەی لەو واقیعەی تێیدا دەژیت کۆدەکاتەوەو پێشکەش بە خوێنەری کۆمەڵگاکەی دەکات. بۆ نموونە پێشکەشکردنی زانیاری کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری وڵات و ناوچەکە بە خوێنەر بە پشت بەستن بە زانیاری ڕاست و دروست بە ئامانجی بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری تاکەکانی کۆمەڵگا بەو زانیاریانە. ئامانج لە نووسینی وتاری ڕۆژنامەگەری کورتبڕی و درێژبری نیە، یان کۆکردنەوەی زانیاری زۆر و پێشکەشکردنیان نیە، بەڵکو مەرجی بنەڕەتی لە نووسین و ئامادەکردنیدا دڵسۆزی و ڕاستگۆیی ڕوانگەی قوڵ و قوڵبوونەوەیە لە زانیاری و ئەو ڕووداوانەی کە ڕوو دەدەن، هەروەها پەیڕەوکردنی هەنگاوەکانی نووسین و گرنگی دان بە شێوازی سەرنج ڕاکیشانە بۆ ڕازیکردن و باوەڕهێنانی خوێنەر بە ناوەڕۆکی وتارەکە (المقال وانواعه، منتديات غيوم الثقافية، www. ghyoom. net).

### ١. ٢. ٨ -وتاری خودی Self- essay

وتاری خودی(Self- essay)جۆرێکە لەوتار ناوەڕۆکەکەی گوزارشت لەکەسێتی و بیرکردنەوەو هەست و سۆز و ناخی کەسی وتارنووس دەکات، بابەتێکە پێویستی بە کۆمەڵێك کارامەیی تایبەتی وەك پێگەیشتن و توانستی خوێندنەوەی بیری خوێنەرو کارمەیی بیکردنەوەی ڕەخنەگرانە هەیە(Michael,٢٠١٧).

### ١. ٢. ٩ - وتاری بابەتی Objectivity essay

جۆرێکە لەوتار تیایدا نوسەر بە شێوەیەکی بابەتی و زانستیانە لە بابەتێك دەدوێت، هیچ جۆرە لایەنگریەك بۆ لایەنێکی بابەتەکە دەرنابڕێت و ڕاو سەرنجەکانی بە بەڵگەو داتای سەلمێنراو پشت ڕاست دەکاتەوە(Types of Essays,Time٤writing,www. time٤writing. com).

### ١. ٣ –هەنگاوەکانی نووسینی وتار The Steps of writing Essay

نووسینی وتار لە هەر بابەت و بوارێکدا پێوستی بە کۆمەڵێك هەنگاوی گرنگ هەیە، وەك:

#### ١. ٣. ١– دەست نیشانکردنی بابەتی نووسین Select the writing topic

هەنگاوی یەکەم لە نووسینی وتاردا دەست نیشانکردنی بابەتی نووسینە،بۆیە پێویستە نوسەر ورد بێت لە دیاریکردنی بابەت و زانیاری تەواوی هەبێت دەربارەی بابەتەکە و ڕەچاوی ئەوە بکات جێی ڕەزامەندی خوێنەرەکانی دەبێت. هەروەها پێویستە خۆی لە درێژبڕی وکۆکۆدنەوەی زانیاری دەربارەی بابەتەکە بپارێزێت، بەڵکو گرنگی بە قوڵبوونەوەی لە بابەت و شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی زانستیانەی بابەتەکە بدات. بۆ نموونە لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان بڕوا بەخۆبوون و لوتبەرزی لە وتارێکی کورتدا بە تەنها پێویستی بە کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی بڕوا بە خۆبوون و لوتبەرزی نیە، بەڵکو پێوستی بە قوڵبوونەوە لە بابەت و ڕاڤەکردنی زانستیانەو دەرخستنی جیاوازی نێوان هەردوو خاسیەتەکە بە بەڵگە هێنانەوەی زانستی هەیە.

#### ١. ٣. ٢– ئامانجی وتار Objective of the Essay

وتار زمانی دواندنی خوێنەرە بە بێ دەنگی، ئەم زمانەش پێوستی بە شیکردنەوەو لێکدانەوەو گفتوگۆ و بەڵگەهێنانەوەو هونەری ڕازی کردنی خوێنەرەوە هەیە. بۆیە پێویستە نوسەری وتارنوس پێش دیاریکردنی ناونیشانی بابەت بزانێت ئامانجی چیە لە نووسینی وتارەکەیدا و چۆن دەینوسێت و بۆچی دەینوسێت و بۆ کێ دەینوسێت؟ دوای دیاریکردنی ئامانج و ڕۆشنی ئامانجەکەشی کە یەکێکە لە فاکتەرە سەرەکیەکانی سەرکەوتن لە نووسیندا دەتوانێت هەنگاو بەرەودیاریکردنی ناونیشانی وتارەکە بنێت.

#### ١. ٣. ٣– ناونیشانی وتار Title of Essay

ناونیشانی هەر وتار یان بابەتێك گوزارشت لە ناوەڕۆکی بابەتەکە دەکات، گرنگیەکەی لەوەدایە کە یەکەم دەرچەیە چاوی خوێنەر بکەوێتە سەری و لە ڕێگەیەوە بزانێت ناوەڕۆکی وتارەکە چی لەخۆ گرتووە. بۆیە پێویستە ناونیشانی وتار ڕوون و دیاریکراو بێت و گوزارشتی

تەواو لە ناوەڕۆکی وتار و سەرجەم یەکەکانی وتارەکە بکات. گرنگە ناونیشانی وتار لەسەرەتای نووسیندا دیاری بکرێت نەك دوای نووسینی وتارەکەو ئامانجەکەشی بەرەو چارەسەرکردنی کێشەیەکی دیاریکراو بێت نەك کۆمەڵێك کێشەو گرفتی تێکهەڵکێش بە جۆرێك خوێنەر تووشی مەلەل و بێ تاقەتی بکات.

### ١. ٣. ٤– چوارچێوەو پلانی وتار Structure and plan of the Essay

دوای دانانی ناونیشان، پێویستە نوسەر چوارچێوەی گشتی وتارەکەی دیاری بکات، وەك چۆن نژیار بۆ دروستکردنی خانوو یان ئەپارتمانێك لە سەرەتادا پێوستی بە نەخشەو دیزایینێك هەیە بۆ ئەوەی خانووەکەی لەسەر دروست بکات، بە هەمان شێوە نوسەریش لە دەستپێکی نووسیندا پێوستی بە دانانی نەخشە و پلان و چوارچێوەی وتار هەیە.

وتار بە شێوەیەکی گشتی پێکهاتووە لە سێ بەش، ئەوانیش بریتین لە پێشەکی (Introduction) و ناوەڕۆك (Display) و کۆتایی(Conclusion). لە پێشەکیدا نوسەر گرفتی بابەتەکە دەخاتەڕوو و ئامانج و گریمانەکانی ڕوون دەکاتەوە. لە ناوەڕۆکدا دەرنجامەکانی دەخاتەڕوو و هەوڵی شیکردنەوەو ڕاڤەکردنیان دەدات. لە کۆتاییشدا جەخت لەسەر دەرەنجامەکانی دەکات و هەوڵی پشت ڕاستکردنەوەیان دەدات. بۆ نموونە لێکۆڵینەوە لە گرفتی (ناپاکی هاوڕێیەتی) پێویستی بە گەڕان بە دوای هەموو ئەو زانیاریانە هەیە کە پەیوەندیان بە گرفتەکە هەیە، وەك:

- تایبەتمەندی کەسایەتی ناپاك و کەسی بێ مۆڕاڵ و لاواز لە ڕووی کەسایەتیەوە.
- پەیوەندی ناپاکی بە شێوازی پەروەردە
- پەیوەندی ناپاکی بەسیفەتەکانی تری وەك درۆکردن و دزی و دەستبڕی.
- پێگەی ناپاك لە کۆمەڵگادا.
- چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کەسی ناپاك و دیاردەی ناپاکی.
- جۆرەکانی ناپاکی و ناسینی کەسی ناپاك.

دوای چاوخشاندنێکی خێرا پێویستە سەرجەم ئەو یەکانە لە گرووپی پەیوەست بەیەکدا بکاتەوە لەگەڵ دانانی ناونیشان بۆ هەرگرووپێك ، وەك:

- تایبەتمەندیەکانی کەسی ناپاك کە بیرۆکەکانی ٦، ٣، ١ لەخۆ دەگرێت.
- ناپاك لە کۆمەڵگادا کە بیرۆکەکانی ٥، ٤، ٢ لەخۆ دەگرێت.

دوای دیاریکردنی ئامانجی لێکۆڵینەوەکە کە بریتیە لە ناسینی کەسایەتی تاکی ناپاك و تایبەتمەندیەکانی و ئەو کۆمەڵگایەی تیایدا دەژیت نوسەر دەست دەکات بە نووسینی پێشەکی وتارەکەی (مرۆڤی بێ مۆراڵ کۆمەڵێك سیفاتی لەخۆ گرتووە لەوانە ناپاکی کە سیفەتێکە پێیەوە دیارەو لە ناو کۆمەڵگاشدا بەو سیفەتە دەناسرێتەوە). دواتر نوسەر لە ناوەڕۆکدا هەوڵی خستنەڕووی بابەت و دەرەنجامی بابەتەکەی دەدات (تایبەتمەندیەکانی کەسی ناپاك، ناپاك لە کۆمەڵگادا). لە کۆتایشدا کورتەی دەنجامەکانی پێشکەش دەکات و بە تێرو تەسەلی دوا گفتوگۆ و لێکدانەوەیان بۆ دەکات(المقال وانواعه، منتديات غيوم الثقافية، www. ghyoom. net).

### ١. ٣. ٥- نووسینی وتار Essay writing

لەو قۆناغەدا نوسەر پێش ئەوەی دەست بە نووسین بکات پێوستی بە پێداچوونەوە بە چەند شتێکی گرنگ هەیە:

- دڵنیابوون لە دیاریکردنی بابەت و ئامانج و ناونیشانی بابەت و تێکەڵ نەکردنی لەگەڵ بابەتی تر. هەروەها کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی بابەت لە ڕێگەی خوێندنەوەی ئەو سەرچاوانەی پەیوەندیان بە بابەتەکەوەو هەیەو گەڕانەوە بۆ ڕای کەسانی شارەزاو بە ئەزموون لە بابەت و شێوازەکانی وتارنوسی.
- دیاریکردنی کاتی پێویست بۆ نووسینی وتار وهەوڵدان بۆ دەستەبەرکردنی سەرجەم کەرەستەو ئامرازەکانی پێویست بۆ نووسین و دابەشکردن و پۆلینکردنی زانیاریەکان بەسەر بەشەکان و لقە بەشەکاندا بە گوێرەی ئەو پلانەی کە دانراوە.
- دەست کردن بە نووسینی ڕەشنوسی یەکەم دواتر هەڵەچنی و پێداچوونەوە بە وتارەکە بە مەبەستی دڵنیابوون لە دروستی زانیاریەکان و ڕاستکردنەوەی هەڵەی ڕێنووسی و زمانەوانی و دانان و ڕیزبەندی کردنی ئەو سەرچاوەکان لە لیستی سەرچاوەکاندا

- دیاریکردنی کەرەستەو ئامرازەکان لە پاشکۆدا کە لەناو ناوەڕۆکی وتارەکەدا جێگەیان نابێتەوە(Comment écrire un essai ?,www. edilivre. com).

## ٢-ڕاپۆرت Report

ڕاپۆرت(Report)بریتیە لە خستنەڕوو و پێشکەشکردنی فەرمیانەی کۆمەڵێك زانیاری تایبەت دەربارەی بابەت یان گرفتێکی دیاریکراو بە شێوازێکی تێرو تەسەل و ئاسان چ بە شێوەی زارەکی یان نوسراو، ناوەڕۆکەکەشی ئەو زانیاریانەی لە خۆ گرتووە کە پێویستە پێشکەش بە لایەنی پەیوەندا بکرێت (فن إعداد التقارير وكتابتها، www. stop٥٥. com). یان بەڵگەنامەیەکی نوسراوە دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو بە ئامانجی گواستنەوەو گەیاندنی زانیاری و چەند ڕاسپاردەیەکی نوسەر بە لایەنی پەیوەندار. یاخود خستنەڕووی کۆمەڵێك زانیاری و ڕاستی پەیوەندارە بە بابەت یان کێشەیەکی دیاریکراو شیکرنەوەو ڕاڤەکردنی زانیاریەکان بە شێوازیکی ئاسان و هەڵهێنجانی دەرەنجامەکان و خستنە ڕووی چەند ڕاسپاردەیەکی گونجاو لە ژێر ڕۆشنایی ئەو دەرەنجامانە. هەندێ جار پێناسە دەکریت بەوەی وەسفێکی تێرو تەسەلی ئەو گفتوگۆیانەیە کە لە دانیشتنێکدا کراوە، یان کۆمەڵێك زانیاری و سەرنج و پێشنیارە دوای وردبینی و لێکۆڵینەوە لە بابەت یان گرفتێکی دیاریکراو.

ناوەڕۆکی ڕاپۆرت(Report)لە هەر بوارێکدا سێ بەش لەخۆ دەگرێت، ئەوانیش بریتین لە پێشەکی و ناوەڕۆك و کۆتایی لەگەڵ پاشکۆ و لیستی سەرچاوەکاندا. لە پێشەکیدا نوسەر ئامانجی ڕاپۆرتەکە و بەشەکانی دەخاتەڕوو، لە ناوەڕۆکدا ڕاڤەی تێرو تەسەلی بابەتی ڕاپۆرتەکە دەکات، لە کۆتایشدا ئەنجام و ڕاسپاردەکان دەخاتەڕوو. هەرچی بەشی پاشکۆیە لە کاتی پێویستدا بە مەبەستی هاوپێچ کردنی بەڵگەنامەو وێنەو گرافیك و خشتەی ڕوونکردنەوە دادەنرێت بە جۆرێك لەناو ناوەڕۆکدا جێگەیان نەبێتەوەو یارمەتی خوێنەر بدەن بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە ڕاپۆرتەکەدا. لە لیستی سەرچاوەکانیشدا بە شێوەی ڕیزبەندی ناو و زانیاری تەواو دەربارەی سەرجەم ئەوسەرچاوانەی لە نووسینی ڕاپۆرتەکەدا کەڵکیان لێ وەرگیراوە دەنوسرێت.

راپۆرت(Report) و جۆری راپۆرتەکان گرنگیەکی زۆریان لە ژیانی پیشەیی و بژێوی و کرداری مرۆڤدا هەیە، بە ئامرازیکی گرنگی پەیوندیکردن و سەرچاوەیەکی گرنگی زانیاری و چاودێری کردن و هاوکاری و پلان دانان دادەنرێت.

## ۲. ۱–جۆرەکانی راپۆرت The Types of Report

راپۆرت(Report)یەکێکە لەو بابەتانەی لە بوارگەلی جۆراوجۆردا بەکاردەهێنرێت، شێوەی بەکارهێنانیشی لە هەر بوارێکدا جیاوازە لە بوارەکانی تر، ئەمەش بۆتە هۆی جیاوازی نێوان راپۆرتەکان لە رووی شێوەو ناوەرۆك وکاتی دەرچوون و ئامانج و هێنانەدی پێوستیەکانی خوێنەر و سوود لێ وەرگرتنی. بەلاّم راپۆرتەکان بە شێوەیەکی گشتی لەسەر بنەمای کات و ئامانجی راپۆرتەوە پۆلێن دەکرێن. ئەمانەی خوارەوە گرنگترین جۆری راپۆرتەکانن:

### ۲. ۱. ۱– راپۆرتە خولیەکان Periodical Reports

راپۆرتەخولیەکان، راپۆرت گەلێکن لە چەند کاتێکی دیاریکراودا دەنوسرێن، نووسین و ئامادە کردنیشیان هەمیشە بەندە بە یاساکان و سیستمی کارکردنەوە. گرنگترین ئەو راپۆرتانەش بریتین لە راپۆرتی رۆژانەو راپۆرتی هەفتانەو راپۆرتی مانگانەو راپۆرتی وەرزی و راپۆرتی شەش مانگەو راپۆرتی سالاّنە. نووسین و دیاریکردنی کاتی دەرچوونیشیان دەکەوێتە ژێر کاریگەری چەندین فاکتەری وەك:

- ئاست و پلەی هەستەوەری بابەت و کاریگەری لەسەر هەندێ چالاکی.
- ئاستی پێویست بۆ گرتنەبەری رێ و شوێنی خێرا بە مەبەستی راستکردنەوە.
- نەگۆری پەیوەندی بابەتی راپۆرت بە بابەتەکانی تر کە پەیوەندیەکی خولی جێگیرەو لە توانای دامەزراوەدا نیە بیگۆرێت.
- ئارەزوو و پێداویستیەکانی بەرێوەبەرایەتی.
- یاساو رێساکان(فن إعداد التقارير وكتابتها، www. stop۵۵. com).

### ٢. ١. ٢- ڕاپۆرتی تایبەت Special Report

ڕاپۆرتە تایبەتەکان کاتی دیاریکراویان نیەو لە چەند کاتێکی جیاجیادا بەپێی پێویست دەنوسرێن. بۆ نموونە لەکاتی ڕوودانی ڕووداوێکی کتوپڕ لە ولآتدا، وەك هەرەس هێنانی ئابووری و کورتی هێنانی بۆجە، یان لە کاتی پەککەوتنی ئامێری کارگەیەك، یاخود ڕوودانی گرفتێکی کۆمەڵآیەتی گەورەی ناکاودا. ئەم ڕاپۆرتە زۆرجار بە ڕاپۆرتی ناکاو( Sudden Report) ناودەبرێت، چونکە پەیوەندی بەو کارە نائاساییانەوە کە بە دەگمەن ڕوو دەدەن و پێویستیان بە بەدواداچوون و چارەسەری دەست بە جێ و فەوری هەیە.

### ٢. ١. ٣- ڕاپۆرتی بەدواداچوون Follow-up reports

ئەم ڕاپۆرتە لە کاتێکدا دەنوسرێت کە بەدواداچوون بۆ کارێك یان بەرنامەیەك یان پرۆژەیەکی جێبەجێکراو بکرێت بە ئامانجی ڕاستکردنەوەو هەموارکردنەوەی پلانی بابەتی و دووبارە ڕێکخستنەوەو دابەشکردنەوەی کەرەستەو ئامرازەکانی کار. بۆ نموونە پرۆسەی بەراوردکردنی ئەنجامی پرۆژەیەك لەگەڵ ئامانجی بڕیار لەسەر دراو لە پلانی پێشوەختەی پرۆژەکە و ڕوونکردنەوەی لادان و شیکردنەوەو دیاری کردنی هۆکاری لادانەکان. دواتر خستنەڕووی جیاوازیەکان لە خشتەیەکی بەراوردکاری کە لە دوو خانە پێك هاتووە، خانەی یەکەم ئاستی ئێستا(Actual) نیشان دەدات و بە هێمای (A) دەنوسرێت و خانەی دووەم ئاستی پێشبینیکراو لە پلاندا(Planned) نیشان دەدات کە بە هێمای (P) دەنوسرێت.

### ١. ١. ٤- ڕاپۆرتی زانیاری Information Report

ڕاپۆرتی زانیاری زۆر جار بە ڕاپۆرتی هەواڵی(News Report)ی ناودەبرێت بە مەبەستی گواستنەوەی زانیاری دەربارەی ڕووداو یان هەڵوێستێکی دیاریکراو دەنوسرێت. ناوەڕۆکی ئەم ڕاپۆرتە ڕوانگەی ڕاپۆرت نوس لەخۆدەگرێت لەگەڵ جەخت کردنەوە لەسەر کۆمەڵێك ڕاستی و زانیاری دروست دەربارەی پرۆژە یان ڕووداوێك بە ئامانجی وەرگرتنی بڕیاری پێویست دەربارەی پرۆژەکە. بۆ نموونەی پێشکەشکردنی ڕاپۆرتی زانیاری ناوەندێکی توێژینەوە بە لایەنی بەرپرس بە مەبەستی ئاگادارکردنەوەیان لە دەرنجامی کۆمەڵێك توێژینەوەی پەیوەندار بە بوارێکی دیاریکراو.

### ۲. ۱. ٥- ڕاپۆرتی توێژینەوە Research Report

ئەم ڕاپۆرتانە، بریتین لە ڕاپۆرتی ئەو توێژینەوانەی لە ناوخۆی دامەزراوەیەك یان دەرەوەی دامەزراوەکە ئەنجام دەدرێن، لە زۆربەی کاتدا لە لایەن چەند کەسێکی بەرپرس لە دەزگاکە دەنوسرێن و هەندی جاریش لە لایەن کەسانێکی پسپۆر لە دەرەوەی دامەزراوەکە دەنوسرێن. ئامانج لە نووسینی ڕاپۆرتی لێکۆڵینەوە گەرانە بە دوای هۆکارەکانی گرفتێکی دیاریکراو و دەست نیشانکردنی چارەسەری گونجاو پێویستە بۆ گرفتەکە، بۆیە ناوەڕۆکی ئەم ڕاپۆرتانە پێك هاتووەو لە پێشنیار و ڕاسپاردەو خستنەڕووی ئەلتەرناتیفی گونجاو کە پێویستیان بە وەلأمدانەوەی لایەنی بەرپرس و وەرگرتنی بڕیاری پێویست هەیە.

### ۲. ۱. ٦- ڕاپۆرتی هەڵسەنگاندن Performance control reports

ڕاپۆرتی هەلسەنگاندن ڕاپۆرتێکە تیایدا هەڵسەنگاندنی تاك و ئاستی کرداری و کارگێڕی دام و دەزگاکان پێشکەش بە لایەنی پەیوەندار دەکرێت، ئەم هەڵسەنگاندنەش بە پێی چەند پێوەرێکی پێشوەختەی بڕیار لەسەردراو ئەنجام دەدرێت بە ئامانجی زانینی ئاستی کارامەیی و لێهاتوویی تاك و ئاستی بەڕێوەبردن و جێبەجێ کردنی دەزگایەك و وەرگرتنی بڕیاری پێویست دەربارەیان. بۆیە لە نووسینی ئەم شێوە ڕاپۆرتەدا هەمیشە ڕەچاوی چەند بنەمایەك دەکرێت، وەك دیاریکردنی شێوازی پێوانەو هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنی ئاستی کرداری و جێبەجێ کردنی تاك و دامەزراوە بە پێوەرە لۆژیکیەکانی کار (فن إعداد التقارير وكتابتها، www. stopoo. com).

### ۲. ۱. ۷- ڕاپۆرتی دارایی و کارگێڕی Financial and administrative reports

ڕاپۆرتە دارایی و کارگێڕیەکان ئەو ڕاپۆرتانەن کە لە بواری دارایی و کارگێری و کێشەو گرفتە کارگێڕی و داراییەکان پێشکەش بە لایەنی بەرپەرس دەکرێن. ناوەڕۆکی ڕاپۆرتە داراییەکان زانیاری دارایی و ژمێرەیی و بە پشت بەستن بە شیکردنەوەو بەراوردکاری لەگەڵ کاتەکانی پێشووتر لەخۆ دەگرێت. ئەم ڕاپۆرتانەش هەمیشە ڕاپۆرتی خولین و لە لایەن کەسانی ناو دامەزراوە داراییەکان ئەنجام دەدرێن و هەندێ جاریش لە لایەن چاودێری دارایی دەرەکیەوە دەنوسرین و پێشکەش بە دامەزراوە داراییەکە دەکرێت. بەلام ڕاپۆرتی کارگێریەکان جیاوازن لە

ڕاپۆرتی دارایی و کۆمەلیك زانیاری لەخۆدەگرن کە پەیوەستە بە بەڕێوەچوونی کارو چالاکی بەڕێوەبەرێتیە جیاجیاکان و پرۆسەکانی چاودێریکردن و پلان دانان.

### ٢. ١. ٨- ڕاپۆرتی وەسفی Descriptive report

ڕاپۆرتی وەسفی لە چەند برگەیەکی وەسفی پێك هاتووەو بە شێوازێکی وەسفیانەی چیرۆك ئامێز نوسراوەو لە چەندین بواری جۆراوجۆردا بەکاردەهێنرێت. گرنگترین جۆرییشیان ئەم ڕاپۆرتانەن کە لە بواری مارکیتینگ و خواست و خستنەڕووی شت و مەك و ئاراستەی کڕیار و بەکاربەرانەوە دەنوسرێن.

### ٢. ١. ٩- ڕاپۆرتی دیزایینی Design Report

ڕاپۆرتی دیزایینی پێك هاتووە لە ڕاپۆرتێکی دیزاین کراوی ئامادەکراو بە شێوەیك نوسەری ڕاپۆرتەکە تەنها شوێنی زانیاریەکان پڕ دەکاتەوە بە بێ لێدوان و پێشکەشکردنی ڕاو سەرنجی خۆی دەربارەی بابەتەکە. گرنگترین جۆری نموونەی ئەو ڕاپۆرتانەش ڕاپۆرتی جانتا ون بووەکانە لە کاتی گەشتی ئاسمانیدا.

### ٢. ١. ١٠- ڕاپۆرتی کەسی Personal Report

ڕاپۆرتی کەسی کۆمەڵێك زانیاری گشتی دەربارەی تاکەکەس و ژیانی کەسی و پیشەیی و ڕەفتاری کەسەکە و چالاکی و بەرهەمهێنانی لە ماوەیەکی دیاریکراودا لەخۆ دەگرێت. لە گرنگترین جۆری ئەو ڕاپۆرتانەش ڕاپۆرتی هەڵسەنگاندنی ساڵانەی تاکەکەسە.

### ٢. ١. ١١-ڕاپۆرتی شیکاری Analytical Report

ڕاپۆرتی شیکاری ڕاپۆرتێکە تایبەت بە خستنەڕوو و پێشکەشکردنی کۆمەڵێك زانیاری و شیکردنەوەی ئەو زانیاریانە بۆ گەیشتن بە چەند ئامانجێکی دیاریکراو. ڕاپۆرت نوس لە وشیوە ڕاپۆرتەدا دەتوانێت شیکردنەوە بۆ ڕاستی و ڕووداوەکان و واتای ڕاستی و ڕووداوەکان بکات کە ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکەیان پێك هیناوە(ماهر، ٢٠١٤).

### ٢. ١. ١٢– راپۆرتی دەرەكی و ناوەكی Internal and external reports

راپۆرتە دەرەكی وناوەكیەكان لەسەرجەم بوارە جۆربەجۆرەكانی كارو چالاكیدا بەكار دەهێنرێن. راپۆرتە دەركیەكان ئەو راپۆرتانەن كە ئاراستەی لایەنی دەرەوەی دامەزراوەیەك دەكرێت، وەك راپۆرتەكانی پەرەسەندنی كرێ و بەرهەمهێنان و ئاخنین و هەندێ راپۆرتی دارایی. بەلاَم راپۆرتە ناوەكیەكان راپۆرتگەلێكن ئاراستەی لایەنی ناوخۆی دامەزراوەیەك دەكرێن، وەك راپۆرتەكانی چاودێریكردنی بەرهەم.

### ٢. ١. ١٣–راپۆرتی فەرمی و راپۆرتی نافەرمی Formal and informal Reports

راپۆرتی فەرمی راپۆرتێكە كە لە ئامادەكردنیدا شێوەو فۆرمێكی فەرمیانەی بەخۆوە گرتووە، لە زۆربەی كاتدا شێوەكەی جێگیرەو پێكهاتووە لە پێشەكی و قەبارەی راپۆرت وپێشنیارەكان، هەمیشە راپۆرت نوس لە نووسینیدا پەنا دەباتە بەر بەكارهێنانی وشەو چەمك و زاراوەی فەرمی لە بواری كارەكەیدا. بەلاَم راپۆرتی نافەرمی راپۆرتێكە شێوەو فۆرمێكی فەرمیانەی بەخۆووە نەگرتووەو بە زمانێكی گشتی و سادەو ساكار و دوور لە بەكارهێنانی چەمك و زاراوەی فەرمی نوسراوە(ماهر، ٢٠١٤).

### ٢. ١. ١٤–راپۆرتی ئەكادیمی Academic report

راپۆرتی ئەكادیمی(Academic report) جۆرێكە لە راپۆرت پەیوەستە بە توێژینەوەو توێژینەوەكاری لە بواری ئەكادیمیداو بە پێی پیویست دەنوسرێت، هەندێ جار لە لایەن نوسەرو توێژەرانی ئەكادیمی بە مەبەستی ئەنجامدانی توێژینەوە یان ئەركێكی زانستی و ئەكادیمی ئاراستەی ناوەندێكی ئەكادیمی دەكرێت و هەندێ جاری تر بە پێچەوانەوە لە لایەن ناوەندە زانستی و ئەكادیمیەكانەوە پێشكەش بە تویژەرو لێكۆلەرانی ئەكادیمی دەكرێت.

## ٢. ٢-سوود و گرنگیەکانی ڕاپۆرت The benefits of reports

ڕاپۆرت(Report) بە یەکێك لە ئامرازە هەرە گرنگەکانی کار و پەیوەندی کردن دادەنرێت لە سەرجەم بوارەکانی ژیاندا، لە زۆربەی کاتدا ئامانج لە نووسیندا بریتیە لە:

٢. ٢. ١ -ئاسانکاری بۆ پرۆسەی پەیوەندیکردن و چاودێریکردن لە نێوان بەشە جیاجیاکانی دەزگاو دامەزراوەو ناوەندە کارێگێری و زانستیەکان بە مەبەستی تەواو کردنی کارو پرۆژەیکان وچۆنیەتی ئەنجامادانیان وسەرکەوتن و لادانی ئەو کۆسپ و تەگەرانەی دێنە بەردەم کارەکانیان.

٢. ٢. ٢-دروستکردنی پەیوەندی و هاوکاری بۆ بڕیاردان لەسەر پرۆژەکان لە ڕێگەی کۆکردنەوەو خستنە ڕووی زانیاری پێوست.

٢. ٢. ٣-گەیاندنی زانیاری پێوست بە دامەزراوەیەك بە مەبەستی هێنانەدی ویست و ئامانجی دامەزراوەکە.

٢. ٢. ٤-بەشداری کردن لە پرۆسەی پلاندانان لە ڕێگەی کۆکردنەوەی داتاو زانیاری پێوست بۆ دارشتنی پلان.

٢. ٢. ٥-چاودێریکردن و پێداچوونەوە بە کارەکانی دامەزراوەیەك یان پرۆژەیەکی دیاریکراو.

٢. ٢. ٦-خستنەڕووی دەرەنجامی لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو و هەوڵدان بۆ سوود وەرگرتنی جەماوەری خوێنەر لە خوێندنەوەی.

٢. ٢. ٧-ئاگادارکردنەوەو ئاشناکردنی کەسانی تر بە گرفتێك لە گرفتەکان و هەولدان بۆ دنەدان و جولاندنی ڕەفتاریان و ئاراستەکردنیان بەرەو گرفتەکە.

## ٢. ٣-تایبەتمەندییەکانی ڕاپۆرتی ئەکادیمی Characteristics of the academic report

ڕاپۆرتی ئەکادیمی وەك هەر بابەتێکی دیکەی نووسینی ئەکادیمی چەند تایبەتمەندییەکی لەخۆگرتووە کە لە ڕاپۆرتی ئاساییدا بوونی نیە، ئەمەش بۆتە هۆی جیاوازی ڕاپۆرتی ئەکادیمی لەگەڵ ڕاپۆرتی ئاسایی، وەك:

### ٢. ٣. ١- ڕۆشنی ئامانجەکان Clarity of objectives

ڕۆشنی ئامانجەکان و خستنەڕووی ڕاپۆرتەکەیە بە ڕوونی وردی لە ڕێگەی هەڵبژاردنی دەستەواژەی گونجاو و ئاسان و دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی دەستەواژەی لێڵ و گران بە لەبەرچاوگرتنی ئاستی خوێنەری ڕاپۆرتەکە، هەروەها وردبینی لە کۆکردنەوەی زانیاری پەیوەندار بە بابەتەکە پشت بەستن بە سەرچاوەی باوەڕدار و بەکارهێنان بە شیوازیکی ئەکادیمیانە.

### ٢. ٣. ٢-ڕاستگۆیی لە نووسیندا Honesty in writing

لە ڕاپۆرتی ئەکادیمیدا نوسەر پابەندە بە چەند پرانسیپیکەوە، وەك ڕاستگۆیی لە نووسین و خستنەڕووی زانیاریەکان وپشت بەستن بە سەرچاوەی باوەڕدار بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ڕاکانی و بابەتی بوون و دوورکەوتنەوە لە لایەنگیری وتێکەڵ نەکردنی کێشەو پەیوەندیە کەسیەکانی وەك هاوڕێیەتی و بەرژەوەندی و سۆزداری و ئیرەیی بردن لە نووسین. هەروەها دوورکەوتنەوە لە مەیل و سۆزداری و لایەنگیری نەکردن لە خستنەڕووی ڕاستیەکان و ئەو زانیاریانەی پەیوەندیان بە بابەت ودەرەنجامی بابەت و ڕاسپاردەکانەوە هەیە.

### ٢. ٣. ٤- لۆژیکی لە نووسیندا Logical writing

شێوازی نووسین لە ڕاپۆرتی ئەکادیمیدا شێوازێکی لۆژیکیانەی ڕێکخراوە، وەك خستنە ڕووی بابەتەکان یەك بە دوای یەك لە ئاسانەوە بۆ گران و ڕێکخستنی کات و خستنە ڕووی ڕووداوەکان بەدوای یەك لە ڕووی کات و ڕێکخستنی شوێن و خستنەڕووی بەدوای یەکی ڕووداوەکان لە ڕووی شوێنەوە.

هەروەها یەکێکی تر لە تایبەتمەندیە گرنگەکانی ڕاپۆرتی تەواو ڕەچاوکردنی کورتبڕی و درێژبڕیە لە نووسیندا. کورتبڕی بە مانای دوورکەوتنەوە لە دووبارەکردنەوەی دەستەواژەو زانیاریەکان بە شێوەیەك خوێنەر بێزار بکات و واز لە خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکە بهێنێت، درێژبڕیش بەو مانایە ڕاپۆرتەکە بە ئەندازەیەك کورت نەبێت زیان بە ناوەڕۆك و هەندێ لایەنی بابەتەکە بگەیەنێت کە پێویستیان بە ڕوونکردنەوەی تەواو هەیە.

## ٣-كورتە نامەی زانستی Summary paper

کورتە نامەی زانستی یەکێکە لە ئامرازە گرنگەکانی پەیوەندی کردنی مرۆڤەکان بە یەکتر لە کارو پیشەدا، لە زمانی کوردیدا لەبەرامبەر وشەی (Summary paper) ی ئینگلیزی و (Sommaire) یان (Papiers de réaction) ی فەرەنسی و (ملخص) ی عەرەبی بەکار دەهێنرێت. کورتەی بابەتێکە دەربارەی کارێك یان پرۆژەیەکی دیاریکراو کە بە مەبەستێك لە مەبەستەکان پێشکەش بە لایەنی پەیوەندار بە پرۆژەکە دەکرێت. بە زۆر شێواز و لە زۆر بواری جۆراوجۆردا بەکار دەهێنرێت، وەك بەڵگەنامەی دادگایی و بازرگانی و پیشەسازی و چالاکی هونەری و زانستی و رۆشنبیری. لە بواری ئەکادیمیدا کورتەی زانیاری ناو کتێب یان توێژینەوەیەکی زانستیە کەسی نوسەر یان توێژەر بە مەبەستی گەیاندنی کۆی زانیاریەکانی ناو ناوەڕۆکی بابەتەکە پێشکەش بە خوێنەر یان ناوەندێکی توێژینەوەی زانستی دەکات.

کورتە نامەی زانستی(Summary paper) لە پێناسەیەکی کورتدا بریتیە لە وێنەی کورتی دەقێکی درێژ، یان پوختەیەکە دەربارەی کۆی بەشە گرنگەکانی دەقی ئەسڵی کە بەکورتی و پوختی دەخرێتە ڕوو. ( کیف تلخص، www. forum. ramsat. net)

کورتە نامەی زانستی(Summary paper) وەسفێکی وردی دەقە بە مەبەستی چڕکردنەوەو کورتکردنەوەی زانیاریەکان لە ڕێگای جەخت کردنە سەر گرنگترین بیرۆکەکانی ناو ناوەڕۆکی دەق چ پەرتووك یان توێژینەوە یان وتار کە توێژەر بۆ مەبەستێك لە مەبەستەکان پێشکەش بە لایەنی پەیوەندار یان جەماوەری خوێنەری دەکات (Tucker,٢٠١٧). بە گوێرەی ئەو ڕێ و شوێنانەی لە نووسینیدا دەگیرێتەبەر نووسینی کورتە نامە کارێکی ئاسان نیە، هونەرێکە خۆی لە وەرگرتن و چڕکردنەوەی زۆرترین زانیاریەکانی دەق و کورت کردنەوەو خستەڕوویان لە بۆشاییەکی بچووکدا دەنوێنێت، بۆیە پێویستی بە پەیڕەو کردنی کۆمەڵێك هەنگاوی گرنگ هەیە وەك جەخت کردن لەسەر بیرۆکە سەرەکیەکانی دەق لەسەرەتادا و بەدواداچوون و بەکارهێنانی نەخشەی هزری و وەرگرتنی تێبینی دەربارەی خاڵە گرنگەکانی پەیوەست بە بیرۆکە سەرەکیەکە جگە لە بەکارهێنانی زمانێکی ئاسان و پاراو کە خوێنەر بە باشی لێ ی تێ بگات (كيف تكتب ملخص او خلاصة البحث، www. minshawi. com) .

## ٣. ١–هەنگاوەکانی نووسینی کورتە نامەی زانستی The steps of summary paper writing

بە شێوەیەکی گشتی نووسینی کورتە نامە پێویستی بە سێ هەنگاوی سەرەکی هەیە :

### ٣. ١. ١ –پێداچوونەوە بە دەقی ئەسڵی Review original text

نوسەر لە دەستپێکی کارەکەدا پێویستی بە خوێندنەوەی قوڵ و پێداچوونەوە بە دەق هەیە، بۆ ئەم مەبەستە چەند ڕێ وشوێنێك دەگرێتە بەر:

- خوێندنەوەی دەقە ئەسڵیەکە بە وردی بە بێ وەرگرتنی هیچ جۆرە ئاماژەیەك، واتە نوسەر زیاتر لە یەك جار پێویستی بە خوێندنەوەی ڕستە یان برگەیەك هەیەو پێویستی بە دووبارەو چەند بارە خوێندنەوەی دەقەکە هەیە بۆ ئەوەی زیاتر و باشتر لە بابەتەکە تێ بگات.

- جەخت کردن لەسەر ناونیشان و خاڵی سەرەکی بابەت و خاڵەکانی دەرچوون لە بابەتدا. هەروەها دووبارە خوێندنەوەی دەق بە مەبەستی تۆمارکردنی تێبینی دەربارەی خاڵە سەرەکیەکانی دەق و تیگەیشتنی زیاتر لە چەمك و دەستەواژەکان و پەیوەندیان بە یەکەوە.

- دوورکەوتنەوە لە دووبارە نووسینەوەو تۆمارکردنی ڕووداوەکانی ناو دەق و جەخت کردن لەسەر ئەو بەڵگانەی خاوەنی دەق بۆ پاڵپشتی خاڵە سەرەکیەکانی بابەت بەکاری هێناون.

### ٢. ١. ٢ –ڕەشنووسی یەکەم The first draft of the summary

دوای پێداچوونەوە بە دەقی نوسراو و تۆمارکردنی تێبینیەکان گرنگە نوسەر پەیڕەوی ئەم خالآنە بکات:

- پێویستە دەسپێکی نووسینی بە تۆمارکردنی ناوی دانەر و ناونیشانی بابەتەوە دەست پیٚ بکات بۆ ئەوەی خوێنەر بزانیت ئەوەی کورت کراوەتەوە هی فلآن کەس یان کەسی ترە.
- پێویستە وشەو دەستەواژەو گوزارشتی تایبەت بە خۆی بەکار بهێنێت نەك تەنها پشت بە وەرگرتن و کۆپی کردنی زانیارەکانی دەقی ئەسلی ببەستێت. بەکارهینانی وشەو گوزارشتەکانی دانەر خوێنەر دووچاری مەلەل و ماندووبوون دەکات و هەست دەکات ئەو وشەو دەستەواژانە هی دانەری دەقە ئەسڵیەکەن نەك نوسەر، لە هەمان کاتدا جۆرێکیشە لە ناپاکی ئەکادیمی.
- پێویستە نوسەر بزانێت ئەوەی دەینوسێت تەنها کورتکردنەوەی بابەتی کەسێکی ترە، بۆیە نابێت ڕاو سەرنجی تایبەتی خۆی تێکەڵ بە بابەتەکە بکات.
- پێویستە نوسەر لە ڕووی دارشتنەوە دەستەواژەی گونجاو بەکار بهێنێت. بۆ نموونە بەکارهێنانی دەستەواژەی وەك :توێژەر داوا دەکات، یان توێژەر تاوتویٚ دەکات، بەمەش یارمەتی خوێنەر دەدات و بزانێت پوختەکە کوتکراوەی بابەتی توێژەرێکی ترە.

### ٢. ١. ٣ –پێداچوونەوە بە ڕەشنووسی یەکەم Review the first draft of the summary

دوای ڕەشنووسی یەکەم پێویستە نوسەر پێداچوونەوە بە پوختەکەدا بکات بۆ ئەوەی پاکنووسی بکات و هەڵەو خەوشی تیا نەهێلێت، بۆ ئەم مەبەستە دەشێت ئەم هەنگاوانە هەلگرێت:

- پێداچوونەوە بە پلانی نووسینی پوختەکە و بەراوردکردنی لەگەڵ تێبینی تۆمارکراو بە مەبەستی دەستکەوتنی هەر جۆرە زانیارییەکی تر و خستەڕوویان لە ڕەشنووسی دووەمدا.

- سەرنجدان لە دووبارەبوونەوەی زانیاریەکان. بۆ نموونە لە هەندێ توێژینەوە یان کتێبدا نوسەر وەك ئامرازێك بۆ پاڵپشتی خاڵی سەرەکی بابەتەکەی چەندین جار جەخت لەسەر خاڵێك دەکات و دووبارەی دەکاتەوە. بەڵام لە نووسینی پوختەدا پێویست بە دووبارە ئاماژەکردن بە هیچ زانیاری و خاڵێك ناکات ئەگەر دانەری دەقە ئەسڵیەکەش ئاماژەیانی پێ کردبێت.
- جەخت کردن لەسەر پەیوەندی نێوان برگەکان بە یەکتر و گەڕانەوە بۆ خاڵی سەرەکی، چونکە جەخت کردن لەسەر سەرجەم خاڵە سەرەکیەکان بۆ خوارەوە سەرنج لەسەر پەیوەندی و چۆنیەتی گونجانی برگەکان لە پوختەکەدا دوور دەخاتەوە.

- پێداچوونەوە بە هەڵەی زمانەوانی و ڕێنووسی و نیشانەکانی خاڵبەندی. هەروەها پێداچوونەوە لە ڕووی کورتی و درێژیەوە، چونکە درێژی پوختە نابێت لە چارەگی درێژی دەق تێپەڕ بکات. بۆ نموونە ئەگەر ژمارەی لاپەڕەکانی دەقی ئەسڵی چوار لاپەڕە بێت پێویستە پوختەکە بە یەك لاپەڕە یان کەمتر بنوسرێت.

- خوێندنەوەی پوختەکە لە لایەن کەسێکی شارەزاو پسپۆر لە بواری نووسیندا بە مەبەستی دڵنیا بوون و بڕیاردانی کۆتایی(Peterman,٢٠١٧).

## ٤-کورته توێژینەوە Mini-research Paper

کورته توێژینەوە(Mini-research Paper) بریتیە له هەوڵێکی زانستیانەو ڕەخنەرگرانە لە توێژینەوەیەکی کورتدا بۆ لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن و نرخاندنی بابەتێکی دیاریکراو بە ئامانجی دەسکەوتنی زانیاری و ڕاسپاردەو پێشنیاری تازەو نوێ دەربارەی بابەتەکە. لە زمانی ئینگلیزی بە (Mini-research Paper) و لە زمانی فەرەنسی بە مینی میموار( Mini mémoire) و لە زمانی عەرەبیشدا بە(بحوث مصغرة) ناودەبرێت هەرچەند ئەزموونی عەرەبی لەو بوارەدا کەم و لاوازە. ناوەڕۆکی کورته توێژینەوە هەمان ڕێ و شوێنی توێژینەوەی درێژ لەخۆدەگرێت، بەڵام لە زۆربەی کاتدا تەرخان کراوە بۆ لێکۆڵینەوە لە چەند توێژینەوەیەکی لەمەوپێش دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو بە مەبەستی هەڵسەنگاندنیان و دەرخستنی خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان و بەراوردکردنی دەرەنجامەکانیان بە یەکتر.

کورته توێژینەوە(Mini-research Paper) بە گرنگترین ئامرازی فێرکردن و هەڵسەنگاندن دادەنرێت لە زۆربەی زانکۆ پێشکەوتووەکانی جیهاندا تیایدا داوا لە فێرخوازانی خوێندنی باڵا دەکرێت لە توێژینەوەیەکی کورتی چەند لاپەڕەییدا لێکۆڵینەوە لە چەند توێژینەوەیەکی پەیوەندار بە بوارێکی دیاریکراو بکەن. لە ڕێگەی بەکارهێنان و پەیڕەوکردنی یاسا بنەڕەتیەکانی توێژینەوە ژمارەیەك سەرچاوە بۆ تاقیکردنەوەو هەڵسنەگاندنی ئاستی زانستی فێرخوازەکان بەکاردەهێنرێت لەسەر کۆکردنەوەی زانیاری و دروست بوونی بیرۆکەی تازەو توانستی ڕاڤەکردن و شیتەڵکاری و شێوازی نووسین و جێبەجێ کردنی بنەماکانی توێژینەوە بە دروستی، یەکێك لە دیارترین تایبەتمەندیەکانیشی کورتی و کەمی لاپەڕەکەنیەتی کە ژمارەیان لە ٨ بۆ ٢٠ لاپەڕە تێپەڕ ناکات.

کورتەتوێژینەوە(Mini-research Paper) چەند تایبەتمەندیەکی لەخۆگرتووە بە هۆیانەوە لە ئامرازە هاوشێوەکانی جیابۆتەوە، ئامرازێکی زانستیە لە ڕێگەیەوە چارەسەری گرفتێك لە ڕێگەی دۆزینەوە سەرەداوی گرفتەکە دەکرێت، لە هەمان کاتدا پێوەرێکە بۆ هەڵسەنگاندن لە ڕێگەیەوە ئاستی زانستی و لێهاتووی فیرخوازان لە توێژینەوەکاریدا هەڵدەسەنگێنرێت و لە زۆربەی زانکۆو ناوەندەزانستی و فێرکاریەکانیشدا پشتی پێ دەبەسترێت.

## ٤. ١–سوود وگرنگیەکانی کورتە توێژینەوە The Benefits of Mini- Research paper

ئامانج لە ئەنجامدانی کورتە توێژینەوە وەك ئەرکێکی زانکۆیی لە لایەن فێرخوازان، فێرکردن و ڕاهێنانیانە لەسەر بنەماکانی نووسین و یارمەتیدانیانە بۆ گەڕان و ئاشنا بوون بە سەرچاوەی تازەو ئەنجامدانی توێژینەوەی درێژ لە داهاتوودا. گرنگترین سوودەکانیشی بریتین لە:

٤. ١. ١–ئاشناکردنی فێرخوازان بە بنەکانی نووسینی توێژینەوەی زانستی و ڕاهێنان لەسەر جیّ بەجیّ کردنیان.

٤. ١. ٢–ڕاهێنان و مەشق پێکردنی فێرخوازان بۆ باشترکردنی شێوازی نووسین و گەڕان بە دوای سەرچاوەو چۆنیەتی هەڵبژاردن و بەکارهێنانیان.

٤. ١. ٣–ڕاهێنانی فێرخوازان لەسەر خوێندنەوەو بەکارهێنانی کتێب و کتێبخانەو سوود وەرگرتن لە سایتە ئەلکترۆنەیەکان و کەناڵە زانستیەکانی تر. هەروەها ڕاهێنانانیان لەسەر خوێندنەوەو تێگەیشتن لە بابەت و هەڵهێنجانی بیرۆکە لە کۆمەڵێك دەقدا، دواتر نووسین و ئامادەکردنی کورتەیەك دەربارەی ئەو شتانەی کە دەیانخوێننەوە.

٤. ١. ٤–ڕاهێنانی فێرخوازان لەسەر پابەند بوون بە کۆمەڵێك بنەمای پەیوەست بە پاراستنی ئەمانەتی زانستی لە ڕێگەی تۆمارکردنی زانیاریەکانەوە.

٤. ١. ٥–ڕاهێنانی فێرخوازان لەسەر بەرزکردنەوەی توانستی ڕاڤەکاری و شیکاری و بەراوردکاری زانیاریەکان و بەکارهێنانی بەڵگەو سەلماندن.

٤. ١. ٦–ڕاهێنانی فێرخوازان لەسەر چۆنیەتی پلاندانان و دابەشکردنی کات و سوود لیّ وەرگرتنی.

٤. ١. ٧–ئاراستەکردن و ڕاهێنانی فێرخوازان لەسەر توێژینەوەو گەڕان بە دوای کێشەو گرفتەکان و دۆزینەوەو دەرخستنی هۆکارەکانی پشت ڕوودانیان و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنیان.

## ٤. ٢–هەنگاوەکانی نووسینی کورتە توێژینەوە Steps to write mini - research paper

بۆ ئەنجامدان و نووسینی کورتە توێژینەوە چەند مەرجێك پێویستە، لە سەرتادا پێوستە توێژەر بزانێت ئەوەی ئەنجامی کورتە توێژینەوەیە نەك توێژینەوەی درێژ، بۆیە دەبێت ڕەچاوی ئەوە بکات ژمارەی لاپەڕەکانی لە ٨ بۆ ٢٠ لاپەڕە تێپەڕ نەکات و لە کاتی پێویستدا نەبێت هیچ جۆرە ڕەنگاریەکی تێدا بەکار نەهێنێت. وەك هەمیشە بە فۆنتی(New Times Roman) نوسرابێت لە کاتی نووسین بە زمانی ئینگلیزی و قەبارەی پیتەکانی(١٢) بێت، بە فۆنتی(Arial) نوسرابێت کاتیك توێژینەوەکە بە زمانی عەرەبی و قەبارەی پیتەکانی(١٢)بێت، بەڵام کاتێك توێژینەوەکە بە زمانی کوردی بوو پێویستە بە فۆنتی یونی کورد گۆران (Unikurd Goran) یان ئەلیکەی سەحیفە(Ali_K_Sahifa) نوسرابێت و قەبارەی پیتەکانیشی(١٤) بێت. لە کاتی نووسین بە هەر زمان و ڕێنوسێکیش پێوستە نێوان دێرەکان(١.٥) بێت. ناوەڕۆکی کورتە توێژینەوەکە هەرسێ بەشی پێشەکی و ناوەڕۆك و کۆتایی لەخۆ گرتبێت . دواتر توێژەر هەنگاوە کرداریەکان دەگرێتە بەر کە بریتین لە:

### ٤. ٢. ١– هەڵبژاردنی بابەت Topic Selection

توێژەر لە دەسپێکی کارەکەدا دەست نیشانی بوار و بابەتی لیکۆڵینەوەکەی دەکات، ئینجا خوێندنەوەی ورد بۆ سێ تار چوار توێژینەوەی پەیوەندار بە بابەتەکە دەکات، لە ناوەڕۆکی توێژینەوەکاندا چ شتێك سەرنجی ڕادەکێشێت دەیکات بە بابەتی لێکۆڵینەوەکەی و کاری لەسەر دەکات، ئەم توێژینەوانە سەرچاوەی بنەڕەتی کورتە توێژینەوەکەن و بۆ دەوڵەمەند کردنی بابەتەکە و پشت ڕاستکردنەوەی ڕاکانی دەتوانێت سەرچاوەی تر بەکار بهێنێت.

### ٤. ٢. ٢– دیاریکردنی ناونیشان Title Selection

دوای خوێندندنەوەی توێژینەوەکان و قوڵ بوونەوە لە بابەتەکە، توێژەر ناونیشانێك بۆ کورتە توێژینەوەکە دادەنێت، ناونیشانێك کورت و پوخت بێ و گرفتی توێژینەوەکە بخاتە ڕوو بە ئامانجی بە دەست هێنانی زۆرترین زانیاری لەسەر لایەنە گرنگەکانی بابەتەکە بە جۆرێك هەموو ئەو یەکانە لەخۆ بگرێت کە بابەتەکە بە یەکەوەوە دەبەستێتەوە.

## ٤. ٢. ٣- ناوەڕۆك Body

ناوەڕۆکی کورتە توێژینەوە(Mini-research Paper) پێك دێت لە پێشەکی و چوارچێوەی تیۆری و کۆتایی یان گفتوگۆ و ئەنجام. پێشەکی کورتە توێژینەوە هەمیشە بە یەك تا دوو لاپەڕە دەنوسرێت تیایدا توێژەر بابەتەکە دەخاتەڕوو و هەوڵ دەدات لە ڕوانگەی جیاجیاوە بە چەند پێناسەیەك بیناسێنێت، ئینجا گرنگی بابەتەکەو ئامانج لە ئەنجامدانی ڕوون دەکاتەوە. لە پێشەکیدا توێژەر بابەتە سەرکیەکانی کورتە توێژینەوەکەی ناخاتەڕوو، بەڵکو هەوڵ دەدات گرنگی توێژینەوەکەی دەربخات و ڕوونی بکاتەوە کە چ گرنگیەکی بۆ کۆمەڵگا هەیە، پاشان ڕاڤەی بابەتەکە دەکات و پرسیارە سەرکیەکانی گرفتەکی توێژینەوەکە دەخاتەڕوو.

چوارچێوەی تیۆری کورتە توێژینەوە(Mini-research Paper) دابەش دەبێت بەسەر چەند بەشی سەرەکی و هەر بەشێکیش لقی لاوەکی لێ دەبێتەوە، دەشێت پێك هاتبێت لە دوو بەش یان سێ بەش بە گوێرەی پێوستی لێکۆڵینەوە لە بابەتەکە. لە بەشی یەکەمدا توێژەر هەوڵ دەدات لێکدانەوە بۆ چەند بابەتێکی پەیوەندار بە هەر چوار توێژینەوەکە بکات کە بۆ لێکۆڵینەوە بەکاری هیناون، لەبەشی دووەمدا چەند لایەنێکی دیکەی پەیوەندار بە بابەتەکە تاوتوێ دەکات، لە بەشی سێیەمیشدا خاڵە هاوبەش و جیاوازەکان لێك دەداتەوە. لەگەل چوار سەرچاوە بنەڕەتیەکە توێژەر دەتوانێت بۆ دەوڵەمەندکردنی بابەتەکە و پشت ڕاستکردنەوەی بیرو بۆچوونەکانی سەرچاوەی تر بەکار بهێنێت، بەڵام بەکارهێنانی هەر سەرچاوەیەك یان ناوهێنان و سوود وەرگرتن لە بیرۆکەی هەر نوسەرێك لەناو دەقدا پێوستی بە ئاماژەکردنی تەواو بە سەرچاوەکە هەیە چ لە ناو ناوەڕۆك و چ لە لیستی سەرچاوەکاندا.

## ٤. ٢. ٤- گفتوگۆ و ئەنجام Discussion

گفتوگۆ و ئەنجام(Discussion) لە کۆتایی کورتە توێژینەوە(Mini-research Paper) هەمیشە بە یەك بۆ دوو لاپەڕە دەنوسرێت تیایدا توێژەر ئەنجامەکانی توێژینەوەکەی لێك دەداتەوە، سەرەتا بە پێشەکیەکی کورت دەربارەی گرفتی توێژینەوەکە دەست پی دەکات ئینجا کورتەی دەرەنجامەکان دەخاتەڕوو، دواتر هەوڵ دەدات بە چەند دێرێك ئاماژە بە هاوجووتی یان پێچەوانەیی پرسیارەکان و دەرەنجامی توێژینەوەکە بکات لە گەڵ ئاماژەکردن بەوەی لە توێژینەوەکەدا چ شتێکی تازەی کردووەو چی بەدەست هێناوە، لە کۆتایشدا بە چەند دێرێك دەرەنجامی توێژینەوەکەی پێشکەش دەکات و ڕاسپاردەو پێشنیارەکانی بۆ توێژینەوەی داهاتوو دەخاتەڕوو.

## ٤. ٢. ٥ – دانان و ڕێکخستنی سەرچاوەکان References

پێویستە هەموو ئەو سەرچاوانەی کە لە کورتە توێژینەوەکەدا بەکارهاتوون لە لیستی سەرچاوەکاندا بە پێی یەکێك لە ستایلەکانی ئاپا(APA)ی کۆمەڵەی دەروونزانانی ئەمەریکی و(MLA)کۆمەڵەی زمانی نوێ و ستایلی شیکاگۆ(Chicago style)و ستایلی هارڤارد (Harvard style) ڕێك بخرێن، سەرچاوەکانیش بە پێی پیتی ئەبجەدی دادەنرێن کاتێك توێژینەوە بە ڕێنوسی عەرەبی یان کوردی نوسرابێت، بەلام لەکاتی نووسین بە زمانی ئینگلیزی یان ڕێنوسی لاتینی سەرچاوەکان بە پێی پیتی لاتینی ڕیزبەندی دەکرێن.

کورتە توێژینەوە(Mini-research Paper)چەندین جۆری هەیە و بۆ چەندین مەبەست و لە چەندین ڕشتەو بواری جۆراوجۆردا بەکاردەهێنرێت، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی بە فۆڕم و شێوەی جیاواز دەربکەوێت، بەلام ئامانج لە بەکارهێنانی لە بوارێکی زانستی دیاریکراودا بریتیە لە گەڕان و توێژینەوەیە لە کێشەو گرفتەکان لە لایەك و هەڵسەنگاندنی ئاستی زانستی و ئەکادیمی فێرخوازانە لە لایەکی تر. بە مانایەکی تر ئامانجی سەرەکی لە ئەنجامدانی لە هەر بوارێکدا دۆزینەوەی ئایدیاو بیرۆکەی تازەو نوێیە دەربارەی خاڵە سەرەکیەکانی بابەتی لێکۆڵینەوە، بۆ نموونە کۆمەڵێك توێژینەوەی پەیوەندار بە بابەتێك گفتوگۆی زۆر لایەنی جیاجیای بابەتەکەیان کردووە، بەلام لە ئەنجامی خوێندنەوەو ڕامان لە خاڵە سەرەکیەکان و ڕۆچوون و قوڵبوونەوە لە ناوەڕۆکی بابەتەکان فێرخواز چەندین لایەنی تری پەیوەندار بە بابەتەکەی بۆ ئاشکرا دەبێت کە لێیان نەکۆڵراوەتەوەو یان خوێندنەوەو گفتوگۆی پێوستیان لە بارەوە نەکراوە (Thomas,٢٠١٨).

## ٥-سانتێز Synthesis

سانتێز لە بنەڕەتدا وشەیەکی لاتینیە لە بەرامبەر وشەی(Synthesis)ی ئینگلیزی و وشەی (La synthèse)ی فەڕەنسی و وشەی (تولیف)ی عەرەبی بەکاردەبرێت کە مەبەست لێی کۆکردنەوەووەرگرتنی چەند بابەتێکی پەیوەندار بە بوارێکی دیاریکراوە لە چەند سەرچاوەیەکی تایبەت بە بوارەکە و ئاوێتەکردن و تێکهەڵکێش کردنیانە لە یەك بابەتدا، بەو واتایە سانتێز (Synthesis) بریتیە لە گفتوگۆیەکی ئەکادیمی بە ئامانجی دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان دوو سەرچاوە یان زیاتر، وەك پەیوەندی نێوان دوو وتار یان خەیاڵ یان سەرچاوەی نەنوسراوی وەك وانەکان و چاو پێکەوتنەکان و تێبینیەکان، یاخود دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان بابەتی ڕۆژنامەیەك لەگەڵ شتێکی بینراو.

سانتێز(Synthesis) پرۆسەی کۆکردنەوەو هەڵێنجانە لە نێوان دوو سەرچاوە یان زیاتر، ئاوێتەکردنی دوو یان سێ بابەت وبەراوردکردنیانە بە یەکتر، نوسەر لە دەستپێکی نووسیندا ڕووبەڕووی چەندین ئاستەنگ دەبێتەوە ئەگەر خاوەن ئاستێکی بەرزی شارەزایی و کارامەیی لە هونەری لێکدان و ئاوێتەکردن و توانستی شیکاری و جیاکاری و بەراوردکاری نەبێت.

ئامانج لە نووسینی سانتێز(Synthesis)دا دۆزینەوەی شتێکی تازەیە لە چەند شتێکی کۆن، بۆ ئەم مەبەستە دەبێت پرۆسەکە لە نێوان دوو شت یان دوو بابەتی لە یەك نزیك نەك دوو شتی لەیەك دوور ئەنجام بدرێت، گرنگە نوسەر لەدەسپێکدا بزانێت ئەو سەرچاوانەی بۆ نووسینی سانتێزەکە دەست نیشانی کردوون تا چەند لەیەك نزیکن و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان چین و ئاوێتەکردن و تێکەڵکردنیان بەیەکتر چ سوود و دەستکەوتێکی دەبێت. بۆ نموونە لە ئاوێتەکردن و بەراوردکردنی دەرنجامی سێ سەرچاوەی (A. B. C)دا پێویستە نوسەر سەرنجی هاوشێوەیی و نزیکی سەرچاوەکان لە یەکتر بدات و بزانێت ئایا دەشێت سەرچاوەی (A) بە هەردوو سەرچاوەی (B. C) بەراورد بکرێت و لە ئەنجامدا چ گرنگیەکی دەبێت؟ دوای خوێندنەوەی سەرچاوەکان و ئەنجامدانی پرۆسەکە نوسەر شتێك یان دەرنجامێکی تازەی دەست دەکەوێت کە بیرۆکەی خۆیەتی و بەرهەمی پرۆسە بەراوردکاریەکەیە دەشێت ناوی بنێت .(D)

## ٥. ١-مەرجەکانی نووسینی سانتێز Conditions of Writing Synthesis

سانتێز (Synthesis) وەك هەر بابەتێکی دیکەی نووسینی ئەکادیمی پێکهاتووە لە پێشەکی (Introduction) و ناوەڕۆك (Body) و دەرنجام(Conclusion) یان کۆتایی. لە پێشەکیدا نوسەر هەوڵ دەدات بابەتی سانتێزەکەی بناسێنێت و لە ناوەڕۆکدا هەوڵی خستەرووی بابەتەکە لە ڕێگەی ئاوێتەکردنی بابەتەکان و دەرخستنی خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان دەدات. لە کۆتایشدا دەرەنجامی نووسین و دەخاتەڕوو ڕاسپاردەو پێشنیارەکانی دەخاتەڕوو، لە نسوین و ئامادەکردنیشیدا دوو مەرجی گرنگ پیویستەو بریتین لە:

### ٥. ١. ١-دیاری کردنی سەرچاوەو چۆنیەتی بەکارهێنیان Determine the references and how to use them

دیاریکردنی سەرچاوەو چۆنیەتی بەکارهێنان و ئاوێتەکردن و پەیوەستکردنیان بە یەکتر مەرجی یەکەمی نووسینی سانتێزە، چونکە جەوهەری سانتێز لە کۆکردنەوەی نێوان زانیاری و بیرۆکە پێك دێت، ڕەنگە نوسەر لەکاتی خوێندنەوەی سەرچاوەکاندا تێبینی هەندێ شت بکات کە دەشێت ئاوێتە بکرێن و تا ڕادەیەك پەیوەندی نێوان بابەتەکان بدۆزێتەوە، بەڵام تا چەند توانستی دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان بابەتەکانی زیاتر بێت لە بەکارهێنانی سەرچاوەو سوود لێ وەرگرتنیان سەرکەوتووتر دەبێت.

### ٥. ١. ٢-دیاریکردنی مەبەست و ئامانجی نووسین Determine the purpose and goals of writing

مەرجی دووەمی نووسینی سانتێز دیاریکردنی مەبەست و ئامانجی نووسینە، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە نوسەر بابەتەکان بە وردی بخوێنێتەوەو بە باشی لێیان تێ بگات، تێگەیشتنی تەواو لە بابەت و سەرچاوەکانی بابەت وای لێ دەکات بزانێت لە نووسینەکەیدا هەوڵی هێنانەدی چی دەدات و چۆن بتوانێت سەرچاوەکانی بابەت بە پێی داواکاری نووسینەکە بە دروستی بەکار بهێنێت. بۆ نموونە ئەگەری داواکاری بابەتی لێکۆڵینەوە بریتی بێت لە پەیوەندی نێوان هۆکار و دەرنجام پێویستە نوسەر لە خوێندنەوەی سەرچاوەکاندا جەخت بخاتە سەر هۆکار و دەرنجامی سەرچاوەکان و جیاوازی و لێکچوونیان.

## ٥. ٢–هەنگاوەکانی نووسینی سانتێز بە پێی فۆرمی ئاپا APA

نووسینی سانتیز(Synthesis) لە بوارەکانی دەروونزانی و هەندێ لە زانستەکۆمەڵایەتی و مرۆییەکان پێویستی بە پەیڕەوکردنی یاساو ڕێساکانی نووسین بە پێی ستایلی کۆمەڵەی دەروونزانانی ئەمەریکی(APA)هەیە، گرنگترین ئەو هەنگاوانەش کە پێویستە نوسەر لە نووسینی سانتیزدا بە پێی فۆرمی ئاپا بیگرێتەبەر بریتین لە:

### ٥. ٢. ١– شێوازی نووسین Writing style

هەنگاوی یەکەم لە نووسینی سانتێزدا دیاریکردنی چوارچێوەو شێوازی نووسینە، بۆیە پێویستە نوسەر لە سەرەتادا چوارچێوەو شێوازی نووسینی سانتێزەکەی دیاری بکات لە کاتێکدا ئەگەر پێشتر لە لایەن مامۆستا یان کەسی سەرپەرشتیار چوارچێوەو شێوازی نووسینی بۆ دیاری نەکرابوو.

### ٥. ٢. ٢–پێشەکی Introduction

پێشەکی دەرزازەیەکە بۆ ناساندنی بابەت و خستەڕووی پێکهاتەی بابەت. بۆیە پێویستە نوسەر لە پێشەکیدا بابەت و بیرۆکەسەرەکیەکانی بابەتەکەی پێشکەش بە خوێنەر بکات، ئەمەش پێویستی بە بەکارهێنانی شێوازێکی سەرنج ڕاکێش هەیە بۆ ئەوەی لە دەستپێکی نووسینەکەیدا سەرنجی جەماوەری خوێنەر ڕابکێشێت.

### ٥. ٢. ٣–ناوەڕۆك Body

ناوەڕۆك گرنگترین بەشی سانتێزە، بۆئەم مەبەستە پێویستە نوسەر چوارچێوەیەکی تیۆری گونجاو بە پێی داواکاری و مەبەستی تایبەت لە نووسینی سانتێزدا بۆ بابەتەکە دابنێت.

### ٥. ٢. ٤–دەرەنجام Conclusion

دەرەنجام ئەو شتەیە کە هەوڵی بۆ دەدرێت لە سانتێزەکەدا، بۆیە لەو بەشەدا پێویستە نوسەر دەرەنجامەکانی بخاتەڕوو و لێکدانەوەو گفتوگۆی تێرو تەسەلیان لەسەر بکات.

### ٥. ٢. ٥- دوورکەوتنەوە لەگزیکردن Avoid plagiarism

پێویستە نوسەر لە کاتی نووسیندا خۆی لە هەر جۆرە ناپاکیەکی ئەکادیمی بە دوور بگرێت، وورد بێت لە بەکارهێنانی سەرچاوەو ئامازەکردن پێیان چ لەناو ناوەرۆك یان لە لیستی بیبلۆگرافیادا. باشترین سانتێز بە پێوەری ئاپا(APA) ئەو سانتیزەیە کە خاڵی بێت لە کۆپی و هەر جۆرە دیاردەیەکی نەشیاو کە بچێتە خانەی ناپاکی ئەکادیمیەوە.

### ٥. ٢. ٦- پلانی گشتی Outline

مەبەست لە پلانی گشتی (Outline) پلان یان پوختەی بابەتەکەیە کە پێوستە نوسەر لە شێوەی لیستێك پێشکەشی بکات بە جۆرێك ناونیشانی سەرەکی و لقە لاوەکیەکانی لە خۆگرتبێت کە پاڵپشتی ناونیشانە سەرەکیەکان دەکەن. واتە پێك هاتووە لە لیستی خاڵە سەرەکیەکانی بابەت کەتیایدا بابەتەکە بەزنجیرە بە شێوازێکی رێکخراو ولۆژیکانە پێشکەش کرابێت.

### ٥. ٥. ٧- سەرچاوەکان Sources

پێویستە نوسەر ورد بێت لە بەکارهێنانی سەرچاوەو و ئامازەکردن بەسەرچاوەکان چ لە ناو ناوەرۆك یان لە لیستیسەرچاوەکاندا. هەروەها لە رێکخستنی سەرچاوەو دانانی پەراوێزدا پێویستە پەیرەوەی لە فۆرمی ئاپا(APA) بکات.

### ٥. ٢. ٨- کەسی سێیەم Third person

پێویستە نوسەر لەکاتی نووسیندا زمانی کەسی سێیەمی تاك (ئەو) بەکار بهێنێت( Write in third person) نەك کەسی یەکەم (من) و کەسی دووەم(تۆ).

### ٥. ٢. ٩-وردبینی و هەڵەچنی Proofread

پێویستە نوسەر پێداچوونەوە بە بابەتەکە بکات بە مەبەستی هەڵەچنی و راستکردنەوەی هەڵەی زمانەوانی و رێنووسی( Selecting A Format For Writing A Synthesis www. vegasvalleydanceacademy. com).

سانتێز(Synthesis)بە یەکێك لە ئامرازە هەرە گرنگەکانی هەڵسەنگاندن دادەنرێت لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بە جۆرێك زۆربەی زانکۆ پێشکەوتووەکانی جیهان لە پرۆسەی هەڵسەنگاندنی ئاستی زانستی فێرخوازاندا پشتی پێ دەبەستن، ئەم پرۆسەیە ناودەبرێت بە ئاوێتەکردن و تێکهەڵکێش کردن لە جیاتی تاقیکردنەوە(Synthesis-instead of exam) کە تیایدا لە جیاتی تاقیکردنەوە داوای ئەنجامدان و ئامادەکردنی سانتێز(Synthesis) لە فێرخوازان دەکرێت، داوای تێکەڵ کردن و ئاوێتەکردنی کۆمەڵێك چالاکی و کرداری زانستی دەکەن کە لە ڕێگەیانەوە ئاستی زانستی و مەعریفی فێرخوازەکان هەڵدەسەنگێنریت، لە هەندێ زانکۆ پێشکەوتووەکان شتێك لە ئارادا نیە بە ناوی تاقیکردنەوە، بەڵکو لە پرۆسەی هەڵسەنگاندندا پشت بە سانتێز(Synthesis) و ڕاپۆرت (Report) و کورتە توێژینەوە( Mini research paper) و توێژینەوە(Researches) دەبەسترێت، ئەگەر هەشبێت شێوازی تاقیکردنەوەی پەرتووکی کراوەیە (Open book exams) کە شێوازێکی پەسەندکراوە و لە زۆربەی زانکۆ پێشکەوتووەکاندا بەکاردەهێنرێت.

## ٦-توێژینەوە Research

وشەی توێژینەوە(Research) لە بنەڕەتدا واتا گەڕان و پشکنین و بەدواداچوونی دیاردەیەك یان گرفتێك یان بابەتێك بە ئامانجی دەسکەوتنی زانیاری زیاتر دەربارەی گرفت و بابەتەکە، ئەم گەڕان و پشکنینەش بە پێیێ کۆمەڵێك یاساو ڕێسا بەڕێوە دەچێت لە پێناو گەیشتن بە بوونی ڕاستەقینە و سەلماندنی زانستیانەی دیاردەو گرفتەکان. یان کۆمەڵێك هەوڵی زانستیانەو ڕەخنەگرانەی ڕێکخراوە بە ئامانجی چارەسەرکردنی کێشەیەکی دیاریکراوی مرۆیی یان زانستی. گرنگترین ئامانجیشی بریتیە لە گەڕان بە دوای ڕاستی نوێ و خستنەڕووی ڕاستیەکان بە شێوەیەکی زانستی ڕێکخراو بە ئامانجی گەشەدان بە مەعریفەی مرۆیی و ڕووبەڕووبوونەوەی داواکاریە ژینگەییەکان کە دەوری مرۆڤیان داوە.

توێژینەوە(Research)یەکێکە لەو چەمکانەی پێناسەی جۆراوجۆری بۆکراوە بە جۆرێك هەر زانایەك یان پسپۆڕێکی بواری توێژینەوەی زانستی لە ڕوانگەی خۆی و ئاراستە زانستی و مەعریفیەکەی پێناسەی کردووە، لەگەڵ تێپەڕبوونی کات و ئەو گۆڕانکاریانەی کە بەسەر زانست و ڕشتە زانستیەکان و سروشتی توێژینەوەو توێژینەوەکاری داهاتووە ماناو پێناسەی چەمکی توێژینەوەش گۆڕاوە. لە سادەترین پێناسەدا بریتیە لە گەڕان بە دوای ڕاستی و بڵاوکردنەوەی لەناو خەڵکیدا بە شێوەیەك ڕاستیەکە هەندێ جار لەگەڵ مەیل و ئارەزووی توێژەر یەك دەگرێتەوەو هەندی جاریش پێچەوانەیە بە بێ ئەوەی بڕیارێکی پێشوەختەی لەسەر درابێت (صبیح واخرون، ). یان پیناسەکراوە بەوەی بریتیە لە ڕاپۆرتێکی تێروتەسەل توێژەر دەربارەی کارێك یان پرۆژەیەك پێشکەشی دەکات و بە ئەنجامی دەگەیەنێت بەو مەرجەی هەموو قۆناغەکانی توێژینەوەکەی لەخۆگرتبێت، واتە ڕاپۆرتەکە لە قۆناغی دروست بوونی بیرۆکەوە تا گەیشتن بە کۆمەڵێك دەرەنجامی تۆمارکراو و ڕێکخراو بە بەڵگەو باکگراوندی زانستی پشتڕاست کرابێتەوە (شبلی، ١٩٩٠).

توێژینەوە(Research)هەوڵێکە بۆ دۆزینەوەو پشتڕاستکردنەوەی زانین لە ڕێگای لێکۆڵینەوەو پشکنینی وردو ڕەخنەگرانەی قووڵ. یان هەوڵێکە بۆ دۆزینەوەی بەشێك لە زانین و بڵاو کردنەوەی لەناو خەڵکیدا بە مەبەستی سوود لێ وەرگرتنی (العزاوی، ٢٠٠٨). یان هۆکارێکە بۆ گەڕان بە دوای زانین و زانیاری و دۆزینەوەی و پەیوەندی تازە و لێکۆلینەوەو هەموارکردنەوەی

زانیاریەکان بە پەیرەوکردنی میتۆدێکی زانستی و هەڵبژاردنی کەرەستەو ئامرازی گونجاو و پێویست بۆ توێژینەوەکە (بدر، ١٩٨٢).

توێژینەوە(Research) بریتیە لە لێکۆڵینەوەیەکی وردی ڕێکخراو بە ئامانجی ڕوونکردنەوەی کێشەیەك و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی، بە جۆریك ڕێگاو شێوازی لێکۆڵینەوەکە بە پێی جیاوازی و سروشتی کێشەو بارودۆخەوە دەگۆڕێت (فودة و عبداللة، ١٩٧٥). یان هەوڵ و کۆششێکە توێژەر بە مەبەستی گەڕان و لێکۆڵینەوە لە بابەتێك دەیگرێتەبەر، دەشێت شێوازی لێکۆلینەوەکە شیکاری یان ڕەخنەکاری یان بەراوردکاری بێت لە پیناو دۆزینەوەی ڕاستەیەك و گەیشتن پێی (فضل اللة، ١٩٩٣).

توێژینەوە(Research) بریتیە لە بەکارهێنانی کۆمەڵێك بیروبۆچوون و ئامرازی زانستی لە چوارچێوەی میتۆدێکدا بۆ گەیشتن بە زانینی لایەنێکی شاراوەی شتێکی نەزانراو. ڤان دالین (Van Dalen) پێناسەی توێژینەوەی کردووە بەوەی بریتیە لە هەوڵێکی وردی ڕەخنەگرانەی ڕێکخراو بۆ گەیشتن بە چارەسەرکردنی ئەو کێشەو گرفتە جۆربەجۆرانەی مرۆڤ دووچاریان دەبێتەوە. بەڕای پۆڵنسکی (Polansky) توێژینەوە لێکۆڵینەوەیەکی ڕێکخراوە بە ئامانجی دەرخستنی زانیاری و دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستی زانیاریەکان لە ڕێگەی تاقیکردنەوەی زانستی. هەندێك لە توێژەران پێناسەیان کردووە بەوەی بریتیە لە کۆششێکی زانستیانە بە ئامانجی دۆزینەوەی ڕاستی نوێ و پشت ڕاستکردنەوەیان و شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی پەیوەندی نێوان دیاردە جیاوازەکان. بەڵام لە ڕوانگەی هەندێکی تریان ئامرازێکە توێژەر لە ڕێگەیەوە دەتوانێت بە چارەسەری کێشەیەکی دیاریکراو بگات لە ڕێگەی لێکۆلینەوەیەکی وردو تەواو بۆسەرجەم بەڵگەو شتی بینراو کە پەیوەستن بە کێشەیەکەوە(الفضلی،١٩٩٢).

توێژینەوە(Research)چەمکێکە پەیوەندی بە سەرجەم بوارە زانستی ومرۆییەکانەوە هەیە، بەکارهێنانی بە شێوەیەکی بەرفراوان لە بواری ئەدەبی و زانستی و کۆمەڵایەتی جۆراوجۆردا لە لەلایەك، گۆڕانکاری و پەرەسەندنە زانستیەکان بە درێژایی ڕۆژگار لە لایەکی تر بۆتە هۆی دەرکەوتنی چەندین پێناسەی جیاواز بۆ چەمکەو و میکانیزم و هەنگاوگەلی جیاواز لە بەکارهێنانیدا، بە سەرنجدان لە زۆربەی ئەو پێناسانەدا جیاوازییەکی کەم و لێکچوونێکی زۆر دەبینرێت بە شێوەیەك کۆی پێناسەکان دابەش دەبن بەسەر دوو بۆچوونی هاوشێوە:

- بەشێکیان پێیان وایە توێژینەوە لێکۆڵینەوەیەکی وردو ڕێکخراوە بە ئامانجی بە دەست هێنانی زانیاری تازەو بەڵگەدار دوای تاقیکردنەوە لەسەریان و گەیشتن بە بوونی ڕاستەقینەیان.
- بەشێکی تر پێیان وایە توێژینەوە بریتیە لە پشکنین و بەدواداچوونی وردو ڕێکخراوو لەسەرخۆ بە ئامانجی دۆزینەوەی ڕاستی دەربارەی شتەکان وپەیوەندی دیاردەکان بە یەکتریەوە.

توێژینەوەی زانستی(Scientific Research) وەك دەستەواژەیەکی زمانەوانی لە هەردوو وشەی توێژینەوە(Research)و زانست(Science) پێك هاتووە، یەکەمیان واتای گەڕان و پشکنین و گەیشتن بە ڕاستیەکان و دووەمیشیان واتای درککردن و زانینی ڕاستیەکان و گەیشتنە بە بوونی ڕاستەقینەی دیاردەکان دەستەواژەی، بەو مانایە توێژینەوەی زانستی هەوڵێکی زانستی ڕێکخراوە بۆ گەیشتن بە ڕاستیەکان و بوونی ڕاستەقینەی دیاردەو کێشەو گرفتەکان، گرنگترین بنەماکانیشی بریتین لە:

- ڕاستگۆیی و بەڵگەهێنانەوەی زاستی.
- ڕەسەنایەتی و داهێنان.
- خستنەڕووی گرفت و دارشتنی گریمانەکان.
- پیداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشووترو خستەڕوویان.
- نهێنی پاریزی و پارێزگاری کردن لە قەبارەی نموونەی توێژینەوەو داتاکان.
- لیکدانەوەو شیکردنەوەی قوڵ
- خستنەڕووی دەرەنجام و ڕاسپاردەو پیشنیارەکان
- پشت بەستن بە تازەترین سەرچاوەی پەیوەندار بە بابەتی توێژینەوە.

## ٦. ١–تایبەتمەندیەكانی توێژینەوەی زانستی Characteristics of scientific research

توێژینەوەی زانستی(Scientific Research) پێنج تایبەتمەندی گرنگی لەخۆ گرتووەو كە بە هۆیانەوە لە نوسراوەكانی تر جیا دەبێتەوە، گرنگترین ئەو تایبەتمەندیانە بریتین لە:

### ٦. ١. ١–توانستی پێشبینی كردن Predictability

مەبەست لێ توانستی پێكهێنان و پێشبینی كردنی ئەو رووداوانەیە كە لە داهاتوودا ڕوو دەدەن، یان ئەو شتانەیە كە لە داهاتوو ئەگەری بەدەست هێنانیان هەیە.

### ٦. ١. ٢–ڕێكخستن Organization

توێژینەوەی زانستی(Scientific Research) لە سەر ئاستێكی بەرزدا ڕێك دەخرێت، بۆیە توێژەر بە مەبەستی گەیشتن بە ئەنجام هەنگاو هەنگاوبە شێوەیەكی ورد و ڕێكخراو كارەكانی ئەنجام دەدات.

### ٦. ١. ٣–كۆنترۆڵكردن Controlling

لە هەر توێژینەوەیەكدا توێژەر هەوڵ دەدات كۆنترۆڵی ئەو فاكتەرانە بكات كە كاریگەریان هەیە بەسەر دیاردەكان جگە لەو فاكتەرانەی كە دەخرێنە ژێر تاقیكردنەوە.

### ٦. ١. ٤–توانای تاقیكردنەوە Testability

واتە بەكارهێنانی ئامرازی بۆ دڵنیابوون لە ڕاستی و ناڕاستی دەرەنجامەكان، بۆ نموونە هەژاری هۆكاری سەرەكی پەرەسەندنی تاوانكاریە. لێرەدا تێبینی كردنی دیاردەكەمانایەك نادات ئەگەر نەخرێتە ژێر تاقیكردنەوەو پێوانەكردنەوە.

### ٦. ١. ٥–توانای ڕەخنەگرتن Criticism Ability

توێژەر پێش ئەوەی دەرەنجامی توێژینەوەكەی دەربخات و بیخاتە پێش چاوی جەماوەر، بە پرۆسەی ڕەخنە لەخۆگرتندا تێپەڕی دەكات.

## ٦. ٢–جۆرەكانی توێژینەوەی زانستی The Types of Scientific Research

توێژینەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا یەكێكە لە ئامرازە سەرەكیەكانی پێشكەوتن لە هەموو بوارە جۆربەجۆرەكانی ژیاندا، لە تێكرای دەزگاو دامەزراوەزانستیەكانی جیهان بە تایبەت لە وڵاتە پێشكەوتووەكاندا گرنگیەكی زۆری پێ دەدرێت و خەرجی و داهاتێكی زۆر بۆ ئەنجامدانیان تەرخان دەكرێت، بە شێوەیەكی گشتی دابەش دەبن بەسەر سێ جۆر لە توێژینەوە:

### ٦. ٢. ١–ئەو توێژینەوانەی بەدوای دەرخستنی ڕاستیەكاندا دەگەڕێن Research seeking to uncover the facts

شێوەیەكە لە شێوەكانی توێژینەوەو تیایدا توێژەر هەوڵی دۆزینەوەی ڕاستیەكی دیاریكراو دەدات لە توێژینەوەكەیدا بەبێ گەیشتن بە دەرەنجام و گشتاندنیان. بۆ نموونە توێژەر لە لێكۆڵینەوەیەدا دەربارەی مێژووی مەعریفە هەوڵ دەدات لە ڕێگەی بەڵگەنامەو سەرچاوەی مێژوویی و وگۆڤاری جۆراوجۆردا هەرچی ڕاستی و زانیاری پەیوەست بە مێژووی پەرەسەندنی بیری مەعریفی كۆبكاتەوەو بە شێوازێكی زانستی و لۆژیكی بەیەكەوە پەیوەستیان بكات و بیانخاتەڕوو بە بێ ئەوەی بە كۆمەڵێك دەرەنجامی گشتی بگات و بتوانێت گشتاندنیان بۆ بكات. یان ئەو توێژینەوانەی كە فێرخوازو توێژەرە تازەكان لە چوارچێوەی زنجیرەی خوێندندا وەك مەرجێك بۆ دەرچوون و پێویستیەك بۆ بەدەست هێنانی بڕوانامە ئەنجامی دەدەن تیایدا ئەركیانە توێژینەوە بكەن بە بێ پابەندبوونیان بە گەیشتن بە دەرەنجام لە توێژینەوەكانیاندا، بەڵكو ئامانج ئاشناكردنیانە بە بنەماو هەنگاوەكانی ئەنجامدانی توێژینەوەو ڕاهێنانیانە لەسەر گەڕان و كۆكردنەوەی زانیاری و ڕیكخستنیان و سوود وەرگرتن لەسەرچاوەی جۆراوجۆردا. هەموو ئەو توێژینەوانە بە توێژینەوەی گەڕان بە دوای ڕاستی و زانیاریدا دادەنرێن (السماك واخرون، ١٩٨٦).

### ٦. ٢. ٢–توێژینەوەی ڕەخنەگرانە Research on monetary interpretation

ئەم توێژینەوانە لە بنەڕەتدا پشت بە لۆژیك و توانستی شیكاری وهەڵهێنجان دەبەستن بۆ گەیشتن بە كۆمەڵێك دەرەنجامی كۆتایی لە ڕێگەی گفتوگۆی درێژ و بەڵگەو ڕاستی گونجاوەوە. تەوەری سەرەكی ئەم توێژینەوانە بریتیە لەوەی كێشەكان زیاتر پەیوەستن بە بیرۆكە نەك ڕاستی بۆیە زیاتر لە بوارەكانی ئەدەب و مێژوو و زانستە مرۆییەكانی تر ئەنجام دەدرێن. بۆ

نموونە لێکۆڵینەوە لە ئاستی زانستی و کارگێڕی زانکۆکانی کوردستان لە لایەن گرووپێك لە توێژەران پێوستی بە دواداچوون و گەڕان بە دوای هەموو ئەو زانیاریانە هەیە کە پەیوەندیان بەو بابەتەوە هەیە، هەروەها بەکارهێنانی ئامرازی لێکۆڵینەوەی وەك فۆرم و چاوپێکەوتن و تێبینی کردن، دواتر کۆکردنەوەی داتاو بەتاڵکردنەوەیان و خستنەڕووی دەرەنجام و گفتوگۆکردنیان بە پشت بەستن بە بەڵگە و داتای ئاماری نەك ڕای تایبەتی توێژەرەکان (السماك واخرون، ١٩٨٦).

### ٦. ٢. ٣-توێژینەوەی تەواو Comprehensive research

توێژینەوەی تەواو، توێژینەوەیەکە تیایدا لێکۆڵینەوە لە کێشەیەکی دیاریکراو دەکرێت بە شێوازێکی زانستیانەو پشت بەستن بە بەڵگەو شیکردنەوەی ڕاستی و زانیاریەکان و پشت ڕاست کردنەوەی لۆژیکیانەی گریمانەکان بۆ گەیشتن بە چارەسەری کێشەکە. ئەم شێوە توێژینەوانەش بە گشتی پێك هاتوون لە توێژینەوەی تیۆری و توێژینەوەی پراکتیکی و توێژینەوەی بنچینەیی و توێژینەوەی زانستی(السماك واخرون، ١٩٨٦).




شێوە(٢. ٢)شێوەکانی توێژینەوەی تەواو ڕوون دەکاتەوە

- **توێژینەوەی تیۆری Theoretical research**

ئامانج لە ئەنجامدانی توێژینەوەی تیۆری(Theoretical research) گەیشتنە بە زانیاری لە پێناو زانیاریدا بە بوونی ئامانجیکی پراکتیکی، بەمەش تەنها سوودێکی تیۆری و مەعریفی پێشکەش بە بابەتی لێکۆلینەوەکە دەکەن.

- **توێژینەوە پراکتیکی Applied Research**

ئامانج لە ئەنجامدانی تویژینەوەی پراکتیکی(Applied Research)تەنها بۆ دەوڵەمەند کردنی مەعریفەو زانیاری نیە، بەڵکو هەوڵێکە بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی کۆمەڵگا دووچاری بووە، بە پشت بەستن بە بەڵگەو راستی و زانیاری دروست بێ گەرانەوە بۆ ئەو تیۆرانەی کە پەیوەندیان بە بابەتەکەوە هەیەو. لەم شێوە تویژینەوانەدا لە زۆربەی کاتدا توێژەر پشت بە هەوڵ و کۆششی خودی دەبەستێت.

- **توێژینەوەی بنچینەیی Basic Research**

ئامانج لە ئەنجامدانی توێژینەوەی بنچینەیی(Basic Research) لێکۆڵینەوە لە کێشەیەکی دیاریکراو و جێبەجی کردنی توێژینەوەکەیە، هەوڵێکە بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی دیاریکراو لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا.

- **توێژینەوەی زانستی Scientific Research**

توێژینەوەی زانستی(Scientific Research)شێوەیەکە لە شێوەکانی توێژینەوە تیایدا لێکۆڵینەوە لە بابەتێك یان کێشەیەکی زانستی دیاریکراو دەکرێت لە چوارچێوەو سنوورێکی تایبەت و دیاریکراودا.

توێژینەوەی زانستی (Scientific Research) بە پێی بوار و مەیدانی لێکۆڵینەوە دابەش دەبێت بەسەر دوو جۆر توێژینەوە، جۆری یەکەمیان ئەو توێژینەوانەن کە لە بواری زانستە مرۆییەکاندا ئەنجام دەردێن، وەك بوارەکانی مێژوو و پەروەردەو وێژەو زمان و فەلسەفە و بوارە کۆمەڵایەتیەکان. بەڵام جۆری دووەمیان ئەو توێژینەوانەن کە لە بواری زانستە سروشتیەکاندا ئەنجام دەدرێن، وەك بوارەکانی ماتماتیك و ئەندازەو پزیشکی.

له ڕووی ئاستەوە توێژینەوەی ئەکادیمی بەسەر سێ جۆر لە توێژینەوەدا دابەش دەبێت ، جۆری یەکەمیان ئەو توێژینەوانەن کە فێرخوازانی خوێندنی بالاّ لە قۆناغی دیبلۆم و لیسانسدا ئەنجامی دەدەن، وەك ڕاپۆرت و کورتە نامەو کورتە توێژینەوەو توێژینەوەی دەرچوون(Search Graduation) کە مەبەست لە ئەنجامدانیان ڕاهێنان و فێرکردنی فێرخوازی زانکۆیە لەسەر چۆنیەتی ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستی. جۆری دووەمیان ئەو توێژینەوانەن کە لە قۆناغەکانی خوێندنی دیپلۆم و ماستەر و دکتۆرا و پۆست دکتۆرا ، وەك توێژینەوەکانی دیپلۆمی بالاّ (Higher Diploma) و نامەی ماستەر(Master Thesis) و تێزی دکتۆرا (Thesis)و پۆست دکتۆرا(Post Dissertation PhD) کە بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامە ئەنجام دەدرێن. جۆری سێیەمیشیان توێژینەوە پسپۆڕیەکان(Specialized research)ن کە لایەن مامۆستایانی زانکۆ و پسپۆڕانی بواری توێژینەوەی زانستی ئەنجام دەدرێن، یان ئەو توێژینەوانەی لە کۆنگرەو ناوەندە زانستیەکاندا پێشکەش دەکرێن.

لەڕووی چۆنیتی و چەندێتیەوە توێژینەوەی (Scientific Research)دابەش دەبێت بەسەر سێ جۆر کە بریتین لە توێژینەوەی چۆنایەتی(Qualitative research) و توێژینەوەی چەندایەتی (Quantitative Research) و توێژینەوی هاوبەش یان ئەو توێژینەوان کە لە نێوان هەردووکیاندان. بە شێوەیەکی گشتی ئەو توێژینەوانەی لە بوارە زاستیەکاندا ئەنجام دەدرێن پشت بە بەڵگەو داتای ئاماری و ژمێرەیی دەبەستن توێژینەوەی چەندایەتین، بەلاّم ئەو توێژینەوانەی لە بوارەکانی کۆمەلایەتی و زمان و مێژوو ئەنجام دەدرێن توێژینەوەی چۆنایەتین، هەرچی ئەو توێژینەوانەن کە لە بوارەکانی دەروونزانی و کۆمەڵزانی ئەنجام دەدرێن هەردوو لایەنیان بەخۆوە گرتووە، بۆیە توێژینەوەی چۆنایەتی و لە هەمان کاتدا چەندایەتیشن، چونکە لە دوو بەشی تیۆری و کرداری پێك هاتوون و جیا لە بەشی تیۆری لە بەشی کرداریدا پشت بە ئامرازی پێوانەکاری و بەڵگەداری ئاماری دەبەستن.

دابەشکردنی توێژینەوەکان بەسەر چەندایەتی و چۆنایەتی و توێژینەوەی هاوبەش لە بواری توێژینەوەکاریدا ئەوە ناگەیەنێت کە ئاستێکیان لە ئاستەکەی تریان گرنگتر یان ئالۆزتر بێت، بەڵکو هەر ئاستێکیان دەکەوێتە ژێر کاریگەری چەندین فاکتەر، لەوانە:

- ژمارەی ئەو دیاردانەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرێت.
- پەیوەندی نێوان دیاردەکان کە تا چ ڕادەیەکە.
- نموونەی ئەو تاکانەی دەکەونە ژێر لێکۆڵینەوە.
- شێوەو ژمارەی ئەو کەرەستەو ئامرازانەی داتایان پێ کۆدەکرێتەوە.
- چۆنیەتی مامەڵەی ئاماری لەگەڵ داتاکان.
- ئاستی شیکردنەوەی لۆژیکیانە(Zagros٢٠١٧).




شێوە(٢. ٣) ئەو فاکتەرانەی کاریگەریان هەیە بەسەر توێژینەوە ڕوون دەکاتەوە.

## ٧-پەرتوکی توێژینەوە Book research

لەگەڵ پێشکەوتن و پەرەسەندنی توێژینەوەو زیادبوونی کەرەستەو ئامرازی تەکنیکاری جۆوراوجۆر و بەکارهێنانیان لە بوارە جیاجیاکانی توێژینەوەی زانستی، چەندین ڕێگاو شێواز و هۆکاری جیاجیاش بۆ توێژینەوەکاری و بلاوکردنەوەی توێژینەوەکان دەرکەوتن کە پەرتووکی توێژینەوە(Book research) بە یەکێك لە دیارترین ئەو ڕێگایانە دادەنرێت.

پەرتووکی توێژینەوە(Book research)بریتیە لە پەرتووکێکی قەبارە گەورە یان مامناوەند لە ڕووی ژمارەی لاپەڕەوە تیایدا کۆمەڵێك توێژینەوەی پەیوەندار بە بوارێکی زانستی دیاریکراو بلاوکراوەتەوە. بە شێوەیەکی گشتی سێ جۆری هەیە، جۆری یەکەمیان بریتیە لە پرۆژەی تایبەتی توێژەرێك کاتێك توێژینەوەیەك لە کتێبێکدا بلاودەکاتەوە. جۆری دوومییان بریتیە لە پرۆژەی کۆمەڵێك توێژەر تیایدا کۆمەڵێك توێژینەوە لە دووتویی کتێبێکدا بلاودەکرێتەوە. بۆ نموونە گرووپێك لە توێژەرانی بواری دەروونزانی مەعریفی هەوڵ دەدەن کۆمەڵێك توێژینەوەی تازەی خۆیان لە کتێبێکدا بلاو بکەنەوەو پێشکەش بە خوێنەری بکەن. جۆری سێیەمیشیان بریتیە لە پەرتوکێك کە توێژینەوەی هەمەجۆری لە خۆگرتووەو تیایدا کۆمەڵێك توێژینەوەی زانستی دەربارەی چەند بوارێکی زانستی جیاواز بلاوکراوتەوە.




شێوە(٢. ٤)جۆرەکانی پەرتووکی توێژینەوە دەخاتەڕوو

پەرتووکی توێژینەوە(Book research) لە هەندێ کاتدا پرۆژەیەکی کەسیەو تایبەتە بە تاکەکەسێك، بەڵام لە زۆربەی کاتدا پەیوەندی بە کاری هەروەوەزی و گرووپی کۆمەڵکاریەوە هەیە، کاتێك کۆمەڵێك توێژەر لە بوارێکی تایبەتدا بە یەکەوە لە ناو یەك بازنەی کارکردندا کار لەسەر نووسین و ئامادەکردنی پەرتووکێك دەکەن کە کۆمەڵێك توێژینەوەی زانستی لە خۆگرتووە بە ئامانجی:

- پشتگیری کردن و بەرەو پێش بردنی پرۆسەی توێژینەوەکاری لە بوارێکی تایبەتدا کە کاری تێدا دەکەن.
- بەرزکردنەوەی ئاستی توێژینەوە لە رووی چۆنایەتی و چەندایەتی.
- گەشەدان بە کاری هاوبەش بۆ دروستکردنی کارلێك و ژینگەیەکی لەبار بۆ پەیوەندی نێوان توێژەران.
- بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی و توێژینەوەکاری توێژەرەکان و سوود وەرگرتن لە توانست و شارەزاییەکانی یەکتری.
- بەرزکردنەوەی ئاستی فیکری و مەعریفی و فێربوونی بەردەوام لە گرووپی کۆمەڵ کاری.
- بەرزکردنەوەی ئاستی پاڵنەرێتی کارکردن لای ئەندامانی گرووپی توێژینەوە لە رێگەی کۆمەڵکاری و بڵاوکردنەوەی بە کۆمەڵدا.
- پەرەدان بە گیانی کۆمەڵکاری و پرۆسەی نووسینی هاوبەش ( Collaborative Writing) لە نێوان توێژەران.
- هەوڵدان بۆ هێنانەدی ئامانجی هاوبەش یان کۆمەڵێك ئامانج کە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی زانستی و کارامەیی و لێهاتوویی ئەندامانی گرووپ.
- زانین و فێربوونی بەردەوام لە گرووپدا.
- ئەنجامدانی کارو پرۆژەیەکی زانستی گەورە به یەکخستنی کۆمەڵێك توانست و کارمامەیی لە گرووپێکدا کە تاکەکەس بە تەنها ناتوانێت ئەنجامی بدات.
- ئەنجامدانی پرۆژە بە کەمترین کات وبڕی تێچوون.

## ٨-پێداچوونەوەی پەرتووك Book Review

پێداچوونەوەی پەرتووك(Book Review) شێوازێکە لە شێوازەکانی هەڵسەنگاندن و ڕەخنەی ئەدەبی و زانستی تیایدا لەسەر بنەمای ناوەڕۆك و شێوازدا لێکدانەوە بۆ وتارێك یان کتێبێك یان توێژینەوەیەکی زانستی دەکرێت، پرۆسەیەکی ڕەخنەگرانەو شیکاریانەی وردە بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی ناوەڕۆکی پەرتووکێك و خستنەڕووی گرنگیەکەی ئەنجام دەدرێت، لە زۆربەی کاتدا پەیوەندی بە توێژینەوەکانی لەمەوپێش دەربارەی بابەتەکەوە هەیە. هەمیشە ژمارەی وشەکانی لە ٥٠٠-١٠٠٠ وشە تێپەر ناکات، بەڵام ئەم کورتبڕی و درێژبڕیە لە نووسیندا بە پێی درێژی و ئاڵۆزی پەرتووك و مەبەستی گشتی پێداچوونەوەکە دەگۆڕێت.

بە شێوەیەکی گشتی لە پێداچوونەوەی پەرتووکدا پەیڕەوی دوو شێواز دەکریت، ئەوانیش بریتین لە پێداچوونەوەی وەسفی(Descriptive review) کە شێوازێکە تیایدا بە شێوەیەکی بابەتیانە پێداچوونەوەبە پێکهاتەو ناوەڕۆکی پەرتووکێك دەکرێت، وەك وەسف کردنی زانیاریە بنەڕەتیەکان دەربارەی مەبەستی گشتی لە ڕێگەی خستنەڕووی ئامانج و گریمانەو پێشبینی ودەرنجامەکان، بۆ ئەم مەبەستە نوسەر تیشك دەخاتە سەر ڕەگەزە سەرەکیەکانی پەرتووك و چەند برگەیەك وەردەگرێت وکاریان لەسەردەکات. هەروەها پێداچوونەوەی ڕەخنەیی (Critical review) کە شیوازیکی ترە تیایدا هەڵەسەنگاندن بۆ ناوەڕۆکی پەرتووك بە پێی کۆمەڵێك پێوەری ئەدەبی و زانستی و مێژوویی باوەڕپێکراو دەکرێت بە پشت بەستن بە زانیاری بەڵگەداری ناو پەرتووکەکە. نوسەر لەم شێوازەدا هەڵەسەنگاندنێکی شیکاریانەی ڕەخنەگرانە بۆ بابەتەکە دەکات لە ڕێگەی خستنەڕووی مەبەست و ئامانجەکانی دانەر و مەودای سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی لە هێنانەدی ئامانجەکان( Organizing Your Social Sciences Research Paper: Writing a Book Review,libguides. usc. edu).

پێداچوونەوەی پەرتووك(Book Review) پرۆسەیەکی ئاڵۆز و گرانە ویرای ئەوەی پێوستی بە کات و خۆڕاگری و ڕەنج و کۆششێکی زۆر هەیە، لە هەمان کاتدا پیویستیشی بە ئاستێکی بالای توانستی زانستی و ئەکادیمی و شارەزایی و کارامەیی لە هونەری پێداچوونەوەو بابەتی پەرتووکی پیداچوونەوە هەیە.

## ٨. ١ –مەرجەکانی نووسینی پێداچوونەوەی پەرتووک Conditions for writing a book review

پێداچوونەوەی پەرتووک(Book Review) پرۆسەیەکە خۆی لە هەڵسەنگاندن و نرخاندنی ناوەڕۆکی پەرتووکێك دەنوێنێت، بۆیە تێگەیشتن لە بابەت مەرجی یەکەمی سەرکەوتن و ئەنجامدانی پێداچوونەوەی باشە، تێگەیشتن لە بابەتیش پێویستی بە خوێندنەوەی دەق بۆ چەندین جار و وەڵامدانەوەی کۆمەڵێك پرسیاری گرنگ دەربارەی هەر یەکێك لەم لایەنانەی خوارەوە هەیە:

### ٨. ١. ١–ئامانجی پەرتووك The goal of book

ئایا پرسیاری سەرەکی و بیانووی دانەر بۆ نووسینی پەرتووك چیە؟ئایا ئەو خاڵە سەرەکیانەی جەختی لەسەر کردوون چین؟ ئەگەر جەختی لەسەر خاڵێکی سەرەکی کردووە چۆن کردوویەتی و لە پەرتووکەکەدا چی بەدەست هێناوە؟.

### ٨. ١. ٢–بابەتی پەرتووك The Subject of Book

بابەتی پەرتووکەکە بە دروستی چیە؟ئایا دانەری پەرتووك بابەتەکەی بە تەواوی خستۆتەڕوو؟ ئایا هەموو لایەنەکانی بابەتەکەی بە شێوەیەکی هاوسەنك خستۆتەڕوو و هیچ جۆرە نا هاوسەنگیەکی تیادا بەدی دەکەیت؟ئایا لە دۆزینەوەی گرفتی لێکۆڵینەوەدا پشتی بە چ میتۆد یان شێوازێك بەستووە؟ بۆ نموونە شێوازی بابەتی یان شیکاری یان وەسفی یان هەر شێوازێکی تر.

### ٨. ١. ٣–پشتڕاستکردنەوەی بیرۆکەکان Evidence and proof of idea

ئایا دانەری پەرتووك چۆن بیروڕاکانی پشت ڕاست کردۆتەوە ؟چین ئەو بەڵگانەی بۆ ئەم مەبەستە بەکاری هێناون ؟ ئایا بەڵگەی باوەڕدارن؟ئەگەر بەڵگەی باوەڕدارن چۆن و ئەگەر باوەڕدار نین بۆچی؟ئایا هیچ جۆرە زانیاری یان دەرنجامی پەرتووکەکە هاودژە لەگەڵ زانیاری و دەرنجامی پەرتووکی تر کە لە دەوری یەك بابەتدا دەخولێنەوە؟.

### ٨. ١. ٤–شیکردنەوەی بابەت Topic analysis

ئایا دانەری پەرتووک لە شیکردنەوەی بابەت و بەکارهێنانی بەڵگەکاندا پشتی بە شێوازێکی لۆژیکی بەستووە؟ئەو بەش و لقە لاوەکیانەی گشتیان پێك هێناوە چین؟ ئایا بەڵگەکانی لۆژیکی و باوەرپێکەرن؟ئەگەر بەڵگەی لۆژیکی و بارەرپێکەرن چۆن و ئەگەر نا بۆچی؟ یان ئایا پەرتووکەکە بە گشتی تا چەند گرفتی لێکۆڵینەوەکەی ڕوون کردۆتەوە؟ چۆن و ئەگەرنا بۆچی؟.

### ٨. ١. ٥–دانەری پەرتووك The Author of Book

ئایا دانەری پەرتووك کێەو کار و پسپۆرێتیەکەی چیە؟پێشینەی کاری چیە و سەر بە چ دەزگا یان دامەزراوەیەکی ئەکادیمی و زانستیە؟( Organizing Your Social Sciences Research Paper: Writing a Book Review,libguides. usc. edu).




شێوە(٢. ٥)پرۆسەی پێداچوونەوە بە پەرتووك ڕوون دەکاتەوە

## ٨. ٢ -هەنگاوەکانی پێداچوونەوەی پەرتووك The Steps of Book Review

پێداچونەوەی پەرتووك(Book Review)تەنها پێشکەشکردنی راپۆرتێك دەربارەی ناوەرۆکی پەرتووکە نیە، یان خستنەڕووی سەرنج و بیروبۆچوونی تایبەت و تۆمارکردنی تێبینی نەرێنی نیە، بەڵکو پێداچوونەوەیەکی دادپەروەرانەیە و پێوستی بە ئاستێکی باڵای توانستی شیکاری و راڤەکاری هەیە لە هەڵسەنگاندندا. بۆیە پێویستە نوسەر لە پرۆسەی پێداچوونەوەدا پەیرەوی چەند هەنگاوێکی گرنگ بکات:

٨. ٢. ١-ناساندنی دانەر، ناوی دانەر و پلەی زانستی و پسپۆرێتی و کار لە خۆدەگرێت، دواتر ئامازەکردن بەپێشینەو باگراوندی زانستی و پیشەیی و ئایینی و رۆشنبیری دانەر و مەبەستی دانەر لە نووسینی پەرتووك. هەمیشە مەبەستی نووسین لە پێشەکیدا خراوەتەڕوو.

٨. ٢. ٢-جەخت کردن لەسەر تەوەری سەرەکی بابەت و خاڵە سەرەکیەکان و ئامازەدانێکی کورت بە گرنگترین ئەو بەڵگانەی دانەر بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ڕاکانی بەکاری هێناون.

٨. ٢. ٣-هەڵسەنگاندنی ئەو بەڵگانەی کە دانەر بەکاری هێناون، چ بەڵگە هاوجووتەکان کە بە مەبەستی سەلماندنی ڕاکانی بەکاری هێناون، چ ئەو بەڵگانەی هاودژن لەگەڵ ڕاکانی. هەروەها چۆنیەتی مامەڵەکردنی دانەر لەگەڵ بەڵگە هاودژەکان بەوەی ئایا پشت گوێ ی خستوون یان بە تەواوی ئامازەی پی کردوون و بە شێوەیەکی بابەتیانە بەرپەرچیانی داوەتەوە.

٨. ٢. ٤-گفتوگۆی بابەتەکە بە کورتی و بەراوردکردنی لەگەڵ دەقێکی تر کە لە ڕووی بیرۆکەوە لەسەر هەمان بابەت نوسراوە، دواتر هەڵسەنگاندنی کۆتاو کۆتایی هێنان بە نووسین.

٨. ٢. ٥-سەرنجدان لە کورتبڕی و درێژبڕی پێداچوونەوەکە، پێداچوونەوەی باشیش لە دوو بۆ سێ لاپەرە بە قەبارەی (A٤) تێپەڕ ناکات، بۆیە پێویست ناکات بە هەر ڕێگایەك یان هەر بیانوویەك بێت ژمارەی لاپەرەکانی لە سێ لاپەرە زیاتر بێت و لە لاپەرەو نیوێکیش کەمتر بێت (كيف تكتب مراجعة لكتاب، www. sahistorian. com).

## ٩-پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو Literature Review

پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو (Literature Review) بریتیە لە پێداچوونەوە بە کۆمەڵێك توێژینەوەی لەمەوپێش (Previous studies) کە پەیوەندیان بە گرفتی توێژینەوە هەیەو توێژەر وەك پێویستیەك لە پێویستەیەکان و وەك بەشێکی گرنگ لە توێژینەوەکەی ئەنجامی دەدات. یان بریتیە لە گفتوگۆی رەخنگرانەی کۆمەڵێك توێژینەوەی لەمەوپێش کە لە دەوری یەك بابەتدا دەخولێنەوەو توێژەر وەك بنەمایەك بۆ چوارچێوەیەکی تیۆری توێژینەوەکەی بە مەبەستی لێکۆڵینەوەی زیاتر ودەستەکەوتنی زانیاری زیاتر دەربارەی گرفتەکە بەکاری دەهێنێت.

پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو (Literature Review) پوختەیەکی وەرگیراوە لە توێژینەوەکانی لەمەوپێش دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو( The Literature Review is a summary of previous research on a topic). وەك توێژینەوەوەی زانستی و وتار و پەرتووك و سەرچاوەی تری جۆراوجۆر کە پەیوەندیان بە بابەتی توێژینەوە هەیە لە بوارێکی دیاریکراودا وتوێژەر وەك پێشینەیەکی زانستی و مێژوویی پشتیان پێ دەبەستێت ( Literature Review: What is a Literature,www. research. morehead state. edu).

ئامانج لە ئەنجامدانی پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو(Literature Review) لە هەر بوارێکدا شیکردنەوەی رەخنەگرانەی کۆمەڵێك زانیاری تایبەت بە بابەتێکە لە رێگەی کۆکردنەوەو بەراوردکردنی زانیاریەکاندا، بۆ نموونە دیاریکردنی ئەو شتانەی کە نادیارن و پەیوەندیان بە بابەتی توێژینەوە هەیە، هەروەها فەراهەم کردنی باکگراوندی مێژوویی توێژینەوە لە رێگەی خستنەرووی تیۆرەکان و شیکردنەوەی تازە بۆ دەرەنجامی کۆمەڵێك توێژینەوەی کۆن و تێگەیشتنی زیاتر لە بابەت و گرنگی بابەتەکە لە رێگەی پێداچوونەوە بە کۆمەڵێك توێژینەوەو دیاریکردنی بۆشاییەکانی توێژینەوە (Gaps in literature) بە مەبەستی پڕکردنەوەیان.

## ٩. ١–شێوازەکانی پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو The Methods of Literature Review

پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو (Literature Review)بە یەکێك لە کۆڵەکە گرنگەکانی توێژینەوەی زانستی دادەنرێت، چونکە بەشێکی گرنگی توێژینەوە پێك دەهێنێت کە ناوەڕۆك یان چوارچێوەی تیۆریەکەیەتی وەرجە توێژەر یان فێرخواز لە قۆناغەکانی لیسانس و ماستەر و دکتۆرا وەك پێویستیەك بۆ بەشێکی گرنگی توێژینەوەکەیان ئەنجامی بدەن، هەنگاوێکی داواکراوە لە کاتی پێشنیارکردنی پرۆژەی لێکۆڵینەوەی ماستەر و دکتۆرا و بە بێ جێبەجێ کردنی ئەم هەنگاوە هیچ پرۆژەیەکی پێشنیارکراو سەرکەوتوو نابێت، چونکە گرنگترین بەشی توێژینەوەیە کە وا لە توێژەر دەکات لە بابەت و بواری توێژینەوەکە بگات، هۆکارێکە بۆ ئاشنابوون بە بیروڕای جیاواز دەربارەی بابەتی توێژینەوەو یارمەتیدەرە بۆ گەیشتن بە کۆمەڵێك دەرەنجام و تیۆر و بیرۆکەو کۆمەڵێك زانیاری نوێ وتازە دەربارەی بابەتی توێژینەوەو پێشکەشکردنیان بە خوێنەر. هەروەها یارمەتیدەرە بۆ بڕیاردان لەسەر بەشەکانی تری توێژینەوە. بۆ نموونە ئەگەر توێژەر نەیتوانی بە مەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری ئامرازەکانی فۆڕم وچاوپێکەوتن بەکار بهێنێت، پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو یارمەتی دەدات بزانیت چ ڕێگایەکی تر گونجاوە بەکاری بهێنێت (حريري، ٢٠١١).

پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو(Literature Review) فۆڕم و شێوازی جۆراوجۆری هەیەو شێوەی بەکارهێنانی لە هەر بوارێکدا جیاوازە لەگەڵ بوارێکی تر، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی پەیرەوەی لە سێ شێوە و جۆرلە پێداچوونەوە بە توێژینەوەکان دەکرێت :

### ٩. ١. ١–پێداچوونەوەی وەسفی Narrative literature review

پێداچوونەوەی وەسفی شێوازێکە تیایدا پێداچوونەوە بە گرنگترین توێژینەوەو بەرهەمی چاپکراوی پەیوەندار بە بابەتی توێژینەوەکەیەك دەکرێت لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ڕۆڵی هەر یەکێکیان لە تێگەیشتنی بابەتدا.

### ٩. ١. ٢-پێداچوونەوەی ڕێکخراو Systematic literature review

پێداچوونەوەی ڕێکخراو(Systematic literature review) یەکێکە لەو شێوازە باوەکانەی لە ڕێگەیەوە زۆرترین بەڵگەی ڕاست و بەهێز بەکاردەهێنرێت، بە چەند ڕێگایەکی دیاریکراو ئەنجام دەدرێت تیایدا لە ژێر چەند پێوەریکدا بە ڕۆشنی پێداچوونەوە بە کۆمەڵێك توێژینەوەی پەیوەندار بە بوارێکی زانستی دیاریکراو دەکرێت لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕێگاکەی کە پێداچوونەوەکەی پێ ئەنجام دەدرێت (McCambridge, McAlaney &Rowe,٢٠١١).

### ٩. ١. ٣-پێداچوونەوەی ڕەهەندی و کۆکەرەوەیی Meta-analysis

پێداچوونەوەی ڕەهەندی و کۆکەرەوەیی(Meta-analysis)شێوازێکە لە پێداچوونەوە تیایدا چەندین ئامرازی ئاماری جۆراوجۆر بەکاردەهێنرێت بە مەبەستی لێکدانی دەرەنجامەکانی کۆمەڵێك توێژینەوەی پەیوەندار بە بوارێکی دیاریکراو بە ئامانجی دۆزینەوەی شێوەیەکی دیاریکراو لە دەرەنجام و زانینی هۆکاری جیاوازی دەرەنجامەکان و پەیوەندی دەرەنجامەکان بە یەکتر لە ڕێگەی شیتەڵکاری ئامارییەوە (Wilk, Jensen &Havighurst,١٩٩٧).




شێوە(٢. ٦)شێوازەکانی پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو ڕوون دەکاتەوە

## ٩. ٢-پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو بە پێی فۆرمی ئاپا APA

پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو(Literature Review)لە ڕوانگەی گالڤان (Galvan) تەنها بیبلۆگرافیایەك نیە تیایدا پێداچوونەوە بە بابەتی وتارێك کرابێ و هەوڵی کورتکردنەوەی وتارەکە درابێت، بەڵکو هەڵسەنگاندنێکی شیکاریانەی ڕەخنەگرانەیە بە ئامانجی دەرخستنی پەیوەندی نێوان کۆمەڵێك کارو پرۆژەی جۆراوجۆرو پەیوەستکردنیان بە پرۆژەی توێژینەوەیەکی نوێ ئەنجام دراوە. بە ڕای گالڤان (Galvan) پێویستە توێژەر لە پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو (Literature Review) پەیڕەوی لە پرۆسەیەکی هەنگاو بە هەنگاو بکات، وەك:

### ٩. ٢. ١-پابەند بوون بە ڕێنماییەکانی ئاپا Apply APA guidelines

لە یەکەم هەنگاودا توێژەر پێویستی بە گەڕانەوە بۆ یاساو ڕێساکانی ئاپا(APA)هەیە بە مەبەستی زانین و ئاشنا بوون بە بنەما سەرەکیە هاوبەشەکان و چۆنیەتی نووسین بە پێی شێوازی ئاپا، بۆ ئەوەی بتوانێت پلانی نووسین و چوارچێوەی نووسینەکەی بە پێی ئەم ستایلە دابنێت، وەك چۆنیەتی دانانی چوارچێوەی گشتی کە بەسەر پێشەکی و ناوەڕۆك و کۆتایی دابەش دەبێت، هەروەها جۆری خەت و ناونیشان وچۆنیەتی بەکارهێنانی سەرچاوەو سوود لێ وەرگرتنیان (Galvan,٢٠٠٦). بەڵام پێوستی پابەندبوون بە بنەماکانی ئاپا(APA) کۆمەڵەی دەروونزانانی ئەمەریکی تەنها بۆ نوسەر و توێژەرەکانی بواری دەروونزانی و کۆمەڵزانی و هەندێ بواری مرۆیی گرنگە، لە کاتێکدا نوسەر توێژەرانی بوارەکانی دیکەی وەك زمان و مێژوو و هونەر و زۆربەی زانستە سروشتەیەکان پێویستە پابەند بە یاساو ڕێساکانی ستایلی تری وەك (MLA) کۆمەڵەی زمانی نوێ و شیکاگۆ(Chicago) و هارڤارد(Harvard)بن.

### ٩. ٢. ٢-دیاریکردنی بابەت Topic Selection

پێویستە توێژەر لە هەنگاوی دووەمدا بابەتی نووسینەکەی دیاری بکات و بزانێت پێداچوونەوە بە چ بابەتێك دەکات و بۆ چ مەبەستێك دەیکات. ڕەنگە بابەتی هەڵبژێردراو بابەتێکی تەسك بێت و پێوستی بە لێکۆڵینەوەی وردو گەڕانەوە بۆ ژمارەیەك سەرچاوە و دەیان پەرتووکی جۆراوجۆر هەبێت ، بۆیە بۆیە توێژەر پێویستی بە نزیك بوونەوە لە بابەت و ناسین و تێگەیشتنی تەواو لە بابەت و کەرەستەو پێداویستەکانی لێکۆلینەوە لە بابەت هەیە.

### ٩. ٢. ٣-دیاریکردنی سەرچاوەکان References Selection

لەم هەنگاوەدا پێویستە توێژەر سەرچاوەکانی بابەتەکە دیاری بکات و هەوڵی کۆکردنەوەو بەدەست هێنانیان بدات، بۆ ئم مەبەستە دەتوانێت کەڵك لە سەرچاوە جیاجیاکانی وەك کتێبخانە گشتیەکان و زانکۆکان و ناوەندە زانستیەکان و ماڵپەرە ئەلکترۆنیەکان و هەر سەرچاوەیەکی تر کە پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەبێت وەربگرێت، بەڵام پێوستە بە وردبینیەوە سەرچاوەکان دیاری بکات و دوور بکەوێتەوە لە هەڵبژاردنی ئەو سەرچاوانەی پەیوەندیەکی تەواویان بە بابەتەکەوە نیە.

### ٩. ٢. ٤-شیتەڵکردن و ڕێکخستنی بابەت Analysis and organization of the topic

دوای دیاریکردنی سەرچاوەو کەرەستەی پێوست، لە هەنگاوی چوارەمدا شیتەڵکردن و ڕێکخستنی سەرچاوەکان پێوستە. گرنگە توێژەر لە سەرەتادا چاوخشاندنێکی گشتی بە وتارەکاندا بکات بۆ گەیشتن بە بیرۆکەیەك دەربارەی مەبەستی گشتی وناوەڕۆکی بابەت، بۆ ئەم مەبەستە دەشیت جەخت لەسەر پێشەکی و برگە سەرەتاییەکانی بابەتەکان بکات و تێبینیەکانی تۆمار بکات، ئینجا بابەتەکان بۆ چەند بەشێك پۆلین بکات، دواتر لەگەڵ خوێندنەوەی بابەتەکان بە سوود وەرگرتن لە پرۆگرامی جۆراوجۆر تێبینیەکانی تۆمار بکات. لەم هەنگاوەدا پێویستە توێژەر جەخت لەسەر چەند شتێکی گرنك بکات، وەك دیاریکردنی چەمکە سەرەکیەکان و سەرنجدان لە جیاوازی پێناسە کردنیان و ئامارە سەرەکیەکان وشێوازەکانی وەرگرتن ونیشانەو چۆنیەتی ئاماژە پیێ کردنیان و ئاراستەو شێوە گشتیەکان و پەیوەندی نێوان بابەتەکان و دیاریکردنی بۆشایی و کەڵەبەرەکان و هۆکارەکانی دروست بوون و چۆنیەتی چارەسەرکردنیان. هەروەها گرنگە توێژەر سەرنج بخاتە سەر کۆی بابەتەکان بە گشتی بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی هەموو ئەو سەرچاوەو بابەتانەی هەڵی بژاردوون پەیوەندی تەواویان بە بابەتەکەوە هەیە (Galvan,٢٠٠٦).

### ٩. ٢. ٥-کورت کردنەوەی بابەت لە شێوەی خشتە یان نەخشە Summarize the topic in the form of a table or map

بە ڕای گالڤان(Galvan) دروستکردنی خشتە ڕێگایەکی گونجاو و باشە بۆ خستنەڕووی دەرەنجامەکان و ڕێکخستن و کورتکردنەوەیان، بۆیە پێشنیار دەکات توێژەر لە خستنەڕوو

وڕێکخستنی دەرەنجامەکان پشت بە خشتە یان کۆمەڵێك خشتە و نەخشەی بەیانی ببەستێت. بۆ نموونە پێناسەی زاراوەو چەمکە سەرەکیەکان لە خشتەیەکدا و ڕێگاکانی توێژینەوە لە خشتەیەکی ترداو کورتەی دەرەنجامی توێژینەوەکان لە خشتەیەکی تردا بخاتەڕوو. بۆ ئەم مەبەستە دەتوانیت سوود لە هەندێ پرۆگرامی کۆمپیوتری وەك مایکرۆسۆفت وۆرد و ئەکسلّ وەربگرێت. بەکارهێنانی پرۆگرامی ئەکسل ئامرازێکی باشە بۆ توێژەر بۆ ئەوەی بتوانێت دەرەنجامەکان بە پێی کۆمەڵێك هۆکاری جۆراوجۆر بخاتەڕوو. بۆ نموونە بە گوێرەی مێژوو و دانەر یان بە گوێرەی میتۆد و مێژوو.

**٩. ٢. ٦–ئاوێتەکردن پێش نووسینی ڕاو سەرنجی تایبەت Mixing topics**

لەم هەنگاوەدا پێویستە توێژەر بابەتەکان ئاوێتەو تێکەڵی یەکتر بکات پێش ئەوەی هیچ جۆرە ڕاو سەرنجێکی تایبەتی خۆیانی بنوسێت. بۆ ئەم مەبەستە دەشێت پێداچوونەوە بەچەند شتێکی گرنك بکات، وەك مەبەستی تایبەت لە پێداچوونەوەکەو چۆنیەتی تۆمارکردن و کۆکردنەوەی تێبینیەکان و ڕاڤەکردن و ڕوونکردنەوەی بەڵگەکان و دووبارە ڕێکخستنەوەی تێبینیەکان لە چوارچێوەیەکی بەڵگەداری و تێبینی کردنی جیاوازی نێوان ناونیشانەکان و توێژینەوەکان ودیاریکردنی کەلێن و بۆشاییەکانی توێژینەوە کە پێویستیان بە پڕکردنەوە هەیە. هەروەها توێژەر لەم هەنگاوەدا پێویستی بە دانانی چەند پلانێك هەیە، وەك:

- پلان بۆ لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی سەرجەم ئەم توێژینەوانەی پەیوەندیان بە بابەتی لێکۆڵینەوەکە هەیە.
- پلان بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی چۆنیەتی پەیوەستکردنی توێژینەوەی تایبەت بە تیۆرە پێشکەوتووەکان.
- پلان بۆ کورتکردنەوەی بابەت بە شێوەی بازنەیی تا کۆتایی بابەتەکە.
- پلان بۆ خستنەڕووی دەرەنجامەکان.
- پلان بۆ خستنەڕووی چەند ڕاسپاردەو پێشنیارێك بۆ توێژینەوەی داهاتوو لە کۆتایی بابەتەکە.
- پلان بۆ شیکردنەوەو لێکدانەوە و پێشکەشکردنی ڕاو سەرنجی تایبەت دەربارەی بابەتەکە (Galvan,٢٠٠٦).

### ۹. ۲. ۷–نووسینی بابەتی پێداچوونەوە Writing topic

لەم هەنگاوەدا توێژەر دەست بە نووسینی بابەتی پێداچوونەوەکە دەکات بە جێبیەجیٚ کردنی ئەم ڕیٚ و شوێنانەی خوارەوە:

- دیاریکردنی ناوچەی فراوانی گرفتی توێژینەوە.
- ئامازەکردن بە هۆکارەکانی گرنگی بابەتەکە کە پێداچوونەوەی بۆ دەکرێت.
- جیاکردنەوەی سەرچاوەی توێژینەوە لەگەڵ سەرچاوە زانیاریەکانی تر و دیاریکردنی هۆکارەکانی گرنگی هەندیٚ لە توێژینەوەکان.
- دیاریکردنی کات و ئامادەکردنی بابەتەکە لە ماوەو کاتی دیاریکراودا.
- ئامازەکردن بە توێژینەوە کلاسیکیەکان کە پشتیان پیٚ بەستراوەو وەك سەرچاوە بەکار هێنراون لەگەڵ ئامازە کردن بە دووبارەبوونەوەی سەرچاوەکان و دەرەنجامی لێکچوو و هاوشێوەیان (Galvan,۲۰۰٦).
- گفتوگۆکردنی سەرچاوە زانیاریەکانی تر دەربارەی بابەتەکە وهێنانەوەی پاساوی زانستی و باوەرپێکەر بۆ هەندیٚ وتەو لێدوانی وەك نەمتوانیوە دەستم بە هەندیٚ سەرچاوە بگات.
- ئامازەکردن بە ناهاوجووتی و جیاوازی نێوان دەرەنجامی توێژینەوەکان لە کاتێکدا ئەگەر ئەو ناهاوجووتی و جیاوازیە هەبوو.
- ئامازەکردن بەسەرجەم سەرچاوەکان چ توێژینەوە یان پەرتووك یان وتار یان بابەتی گۆڤارێك بێت و پەیوەندی بە بەشێك لە بەشەکانی بابەتی پێداچوونەوەکە هەبێت.

### ۹. ۲. ۸– یەکێتی بابەت Subject module

لە هەنگاوی کۆتاییدا پێویستە توێژەر بە مەبەستی دڵنیابوون لە یەکگرتوویی و گونجاوی و درێژبڕی و کورتبڕی و بوونی یەکێتی بابەت لە نێوان بەشەکان پێداچوونەوەیەکی گشتی بە بابەتەکەدا بکات. لە کاتی کورتبڕی و درێژبڕیدا پێویستە توێژەر بە بابەتەکەدا بچێتەوەو بە گوێرەی پێویست دووبارە دایبرێژێتەوە بە بیٚ ئەوە هیچ شتێك لا بدات و پەردەپۆشی بکات. نەگونجاوی و نارێکی بابەت ناتەواویەکە پێویستە چارەسەری بکات. لە بەکارهێنانی سەرچاوەو چۆنیەتی وەرگرتن و پارافرەیزکردندا دڵنیا بێت ئامازەی بە هەموو سەرچاوەکان

کردووه. دڵنیا بێت هەموو سەرچاوەکان پەیوەندی تەواویان بە بابەتی پێداچوونەوەکە هەیە. لە بەکارهێنانی زنجیرەی بەڵگەکان بۆ پشت ڕاستکردنەوەی بابەت دڵنیا بێت کە بەشێوازێکی لۆژیکی داڕێژراون. لە بەکارهێنانی چەمکەکاندا پشتی بەبەکارهێنانی چەمکی سادەو ساکار بەستبێت کە جەماوەری خوێنەر بەگشتی لێی تێ بگات نەك بەکارهێنانی چەمکی ئاڵۆز و لیل بە شێوەیەك تەنها نوخبەیەك لێی تێ بگات. لە دانانی خالبەندی و نووسینی بابەتەکە بە شێوازێکی زمانەوانی دروست دڵنیابێت هەموو مەرج و داواکاریە زمانی و ڕێزمانیەکانی جێبەجێ کردووە. لە کۆتایشدا پێویستە داوای یارمەتی لە کەسێکی پسپۆری بوارەکە بکات بە مەبەستی خویندنەوەی بابەتەکە بۆ گەیشتن بە کۆمەڵێك تێبینی کە خۆی نەیتوانیوە پێیان بگات و دەست نیشان کردنی هەندی خاڵی ناڕۆشن وهەندێ کەم وکورتی کە تا ئەو ساتە درکی پێ نەکردوون.

یەکێك لە دیارترین و زەقترین هەڵەی باو کە لە پێداچوونەوە بە توێژینەوەکانی پێشوو (Literature Review) ی زۆربەی توێژینەوە کۆمەڵایەتیەکاندا لە کاتێکدا ڕوو دەدات کە:

- سەرچاوەکانی بابەتی پێداچوونەوە پەیوەندیەکی تەواویان بە بابەتی لێکۆڵینەوە نەبێت و هۆکارێك نەبن بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتری گرفت و ئامانجی توێژینەوەکە کە پیداچوونەوەی بۆ دەکریت.
- نەبوونی کاتی پێوست بۆ گەڕان و دەستەبەرکردنی سەرچاوەی پەیوەندار بە گرفتی توێژینەوەو پشت بەستن بە سەرچاوەی شیکاری و زانیاری لاوەکی لە جیاتی سەرچاوەی سەرەکی و ئەو توێژینەوانەی پەیوەندی پتەو ڕاستەوخۆیان بە بابەتی لێکۆڵینەوەکە هەیە.
- پشت بەستن بە خستنەڕوو و شیکردنەوەی دەرنجامەکان لە جیاتی هەڵسەنگاندنی ڕەخنەگرانەی سەرجەم لایەنەکانی وەك دیزاین و شیکاری توێژینەوەکان و جەخت کردن لەسەر ڕاست و دروستی گریمانەکان و فەرامۆش کردنی دەرەنجامی پێچەوانەوە لە توێژینەوەکاندا ( Organizing Your Social Sciences Research Paper: The Literature Review,www. libguides. usc. edu).

## ١٠-پێداچوونەوەی هاوەڵان Peer review

پێداچوونەوەی هاوەڵان (peer review) جۆرێکی ترە لە پێداچوونەوە تیایدا بە مەبەستی هەڵسەنگاندن و بڕیار لەسەردان لێکۆڵینەوە لە ناوەڕۆکی بابەتێك یان توێژینەوەیەکی زانستی دەکرێت. کەسی هەڵسەنگینەر لەم پێداچوونەوەیەدا ناوەڕۆکی بابەتەکان پۆلێن دەکات و لایەنە باش و خراپەکانی دەخاتەڕوو و تێبینی و سەرنج و ڕای خۆیانی لەسەر دەدات.

لە پێناسەیەکی تردا پێداچوونەوەی هاوەڵان (peer review) بریتیە لە هەڵەسەنگاندی کارێك یان چالاکیەکی دیاریکراو لە لایەن کەسێکی پسپۆر و شارەزای بوارەکە بە مەبەستی بڕیاردان لەسەر ڕاستی و دروستی و کارو چالاکیەکە. جۆرو شێوازی هەڵسەنگانەکەش بە پێی جۆری چالاکی وبواری کارو بابەتەوە دەگۆڕێت، بۆ نموونە پێداچوونەوەی هەڵسەنگاندن لە بواری پزیشکیدا پرۆسەیەکە پەیوەستە بە هەڵەسەنگاندنی کلینیکی و بڕیاردان لەسەر باشی و سەلامەتی دام و دەزگا چاودێری و تەندروستیەکان، بەڵام لە بواری نەخۆشەوانی و فێرکاری پزیشکیدا پەیوەستە بە هەڵسەنگاندنی ئاستی شارەزایی و کارامەیی پزیشکەکان لەپرۆسەی وانەوتنەوەوفێرکاری پزیشکیدا. هەرچی بواری ئەکادیمیە پرۆسەکە پەیوەستە بە هەڵسەنگاندنی پرۆژەیەکی زانستی و ئەکادیمی یان هەڵسەنگاندنی توێژینەوەیەکی زانستی و خستنەڕووی هەنگاوە تیۆری و کرداریەکانی بە مەبەستی بڕیاردان لەسەر ئاستی ڕاست و دروستی توێژینەوەکە و بڵاوکردنەوەی لە یەکێك لە گۆڤارە زانستیەکاندا.

پێداچوونەوەی هاوەڵان (peer review)ئامرازێکە بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕاستی و دروستی توێژینەوەکان و هۆکارێکە بۆ فەراهەم کردنی دەرەفەتی هەروەزی و کۆمەڵکاری و کاری بە گرووپ لە ناوەوەندە زانستی و ئەکادیمیەکاندا. وێرای ئەو بەرهەڵستی و ڕەخنانە زۆرانەش کە ڕووبەڕووی کراوەتەوە تا ئێستا لە سەر ئاستێکی فراوان بە تاکە ڕێگای باوەڕپێکراو بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕاستی و دروستی توێژینەوەکان دادەنرێت ( What is peer review? Elsevier, www. elsevier. com). وەك ئامرازێکی هەڵسەنگاندنی زانستی ریشەی مێژوویی هەیەو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی گریکی کۆن و وەك پرۆسەش بە درێژایی ڕۆژگار گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو پیشکەوتنی زۆری بەخۆوە بینووە.

## ١٠. ١- پێداچوونەوەی هاوەڵان لە ڕوانگەی کۆمبێل Campbell

لە ڕوانگەی کۆمبێل (Campbell) ئامانج لە پێداچوونەوەی هاوەڵان (peer review) لە لایەن هەڵسەنگێنەران و گۆڤارە زانستیەکان و دامەزراوە ئەکادیمیەکان دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك:

١٠. ١. ١-ڕێگریکردن لە بڵاونەکردنەوەی ئەو توێژینەوانەی کە ناتەواون لە ڕووی پێکهاتەی گشتی و میتۆد و دیزاین و نارۆشنی دەرەنجامەکانیان بە پێی کۆمەڵێك پێوەری ئەکادیمی بۆ بڵاوکردنەوە.

١٠. ١. ٢-لێکۆڵینەوە لە ناوەڕۆك و دڵنیابوون لە بەهێزی میتۆدی بەکارهێنراو لە توێژینەوەکاندا، هەروەها دڵنیابوون لە گونجاوی توێژینەوەکە لەگەڵ بنەماو مەرجەکانی بڵاوکردنەوەی گۆڤار و بوونی کۆمەڵێك زانیاری گرنگ بۆ توێژەرانی تر.

١٠. ١. ٣-دڵنیابوون لە شێوازی شیکردنەوەو لێکدانەوەی دەرەنجامەکان بە شێوەیەکی دروست و نا هاودژی دەرنجامەکانی توێژینەوە لەگەڵ یەکتر.

١٠. ١. ٤-دڵنیابوون لە پابەندبوون بە بنەماکانی دەسپاکی ئەکادیمی و نەبوونی هیچ جۆرە دیاردەیەکی ناپاکی لە توێژینەوەکەدا.

١٠. ١. ٥- پارێزگاری کردن لە ئاستی زانستی گۆڤاری زانستی لە ڕێگەی یارمەتیدانی گۆڤار و سەرنوسەر و ستافی بەڕێوەبردنی گۆڤارێك لە بڵاوکردنەوەی توێژینەوەی تەواو و بڵاو نەکردنەوەی توێژینەوەی لاواز و ڕەتکردنەوەیان لە لایەك، لە لایەکی تر یارمەتیدانی توێژەران بە پێدانی کۆمەڵێك تێبینی و زانیاری گرنگ بە مەبەستی ڕاستکردنەوەی هەڵەکان و هەموار کردنەوەی توێژینەوەکەیان و ئەنجامدانی کاری باشتر لە داهاتوودا.

هەروەها بە بڕوای کۆمبێل (Campbell) پێداچوونەوەی هاوەڵان (peer review) پرۆسەیەکی ڕەخنەگرانەو داد پەروەرانەی ڕێکخراوە و بە پێی سیستمێك بەڕێوە دەچێت کە چەند داواکارییەکی لەخۆگرتووە:

- پێویستە پرۆسەی هەڵەسەنگاندن و نرخاندنی توێژینەوەکان لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی دەرکیەوە ئەنجام بدرێت نەك تەنها سەرنوسەر و دەستەی نوسەرانی گۆڤارێك یان دامەزراوەیەکی زانستی ئەنجامی بدەن.
- پێوستە کەسی هەڵسەنگێنەر بێ لایەن بێت و هیچ جۆرە بڕیارێکی باش و خراپ لە بەرژەوەندی و زیانی توێژینەوەکە نەدات.
- پێویستە کاتی گونجاو بۆ پێداچوونەوە بە توێژینەوەکان تەرخان بکرێت.
- پێویستە پرۆسەی هەڵەسەنگاندن و نرخاندنی توێژینەوەکان لە لایەن هەڵسەنگێنەران لەسەر بە ئامانجی ڕاستکردنەوەی هەڵەو ناتەواوی وهەموارکردنەوەی توێژینەوەکان بە ڕێوە بچێت.
- پێویستە هەر جۆرە بڕیارێك کە لە لایەن هەڵسەنگێنەرەکان دەربارەی توێژینەوەکان دەدرێت لەسەر بنەمای هەڵەسەنگاندنێکی زانستیانە و دادپەروەرانە بێت نەك لەسەر بنەمای ناو پێگەی توێژەر و زانکۆ و دامەزراوەی زانستی، هەر جۆرە بڕیارێکی لەو شێوەیەش دەچێتە خانەی بازرگانی کردن بە زانست (Campbell,٢٠١٢).




شێوە(٢. ٧) پرۆسەی پێداچوونەوەی هاوەڵان لە ڕوانگەی کامبل ڕوون دەکاتەوە

## ۱۰. ۲-پێداچوونەوەی هاوەڵان لە ڕوانگەی زیمیرمان Zimmerman

پێداچوونەوەی هاوەڵان (peer review) لە ڕوانگەی زیمیرمان(Zimmerman) پرۆسەیەکە وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێکی گرنگ دەربارەی چۆنیەتی ئەنجامدانی توێژینەوەیەك و ناوەڕۆك و دەرنجامی توێژینەوەکە لە خۆ دەگرێت، لە سەر ئەو بنەمایە کەسی هەڵسەنگێنەر پێکهاتەی بابەتەکە دیاری دەکات و تیایدا جەخت لەسەر پێکهاتەی گشتی ( Overall organization) وپێشەکی (Introduction) میتۆد(Methods) ودەرەنجامەکان (Results) وگفتوگۆ (Discussion) و هەڵسەنگاندنی گشتی (Overall assessment) دەکات ، وەك:

۱۰. ۲. ۱-ئایا لە ڕووی ڕێکخستنەوە پێکهاتەی گشتی بابەتەکە تەواوە و بەش و لقە بەشیەکانی بە شێوەیەکی ڕێکخراو دانراون؟ ئایا لە پێشەکیدا نوسەر یان نوسەران بابەتەکەیان بە پوختی و شێوازێکی زانستیانە پێشکەش کردووە؟ ئایا پرسیارەکانی توێژینەوەو گریمانەو و پێشبینیەکانیان کورت و ڕوونن؟

۱۰. ۲. ۲- ئایا لە ڕووی شێوازەوە پەیڕەوی لە میتۆدیکی ڕوون و تەواو کراوە؟ ئایا دەرەنجامە ئاماری و شیکاریەکان بە شێوازێکی ڕوون پێشکەش کراوە؟ ئایا نوسەر یان نوسەران ڕوونکردنەوەی تەوایان دەربارەی گریمانەکان و ئەو ئامرازە ئاماریانەی بەکاریان هێناوە پێشکەش کردووە؟.

۱۰. ۲. ۳-ئایا لە ڕووی شیکاریەوە توێژەر یان توێژەران دەرنجامەکانیان بە شێوەیەکی ڕێکخراو و ڕوون و تەواو پێشکەش کردووە؟ ئایا خشتەو گرافیکەکانیان بە شێوازێکی گونجاو بەکار هێناوە؟.

۱۰. ۲. ٤-ئایا توێژەر لە کۆتاییدا ئاماژەی بە پرسیارەکانی توێژینەوە کردووە و دەرنجامەکانی بە شێوازیکی زانستیانە ڕوونکردۆتەوە؟ ئایا توێژینەوەکە لە هێنانەدی دەرەنجامی تازە تا چەند پاڵپشتی مەعریفە دەکات؟.

.١٠ .٢ .٥– ئايا دەرنجامە تازەكان بە شێوازێكی تەواو و ڕوون پێشكەش كراون و گفتوگۆ و لێكدانەوەی گونجاویان بۆ كراوە؟ ئايا توێژەران بە شێوەيەكی فراوان گفتوگۆی دەرەنجامەكانيان كردووەو چ ڕاسپاردەو پێشنيارێكيان بۆ توێژينەوەی داهاتوو پێشكەش كردووە؟ ئايا هيچ جۆرە ئاماژەيەكيان بەو كۆسپ و تەگەرانە كردووە كە ڕەنگە بێنە پێش توێژينەوەی داهاتوو؟ ئايا شيكردنەوەی دەرنجامەكان لۆژيكانەو باوەڕپێكراون و پێشبينەكان بە ڕوونی پێشكەش كراون ؟

.١٠ .٢ .٦–ئايا توێژينەوەكە بە شێوازێكی كورت و پوخت نوسراوە كە خوێنەر بەباشی لێی تێ بگات؟ ئايابابەتی توێژينەوەكە بابەتێكی تازەو نوێ يە يان پەيوەندی بە بابەتی توێژينەوەی ترەوە هەيە؟ (Zimmerman,٢٠١٧).




شێوە(٢. ٨)پرۆسەی پێداچوونەوەی هاوەڵان لە ڕوانگەی زیمیرمان(Zimmerman) ڕوون دەكاتەوە

## ١٠. ٣-جۆرو شێوازەکانی پێداچوونەوەی هاوەڵان Types of peer review

گۆڤارە زانستیەکان پەیڕەوی لەبەکارهێنانی چەند شێوازێکی جۆراوجۆر لە پێداچوونەوەی هاوەڵان دەکەن، شێوازی پێداچوونەوەش بە پێی جۆری توێژینەوە و سیستمی بەڕێوەبەری گۆڤارەکانەوە دەگۆڕێت. شێوازی پێداچوونەوەی داخراو (Single-blind peer review) و شێوازی پێداچوونەوەی دووانەی بزر (Double-blind peer review) دوو شێوازی پێداچوونەوەن کە لە زۆرترین کاتدا بەکارهێنراون، بەڵام لەم ساڵانەی دووایدا هەندێ گۆڤار پەیڕەویان لە دوو شێوازی تر کردووە کە شێوازی پێداچوونەوەی کراوە(Open peer review) و شێوازی پێداچوونەوەی دوای بڵاوکردنەوە(Post-publication peer review)ن.




شێوە(٢. ٩)جۆر و شێوازەکانی پێداچوونەوەی هاوەڵان(peer review) ڕوون دەکاتەوە

### ١٠. ٣. ١–شێوازی پێداچوونەوەی داخراو Single-blind peer review

لەم شێوازەدا هەڵسەنگینەرەکان توێژەرەکان وخاوەنی بابەتەکان دەناسن کە پێداچوونەوەی بۆ دەکەن، بەڵام توێژەرەکان هەڵسەنگینەرەکان ناناسن و ئاشکرا نین. پەیڕەوانی ئەم ڕێگایە پێیان وایە ئاشکرابوونی کەسی توێژەر لای هەڵسەنگێنەران کاریگەری خراپی دەبێت لەسەر پرۆسەکەو ڕەنگە جۆرێك لە لایەنگیری دروست بکات، بەڵام لەباری ئاشکرا نەبوونیدا دەرفەتی لایەنگیری و لێکدانی بەرژەوەندیەکان کەم دەبێتەوە (Rajagopalan,٢٠١٧) .

### ١٠. ٣. ٢–شێوازی پێداچوونەوەی دووانەی بزر Double-blind peer review

لە شێوازی پێداچوونەوەی دووانەی بزردا هەردوو لایەنی توێژەران و هەڵسەنگێنەران ئاشکرا نین و ناسنامەی هەریەکەیان نادیارە. پەیڕەوانی ئەم ڕێگایە پێیان وایە ناسینی توێژەر لە لایەن هەڵسەنگینەران و گوێ گرتن لێی لە هەندێ کاتدا هەڵسەنینەر دووچاری پێدانی تێبینی هەڵەو بڕیاری نابەرپرسانە دەکات و گرنگی بەکارهێنانی شێوازەکەش دەگێرنەوە بۆ:

- هەڵسەنگێنەران پرۆسەی هەڵەسەنگاندنی توێژینەوەکە لەسەر بنەمای ناوەڕۆك و بە هێزی بابەت ئەنجام دەدەن بێ ئەوەی خاوەنەکانیان بناسن و لە نزیکەوە هیچ جۆرە لێدوانێکی زارەکیان لێ وەربگرن.
- دەشێت هەڵسەنگینەران لە ڕێگەی بابەت و شێوازی نووسین وهەوڵ و کۆششی خودیەوە دیاری بکەن.
- لە چوارچێوەی بنەماکانی پێداچوونەوەکە هەڵەسەنگینەران زۆرترین زانیاریان دەربارەی توێژەرەکانەوە دەست دەکەوێت ( What is peer review? Elsevier, www. elsevier. com.

### ١٠. ٣. ٣–شێوازی پێداچوونەوەی کراوە Open peer review

لەم شێوازەدا ناسنامەی هەریەکە لە هەڵسەنگێنەر و توێژەر ئاشکران. لە زۆربەی کاتدا تیبینی و بۆچوونی هەلسەنگینەرەکانپەیرەوانی ئەم شێوازە پێیان وایە پێداچوونەوەی کراوە باشترین ئامرازە بۆ بەرگرتن لە هەڵسەنگاندنی خراپ و دیاردەی ناپاکی و گەڕانەوە بۆ خشتەی کاری توێژەران لە لایەن هەڵسەنگینەرەکان، لە هەمان کاتدا باشترین شێوازە بۆ هاندانی کراوەو هەڵسەنگاندنی دروست. بەڵام ڕەخنەگرانی ئەم شێوازە پێیان وایە پێداچوونەوەی کراوە

شێوازێکی دروست نیەو لە زۆربەی کاتدا بە هۆی سەرسامی یان ڕەخنەگرتن لە توێژینەوەکان لە لایەن هەڵسەنگێنەرەکانەوە گیانی لایەنگیری و لێکدان و تۆڵەسەندنەوە لای توێژەرەکان دروست دەکات(What is peer review? Elsevier, www. elsevier. com).

**١٠. ٣. ٤- شێوازی پێداچوونەوەی دوای بڵاوکردنەوە Post-publication peer review**

شێوازی پێداچوونەوەی دوای بڵاوکردنەوە یەکێکە لەو شێوازە تازانەی کە هەندێ بڵاوکراوەو گۆڤاری زانستی لە هەڵەسەنگاندنی توێژینەوەکان پشتی پێ دەبەستن، ئامانج لە بەکاهێنانی ئەم شێوازەش کردنەوەی پەنجەرەیەکی کراوەو دەربازبوونە لە کۆمەڵێك کۆت و بەندی کلاسیکی لە پرۆسەی هەڵسەنگاندن و بڵاوکردنەوەدا. بە پێی ئەم شێوازە پێداچوونەوە بە توێژینەوەکان و هەڵەسەنگاندنیان لە دوای بڵاوکردنەوە لەسەر مینبەرێکی کراوە ئەنجام دەدرێت وگفتوگۆی تێبینی و هەڵەسەنگاندنی هەڵسەنگینەرانیش لە هەمان کات و شوێندا دەکرێت . گرنگی ئەم شێوازە لەوەدایە کە دەرەفەتی گەیشتن بە ئاستێکی بەرزی نرخاندن و هەڵەسەنگاندن بە هەڵەسەنگێنەرەکان دەدات لە لایەك، لە لایەکی تر دەرەفتی بڵاوکردنەوەی پێشوەختەو گفتوگۆی کراوەو ڕاشکاوانەی زیاتر بە توێژەران دەدات (Rajagopalan,٢٠١٧).

## ۱۱-گۆڤار Journal

گۆڤار(Journal)بە مانا گشتیەکەی جۆرێکە لە جۆرەکانی کتێبی بچووك لە ڕووی قەبارەوە، شێوەی لاپەڕەکانی گەورەو بەرگێکی کاغەزی هەیە، ناوەڕۆکەشی چەندین وێنەو چاوپێکەوتن و بابەتی هەمەجۆری لەخۆ گرتووەو بە شێوەی هەفتانە یان وەرزانە یاخود سالآنە لە لایەن دەزگایەکی وەشاندن چاپ و بلآودەکرێتەوە. لە پێناسەیەکی کورتدا بریتیە لە بلآوکراوەیەکی دەوری تایبەت بە بوارێکی دیاریکراو و توێژێکی تایبەتی دیاریکراو لە خوێنەر. یان بریتیە لە بلآوکراوەیەك کۆمەڵێك بابەتی هەمەجۆری وەك چیرۆك و هۆنراوەو وتار و ڕەخنەو بابەتگەلی ئەدەبی و زانستی لەخۆگرتووە لەگەڵ کۆمەڵێك وێنەو نەخشەو هێڵکاری وگرافیك و کاریکاتێر بۆ گوزارشت کردن لە بابەتەکان.

مێژووی هاتنەکایەی گۆڤار لە جیهاندا مێژوویەکی دوور نیەو لە چوار سەدە تێپەڕ ناکات، بەلآم گەڕانەوە بۆ ئەم مێژووە بە مەبەستی ئاشنابوون بە قۆناغەکانی دەرکەوتنی گۆڤار پێویستی بە گەڕانەوە بۆ مێژووی ڕۆژنامەگەری و قۆناغەکانی گەشە سەندنی بزووتنەوەی چاپ و بلآوکردنەوە لە جیهان بە تایبەت لە لە ئەوروپادا هەیە، لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمی زایینی لە ئەوروپا کۆمەڵێك گۆڤار لە شێوەی بلآوکراوەوەی سادە دەرچوون کە پێویستیان بە کۆشش و کاتێکی زۆر هەبووە، لە ئەنجامی بەردەوامی و هەوڵی بێ وچانی ڕۆژنامەگەران لەو سەردەمەدا بزوتنەوەی ڕۆژنامەگەری ڕۆژ بەڕۆژ بەرەوپێش چوونی زیاتری بەخۆوە بینیووە وگۆڤاریش هەنگاو هەنگاو گۆڕاناکاری بەسەردا هاتووە و شێوەو فۆڕمی جیاجیای وەرگرتووە. یەکەم گۆڤار بە شێوەیەکی فەرمی لە نێوان سالآنی ۱٦٦۳-۱٦٦۸ ز لە لایەن شاعیری ئەڵمانی یۆهان ڕیست[۱۳](Johan Rest ) چاپ و بلآوکراویەوە، بەم هەنگاوەشی ڕێگای بۆ کەسانی تر

---

۱۳ یۆهان ڕیست(Johan Rest) لە ۸ مارسی ۱٦۰۷ز لە هامبۆرگ لە دایك بووە، لە ۳۱ ئابی ۱٦٦۷ز لە هولشتاین لە تەمەنی شەست سالێدا کۆچی دوایی کردووە.کوڕی گەورەی یەکێك لە قەشە گەورەکانی مەزهەبی پرۆتستانت بووە. وانەی سەرەتایی لای باوکی خوێندووە و دواتر چۆتە قوتابخانەی ناوەندی لە هامبۆرگ.لە سالی ۱٦۲٦ز لە زانکۆی ڕوستۆك(University of Rostock) وانەی لاهوتی خوێندووەو بە مەبەسەتی تەواوکردنی خوێندن لە سالی ۱٦۲۹زدا پەیوەندی بە زانکۆی ڕینتلن( University of Rinteln)کردووە.دواتر گەڕاوەتەوە بۆ هامبۆرگ و دەستی کردووە بە نوسین و بلآوکردنەوەی

خۆش کرد چەندین گۆڤاری تر لە سەر تاسەری ئەورووپا چاپ و بڵاوبکەنەوە. هەر لەو سەردەمەداو لە ساڵی ١٦٧٢ز ژان دونو دو ڤیزێ[14](Jean Donneau de Visé) ی فەرەنسی یەکەم گۆڤاری بۆ رابواردن و کات بەسەر بردن چاپ و بڵاوکردەوە کە ناوەرۆکەکەی کورتە چیرۆك و هەواڵ و هۆنراوەو کەلەپووری میبلی سەرنج ڕاکێشی لەخۆگرتبوو. لە سەدەی هەژدەهەم چەند گۆڕانکاریەکی گرنگ بەسەر گۆڤار و شێوەی گۆڤار و ژمارەی خوێنەری گۆڤار هات لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششی بێ وچان بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری و بڵاوبوونەوە و گەشەسەندنی خوێندنەوەو نووسین لە نێوان ئافرەتاندا کە بووە هۆی زیادبوونی ژمارەی خوێنەران و پەرەسەندنی بزووتنەوەی خوێندنەوەو نووسین بەگشتی. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا کۆمەڵێك گۆڤاری جۆراوجۆر چاپ و بڵاوکراوەتەوە کە گرنگیان بە چەند بوارێکی جیاجیای بازرگانی و وێنە گری و هەوڵنێری داوەو بەمەش کۆمەڵێك گۆڤاری تایبەت بەو بوارانە دەرکەوتوون وەك گۆڤاری تایبەت بە کاری بازرگانی و وینەگری و گۆڤاری هەواڵنامەیی و چەندین گۆڤاری تر کە لەو سەردەمەدا کۆنترۆڵی جیهانی بڵاوکردنەوەیان کردبوو. ساڵی ١٩٢٣ز یەکەم گۆڤاری هەواڵی چاپ و بڵاوکراوەتەوە کە گرنگی بە هەواڵی جیهانی داوە، دواتر کۆمەڵێك گۆڤاری تری هەواڵی تایبەت بە کۆکردنەوەی هەواڵە جیهانیەکان و بڵاوکردنەوەیان چاپ و بڵاوکرانەوە، هەر لەو سەردەمەدا جگە لە گۆڤاری هەواڵی کۆمەڵێك گۆڤاری تر بڵاوکراونەتەوە

---

شانۆنامەکانی،ساڵی ١٦٣٣ز دەبێت بە مامۆستا لە یەکێك لە دادگاکانی کەرتی هاینریش و ساڵی ١٦٣٥ز دەبێت بە کەشیش لە کەرتی هولشتاین. لەساڵی ١٦٥٣ لە لایەن ئیمپراتۆر فردیناندی سێیەم ( Ferdinand III) پلەی بەرز دەکریتەوە بۆ هەڵسەنگینەر و هەر لە هەمان ساڵدا دەبێت بە ئەندامی ئەنجومەنی کەنیسە.لە ساڵی ١٦٦٣ز ڕیست (Rest) بابەتەکانی بە شێوەی زنجیرە گفتوگۆی مانگانە بڵاودەکاتەوە و کە بریتین لە لە شەش بابەت: مەرەکەب، ژیانی وڵات،بەردی فەیلەسوف، تابلۆ، خوێندنەوەو نوسین،چاودێری مردن.دوای مردنیشی ئیراسمۆس فینکس(Erasmus Phoenix) ی هاوڕی ی بابەتی گفتوگۆکانی شەش مانگەی داهاتووی تەواو دەکات.

١٤ ژان دونو دو ڤیزێ (Jean Donneau de Visé) ساڵی ١٦٣٦ز لە پاریس (Paris) لە دایك بووە. ڕۆژنامەنووس و شانۆنامەنووسێکی بەناونگی سەدەی شازدەهەم بووە لە فەرەنسا و مێژوو نووسی تایبەتی پاشا بووە.یەکێك بووە لەو کەسانەی هەوڵی نوسینی ڕۆمانی داوەو ساڵی ١٦٦٩ز کۆمەڵێك کورتە ڕۆمانی بڵاوکردۆتەوە.لە بزوتنەوەی ڕۆژنامەگەریدا ڕۆڵی پێشەنگایەتی بینیووە و چەندین دەزگاو دامەزراوەی ئەدەبی و ڕۆژنامەگەری دامەزراندووە. ساڵی ١٧١٠ز کۆچی دوایی کردووە (Dandrey,١٩٩٦).

که گرنگیان به وێنه هەواڵ و چیرۆکی وێنەدار و بابەتی میللی داوە. لە سەدەی بیست و یەکەمدا رۆژنامەگەری پێی نایە قۆناغێکی پێشکەوتووتری نوێ، بە هۆی دەرکەوتنی تەکنەلۆژیای ئەنتەرنێت و کاریگەرییەکانی لەسەر بوارەکانی چاپکردن و گۆڤار و کەرەستەو ئامرازی راگەیاندنی کاغەزی بە گشتی، چەند گۆڕاناکارییەك بەسەر پێکهاتەو ناوەڕۆکی گۆڤارەکان و شێوازی چاپکردن و بڵاوکردنەوە و گەیاندنیان بە خوێنەر هات.

گۆڤارەکان(Journals)جۆراوجۆرن و هەر جۆریکیان چەندین تایبەتمەندیەکی هەیە کە بە هۆیانەوە دەناسرێتەوەو لە بڵاوکراوەکانی تر جیا دەکرێتەوە، بەڵام دەشێت بە شێوەیەکی گشتی تایبەتمەندی گۆڤارەکان لە چەند خاڵێکدا چڕ بکرێتەوە:

- هەندێ لە گۆڤارەکان زانیاری گشتی دەربارەی بابەتی جۆراوجۆر پێشکەش بە جەماوەری خوێنەر دەکەن، وەك گۆڤارە گشتی و میللییەکان.
- گۆڤارە تایبەتەکان کۆمەڵێك بابەتی پەیوەست بە پسپۆری و تایبەتمەندی ڕشتەیەك لە ڕشتە ئەدبی و زانستیەکان پێشکەش دەکەن. بۆ نموونە گۆڤارە زانستیەکان تایبەتن بە شیکردنەوەی وردی راپۆرت و بابەتە زانستیەکان، گۆڤارە بازرگانیەکان تایبەت بە هەواڵی بازرگانی و پیشەسازی و بەرهەمی نوێ، گۆڤارە دەروونیەکانیش تایبەت بە بڵاوکردنەوەی وتار و تیۆر و توێژینەوە دەروونیەکان.
- ناوەڕۆکی گۆڤارەکان و وتوێژ و چاوپێکەوتنی جۆراوجۆر لە دەگرێت، زۆربەی وتاری گۆڤارەکانیش لەلایەن دەستەی نوسەرانی گۆڤار یان نوسەر و ڕۆژنامە نووسانی تر دەنوسرێت.
- گۆڤارەکان بە گشتی ڕەنگین و لاپەڕەکانیان ڕەنگاورەنگە کە بە هۆیەوە سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشن، هەمیشە لە نێو ناوەڕۆکی گۆڤارەکاندا کۆمەڵێك وێنە بۆ ڕوونکردنەوەو گوزارشت کردن لە بابەتەکان بڵاودەکرێتەوە(خضر، ٢٠١٧).

## ١١. ١ –جۆرەكانى گۆڤار The types of of journals

گۆڤار(Journal)بە شێوە فراوانەكەی چەندین جۆری جیاجیای هەیە، جگە لە گۆڤاری زانستی، ڕۆژنامە و هەواڵنامەو گەشتنامەو بیرەوەری وچەندین بڵاوكراوەی تردەگرێتەوە، هەر گۆڤارێكیش ئاراستەو ئامانجی تایبەت بە خۆی هەیە لە مامەڵە كردن لەگەڵ بابەت یان چالاكیەكی پیشەیی و زانستی دیاركراودا. گرنگترین جۆری گۆڤارەكانیش بریتین لە:

### ١١. ١. ١–گۆڤارە گشتیەكان General journals

گۆڤارە گشتیەكان(General journals) بریتین لەو گۆڤارانەی كە پەیوەستن بە بڵاوكردنەوەو پێشكەشكردنی زانیاری گشتی بە جەماوەری خوێنەر، وەك زۆربەی ئەو گۆڤارانەی كە دەزگاو دامەزراوە ڕۆشنبیری و كەلتووری وپیشەیی و جەماوەریەكان دەریان دەكەن.

### ١١. ١. ٢–گۆڤارە بازرگانیەكان Commercial journals

گۆڤارە بازرگانیەكان(Commercial journals) بریتین لەو گۆڤارانەی كە پەیوەستن بە بڵاوكردنەوەی زانیاری بازرگانی و پیشەسازی و گەشتیاری كە لە زۆربەی كاتدا ئامانجیان قازانج و لە لایەن چەند ناوەندێكی بازرگانی و پیشەسازی و گەشتیاری پشتگیری دەكرێن. جگە لەوانە چەنیدن گۆڤاری تری ئەدەبی و زانستی كە لە لایەن هەندی ناوەندی ئەدەبی و زانستی دەردەكرێن ئامانج لە بڵاوكردنەوەیان قازانجی داراییە بۆ ئەوانیش بە گۆڤاری بارزرگانی ئەژماردەكرێن.

### ١١. ١. ٣–گۆڤارە ئەدەبیەكان Literary journals

گۆڤارە ئەدەبیەكان(Literary journals) بریتین لەو گۆڤارانەی تایبەتن بە بڵاوكردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی وەك شیعر و پەخشان و ڕەخنە و لێكۆلینەوەی ئەدەبی. بەشیك لەو گۆڤارانە دەچنە خانەی گۆڤاری ئەكادیمی و بابەتەكانیان لە لایەن پسپۆر و هەڵسەنگینەری ئەدەبیەوە پشت ڕاست كراوەتەوە. بەشێكی تریان مەرجی گۆڤاری ئەكادیمیان تیدا نیەو لە بڵاوكردنەوەی بابەتدا خۆیان نابەستنەوە بە پێوەرە ئەكادیمەیەكان.

### ١١. ١. ٤-گۆڤاره زانستیەکان Scientific journals

گۆڤاره زانستیەکان(Scientific journals)بریتین لەو گۆڤارنەی تایبەتن بە بڵاوکردنەوەی بابەتی زانستی وەك وتار و لێکولینەوەو تویژینەوەی زانستی. ئەم گۆڤارنەش دوو جۆرن:جۆری یەکەمیان گۆڤاری زانستی دان پێدا نراون و بابەتەکانیان پیش بلاوکردنەوە لە لایەن پسپۆر و هەڵسەنگینەری زانسیتیەوە هەلسەنگێندراوەو بریاریان لەسەر دراوە. جۆری دووەمیان ئەو گۆڤارانەن کە بابەتی زانستی تایبەت یان هەمەجۆر بلاودەکەنەوە بەلام پەیوەست نین بە پرۆسەی هەڵسەنگاندن و نرخاندنی بابەتەکان، بەڵکو زیاتر پەیوەستن بە بڵاوکردنەوە نەك پێداچوونەوەو نرخاندنی بابەتەکان پێش بڵاوکردنەوەیان، بۆیە بە گۆڤاری ئەکادیمی ئەژمار ناکرێن.

### ١١. ١. ٥-گۆڤاره ئەکادیمەیەکان Academic journals

گۆڤاره ئەکادیمەیەکان (Academic journals)بریتین لەو گۆڤارنەی تایبەتن بە بڵاوکردنەوەی بابەتی جۆراوجۆری وەك وتار و لێکۆلینەوەو رەخنەو هەڵسەنگاندن وتوێژینەوەی زانستی لە بواری ئەکادیمیدا. بە شێوەیەکی گشتی ئەم گۆڤارانە تایبەتن بە رشتەیەکی دیاریکراو، وەك گۆڤاره ئەکادیمیەکانی تایبەت بە دەروونزانی یان کۆمەڵزانی و پزیشکی و بایۆلۆژی و بواره زانستی ئەدەبیەکانی تر. ئامانجی بڵاوکردنەوەی لەم گۆڤارانە بە پلەی یەکەم بەرەوەپێش بردنی بواره زانستی و ئەدەبیەکەیە نەك قازانج و بەدەست هێنانی پارەو هەر بابەتێکیش پێش بڵاوکردنەوە بە چەند فلتەری زانستی وپرۆسیسی پێداچوونەوەو نرخاندندا تێپەڕ دەبێت ئینجا بڕیاری بڵاوکردنەوە یان بڵاونەکردنەوەی لەسەر دەدرێت.

### ١١. ١. ٦-گۆڤاره ئەلکترۆنیەکان Electronic journals

گۆڤاره ئەلکترۆنیەکان(Electronic journals)بریتین لەو گۆڤارانەی کە لە سەر تۆڕەکانی ئەنتەرنێتدا بڵاودەکرێنەوەو کۆمەڵێك بابەتی هەمە جۆری وەك وتار و توێژینەوە و لێکۆلینەوەی رەخنەگرانەو هەڵسەنگاندنی ئەدەبی و زانستیان لە خۆگرتووەو لە سەرجەم بواره جیاجیاکاندا پەخش و بڵاودەکرێنەوە. ئامانجی گۆڤاره ئەلکترۆنیەکان خزمەتکردنە بە بوارێکی دیارکراو یان پاڵپشتی کردن و بازاڕ پەیداکردنە بۆ پرۆژەیەکی دیارکراو و کە بە شێوەی مانگانە یان وەرزانە لە رێگەی تۆڕی ئەنتەرنێت لە ماڵپەرە ئەدەبی و زانستیەکان پەخش و بڵاو دەکرێنەوەو کەبە

شێوەیەکی گشتی دوو جۆرن: جۆری یەکەمیان گۆڤاری ئەکادیمین(Academic journals) کە لەلایەن زانکۆ و دامەزراوەو کۆمەڵەی زانستی و ئەکادیمیەوە دەردەچن و پەیوەستن بە بڵاو کردنەوەی توێژینەوەو بابەتی ئەکادیمی لە ژێر چەندین یاساو ڕێساو ڕێ وشوێنی توندی زانستی بە شێوەیەك هەر بابەت یان توێژینەوەیەك پێش بڵاوکردنەوە بۆ چەندین جار بە پرۆسەی پێداچوونەوە و هەڵدەسەنگاندندا تێپەڕ دەبێت ئینجا بڕیاری بڵاوکردنەوە یان بلاونەکردنەوەی لە گۆڤارەکەدا لەسەر دەدرێت. بەڵام جۆری دوومیان گۆڤاری بازرگانین (Commercial journals) کە بە پلەی یەکەم ئامانجیان قازانج و دەستکەوتی داراییە بۆ ئەو دەزگایانەی کاری بۆ دەکەن و پشتگیریان دەکات. لە لایەکی تر لە ڕووی دیزایین و شێوازی کارکردنیشەوە دوو جۆرن، بەشێك لەو گۆڤارانە هەمان ستایل و دیزایینی گۆڤاری چاپکراویان هەیە، وەك سەرنووسەر و دەستەی نوسەران و مەرج و شێوازی بڵاوکردنەوەو گرنگیدان بە بوارێکی دیاریکراو لە بڵاوکردنەوەدا. بەشێکی تریان بە بەکارهێنانی بەرزترین ئاستی تەکنەلۆژیای زانیاری لە چواچێوە وقالبێکی ئەلکترۆنی داڕێژراون، وەك ناوەڕۆك و بابەتەکانی و ڕێگاکانی گەڕان و گەیشتن بە بابەتەکان و کارلێکی گۆڤار لەگەڵ خوێنەر و کۆمەڵێك تایبەتمەندی ئەلکترۆنی تر.




شێوە(٢. ١٠)هەردوو جۆری گۆڤاری ئەلکترۆنیەکان دەخاتەڕوو

## دەستپاکی ئەکادیمی Academic Integrity

دەستپاکی ئەکادیمی(Academic Integrity) بریتیە لە کۆمەڵێك بەهاو پێوەری ڕەفتاری فەرمی و نافەرمی لە چوارچێوەیەکی مۆڕالیدا بە مەبەستی داننان بە مافی خاوەندارێتی فیکری و ڕۆشنبیری نوسەران و توێژەرەان و پاراستنی بەرهەمەکانیان لە هەر جۆرە دەست درێژی و ناپاکیەکی ئەکادیمیدا، سیستمێکی مۆڕالیە بۆ ڕێکستنی ژیان و شێوازی کارکردن و ڕەفتاری توێژەر و مامۆستاو قوتابی و فەرمانبەر و کارمەندانی دەزگاو دامەزراوە زانستی و خزمەتگوزاریەکان، لە هەمان کاتدا پێوەرێکی زانستیشە بۆ هەڵسەنگاندنی زانکۆ و ناوەندە زانستیەکان و هۆکار ومەرجی سەرەکی سەرکەوتن و پێشکەوتنە لە هەر دەزگاو دامەزراوەیەکی زانستی وئەدەبی و ئەکادیمی و کارگێڕی و پیشەییدا.

دەستپاکی ئەکادیمی(Academic Integrity) دیاردەیەکی ژیارییە بوون وگەشەسەندنی پەیوەستە بە گەشەسەندن و پێشکەوتنی کۆمەڵگا لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا، هیچ ولاتێك بە بێ بوونی چواچێوەیەکی مۆڕاڵی چاودێر بەسەر ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری پێش ناکەوێت، نەبوونی دەستپاکی لە هەر ولاتێکدا دەبێتە هۆی دواکەوتوویی و پاشاگەردانی و تێکچوونی بنچینەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری وڵاتەکە، بێگومان نەبوونی سیستمێکی دەسپاکی ئەکادیمیش لە هەر کۆمەڵگایەکدا بۆ کە چاودێر بێت بەسەر ڕەوشی زانستی و ئەکادیمی و کۆنترۆڵی باری ڕۆشنبیری و زانستی کۆمەڵگاکەی کردبێت هۆکار دەبێت بۆ دروست بوونی فێڵ و تەڵەکەبازی لە نووسین و دزین و دەست درێژی کردنە سەر مافی کەسانی تر. بۆیە بوونی سیستمێکی دەستپاکی ئەکادیمی چاودێر بەسەر ڕەوشی زانستی وئەکادیمی مەرجی یەکەمی پاکی و وپێشکەوتنی هەر کۆمەڵگایەکە، چونکە باری ڕۆشنبیری و زانستی و ئەکادیمی هەر کۆمەڵگایەك کاریگەری ڕاستەوخۆی بەسەر سەرجەم لایەنەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری کۆمەلگاکە هەیە.

دەسپاکی ئەکادیمی (Academic Integrity) بریتیە لە پابەندبوون بە ڕەفتاری ڕاستگۆیی و مۆڕاڵی لە کارکردن لە ژینگەی ئەکادیمی و زانستیدا، بۆیە بە بنەمای سەرەکی سەرکەوتن و داهێنان و پێشکەوتن لە کاری زانستی و ئەکادیمیدا دادەنرێت .

## ١-بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی he Principles of Academic Integrity

نووسینی ئەکادیمی ئەرك و بەرپرسیارێتیەکی گەورەی سەرشانی توێژەران و نوسەرانە، ئەم بەرپرسیارێتیە ناچاریان دەکات پابەند بن بە چوارچێوەیەکی مۆراڵی لە نووسیندا کە چەند پرەنسیپێکی لە خۆگرتووە، وەك:

١. ١-دیاریکردنی سەرچاوەو و ئاماژەردن بە سەرجەم برگەو بیرۆکەی بەکارهاتوولە نووسیندا ، وەك وەرگرتنی پەرەگرافیك وەکوی خۆی لە توێژینەوەیەکی بلاْوکراوە یان بلاْو نەکراوەدا، یاخود وەرگرتن لە کتێب یان سەرچاوەی ئەلکترۆنی و زارەکی و ئاماژەکردن بە خاوەنەکانیان لەناو ناوەرۆك و لیستی سەرچاوەکاندا.

١. ٢-درککردن بەوەی ئاماژەدانی تەواو بە سەرچاوەی بەکارهاتوو لە نووسیندا لاوازی و بێ توانایی نوسەر ناگەیەنێت ، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەم خۆی و هەم بابەتەکە بەهێز دەکات.

١. ٣-هەستکردن بەوەی گرنگترین خاڵی بەهێز لە هەر نووسینیکدا ئاماژە کردنە بە سەرچاوەی بەکارهاتوو چ لەناو ناوەرۆك و یان لە لیستی سەچاوەکاندا، لاوازترین خاڵیش بەکارهێنانی نووسینی کەسانی ترە بە بێ ئاماژە کردن بە خاوەنەکانیان .

١. ٤-هەستکردن بەوەی لاسایکردنەوە لەسەرەتای کاری نووسین و توێژینەوەکاریدا شتێکی ئاساییە، بەلاْم بەردەوامی دۆخی لاسایکردنەوەکە نوسەر بەرەو گزیکردنی زانستی دەبات.

١. ٥-هەستکردن بەوەی نووسین و توێژینەوەکاری بە رێگەی گزیکردن و پشت بەستن بە بیرۆکە و زانیاری کەسانی تر ئاستی ڕاستەقینەی دەستکەوت ناهێنێتەدی.

١. ٦-درککردنکردن بەوەی دەستپاکی لە نووسیندا بە ر لە هەر شتێك شانازیەکی گەورەیەو هەستی ڕەزامەندی لە کارەکە لای تاك دروست دەکات، بە پێچەوانەشەوە مرۆڤ لە ناپاکیدا هەست بە شانازی و ڕەزامەندی ناکات.

١. ٧-دركككردن بەوەی دەست بردن بۆ ناپاكی ئەكادیمی لە كاری نووسیندا نەك تەنها كاریگەری دەبێت بەسەر بەهای ئەكادیمی و پێگەی زانستی كەسەكە، بەڵكو كاریگەریشی دەبێت بە سەر ئەو بەشە زانستیەی كاری تێدا دەكات وئەو ستافە ئەكادیمیەش كە كاریان لەگەڵ دەكات.

١. ٨-تێگەیشتن لەوەی دەست بردن بۆ هەر شێوازێك لە شێوازەكانی ناپاكی ئەكادیمی وەك فرو فێل و گزیكردن و بەكارهێنانی بیرۆكەو ئاماژەنەكردن بە سەرچاوەكانیان بە ڕوونی و ئاسنكاری بۆ ئەم جۆرە ناپاكیانە ڕەفتاریكی ناسروشتی و نامۆراڵیەو دەچێتە خانەی تاوانی گەورەو مرۆڤ ڕووبەرووی لێپرسینەوەو سزای یاسایی دەكات.




شێوە(٣. ١)بنەماكانی دەسپاكی ئەكادیمی دەخاتەڕوو

## ٢–ناپاكی ئەكادیمی Academic Dishonesty

ناپاكی ئەكادیمی (Academic Dishonesty) بە مانا فراوانەكەی چەمكێكە سەرجەم ناپاكی و پێشلكاریەكان لە خۆ دەگرێت كە لە زانكۆ و ناوەندە زانستی و ئەكادیمیەكان ئەنجام دەدرێت، وەك فێڵكردن وگزیكردن و دزینی بەرهەم و كۆششی كەسانی تر و هەر كردەوەیەكی نەشیاو دیكەی كە پەیوەندی بە پەیوەندی بە ژیانی ئەكادیمی و پێشێلكردنی یاساو رێسافەرمیە ئەكادیمیەكانەوە هەبێت. بەڵام مەبەست لە ناپاكی ئەكادیمی لێرەدا گزیكردنی زانستی (plagiarism) و ناپاكی كردنە لە بواری نووسینی ئەكادیمیدا.

زۆربەی خەڵكی لەو باوەڕدان گزیكردن كۆپیكردن و وەرگرتنی بیرۆكەو نووسینی كەسانی تر بێت، بەڵام لە ڕاستیدا بەكارهێنانی دەستەواژەكانی كۆپیكردن و وەرگرتن بۆ كردەوەكە شیاو نیەو لە قەبارەو مەترسی تاوانەكە كەم دەكاتەوە، بۆیە لە ڕوانگەی زۆربەی ناوەندە زانستی و ئەكادیمیەكان گزیكردن دزیكردنەو لە زۆربەی فەرهەنگە زانستیەكان بە دزی زانستی یان ئەدەبی پێناسەكراوە. لە لایەكی تر دیاردەی گزیكردن ناوی جۆراوجۆری لێ نراوە، وەك دزی فیكری و دزی ئەدەبی و گزیكردن و پێشیلكاری ئەكادیمی وفێڵی ئەكادیمی و چەندین ناوی تر، سەرجەم ئەم ناوانە گوزارشت لە تاوانیكی زانستی و هەڵەیەكی مۆراڵی گەورە دەكەن تیایدا كەسی گزیكەر هەموو سنوورەكانی دەستپاكی زانستی و ئەكادیمی دەشكێنێت.

وشەی گزیكردن لە زمانی كوردیدا لە بەرامبەر وشەی (plagiarism)ی ئینگلیزی بەكار دەهێنریت لە بنەڕەتدا لە وشەی لاتینی (Plagiarize) وەرگیراوە كە بە واتای ڕفاندن دێت، گزیكەریش كەسێكی دەست درێژكەر و ڕفێنەرە هەوڵی ڕفاندنی شتێك دەدات كە هی خۆی نیەو دەیبات بۆ خۆی، واتە ڕفێنەری وشەو بیرۆكەی كەسانی ترە. بەڵام گزیكردن لە پێناسەی تازەییدا واتە دزی ئەدەبی و بەكارهێنانی بەرهەمی فیكری كەسێك لە لایەن كەسێكی تر وەك ئەوەی بەرهەمی خۆی بێت (الخطيب، ٢٠٠٩).

لە فەرهەنگی میریام و ویبستر(Merriam-Webster) پێناسەی گزیكردنی زانستی كراوە بەوەی بریتیە لە دزیكردن و پێشیلكردنی مافی خاوەندارێتی فیكری كەسانی تر و بەكارهێنانی بەرهەمی فیكری كەسانی تر بە بێ ئاماژەكردن بە سەرچاوەكانیان(-Plagiarize. Merriam

گزیکردن (Fine Dictionay) لە فەرهەنگی .(Webster,www. merriam-webster. com واتا کارکردنە لەسەر دزیکردن، کاتێك کەسێك وشەو بیرۆکەی کەسێکی تر دەبات و دەیکات بە هی خۆی، یان بەشێك لە نووسینی کەسێکی تر کۆپی دەکات و بەناوی خۆی بلاوی دەکاتەوە بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەکەی( Plagiarism. Fine Dictoinary,http:// www. .(finedictionary. com لە فەرهەنگی تێك تێرمس (Tech Terms) دا گزیکردنی زانستی بریتیە لە کۆپی کردنی کاری کەسێك لە لایەن کەسێکی تر و بلاوکردنەوەی بە ناوی خۆی Plagiarism is the act of copying someone else's work and publishing it as ) Plagiarism. The Techterms Computer Dictionary,https:// )(your own .(techterms. com لە فەرهەنگی کۆلنز (Collins Dictionary) گزیکردن بریتیە لە بەکار هێنان و کۆپی کردنی بیرۆکە یان کاری کەسێك و نیشاندانی بەوەی کە بیرۆکەی خۆتە یان خۆت ئەنجامت داوە. لە پێناسەیەکی تردا گزیکردن بریتیە لە بیرۆکە یان نووسین یان مۆزیك کە بەدزیەوە لە نێو کاری کەسێکی تردا کۆپی کراوە( Plagiarism,Collins English .(Dictionary,www. collinsdictionary. com هەروەها لە فەرهەنگی لاڕوسی فەڕەنسی (Dictionnaire de français Larousse)دا هاتووە گزیکردنی زانستی بریتیە لە وەرگرتن لە کاری کەسێکی تر لە پڕۆژەیەکی ئەدەبی یان هونەریدا ( Plagiat . Dictionnaire de .(français Larousse ,www. larousse. fr

لەژێر ڕۆشنایی کۆی پێناسەو ڕاوبۆچوونەکان دەربارەی دیاردەکە، گزیکردنی زانستی یان دزی ئەدەبی فێڵکردن و دزینی بەرهەمی فیکری و عەقڵی کەسانی ترە بە بێ ئاماژە کردن بە سەرچاوەکانیان، هەوڵێکی مەبەستدار یان بێ مەبەستە تیایدا کەسێك بەرهەمی ڕەنج و ماندوبوونی کەسێکی تر دەبات و دەیکات بە هی خۆی. بەو مانایە گزیکردن واتا دزیکردن و کەسی گزیکاریش دزەو جۆری دزییەکەشی ناشیرنترین جۆری دزیکردنە، چونکە لە لایەك بەرهەمی کاری کەسانی تر دەدزێت و لە لایەکی تر دەیکات بە هی خۆی و بە ناوی خۆیەوە بلاوی دەکاتەوە. وەك ئەوەی لە فەرهەنگی چێمبرس(Chambers)دا هاتووەو دەڵێت:گزیکاری زانستی کەسێکە بیرۆکەو نووسینی کەسانی تر دەدزێت و بە ناوی خۆیەوە پێشکەشیان دەکات، ئامانجی سەرکەیش لە کردەوەکەیدا هێنانەدی بەرژەوەندی کەسی و دەستکەوتنی و بڕێك پارەیە (Plagiarism. Chambers,www. chambers. co. uk).

## ٣- گزیکردن لە ڕوانگەی زانکۆ و ناوەندە ئەکادیمیەکان Plagiarism from the point of view of universities and academic institutions

ئەنجامدانی گزیکردن(plagiarism) و هەر جۆرە ناپاکیەکی ئەکادیمی لەسەرجەم زانکۆ و ناوەندە ئەکادیمیەکانی جیهاندا بە تاوان دانراوەو ئەنجامدەرانیشی وەك تاوانبارو پێشیلکاری مافی کەسانی تر ئەژمار کراون، بۆ ڕیگری کردن لە دیاردەکەش چەندین ڕیگاو شیوازی جیازیان داهێناوەو چەندین یاسایان بۆ سزادانی ئەنجامەدەرانی گزیکردن داناوە کە بە ئاگادارکردنەوە دەست پێ دەکات تا سزای دارایی و دەرکردن و بەندکردن لە زینداندا، ئەمانەی خوارەوە نموونەی ڕاوسەرنجی دیاترین و بەناوبانگترین زانکۆ و ناوەندە ئەکادیمیەکانی جیهانن دەبارەی دیارەی گزیکردن.

### ٣. ١- زانکۆی ئۆکسفۆرد University of Oxford

لە ڕوانگەی زانکۆی ئۆکسفۆرد(University of Oxford) گزیکردن خستنەڕووی بیرۆکە یان کاری کەسێکە لە لایەن کەسیکی تر وەك کاری تایبەتی خۆی لە ڕێگەی تێکەڵ کردن بە کاری خۆیەوە بە بێ ڕەزامەندی کەسەکەو بێ بڕیار لەسەردان. ئەم پێناسەیەش سەرجەم بەرهەمی چاپکراو چاپ نەکراو دەگرێتەوە چ دەستنوس یان بلأوکراوە یان ئەلکترۆنی بێت، چ بە مەبەست یان بێ مەبەست بیت ( Plagiarism. University of Oxford,www. ox. ac. uk).

### ٣. ٢- زانکۆی کو لوڤێن Katholieke Universiteit Leuven

لە ڕوانگەی زانکۆی کو لوڤێن(Katholiekc Universiteit Leuven) کە یەکێکە لەو دامەزراوە زانستی و پەروەردییانەی ناوبانگێکی نێودەوڵەتی لە دەستپاکی ئەکادیمیدا هەیە ، گزیکردن بریتیە لە کۆپیکردنی کاری کەسانی تر، وەك بیرۆکەو نووسین و پێکهاتەو دیزاین و وێنەو پلان و کۆد و بەرهەمی نوسراو بە بێ گەڕانەوە بۆ سەرچاوەو ئاماژەیەکی ڕوون و ئاشکرا بە ڕاست و دروستی سەرچاوەکان و چۆنیەتی سوود لێ وەرگرتنیان ( Definition of plagiarism. KU Leuven Education,www. kuleuven. be).

### ٣. ٣-زانكۆی كۆرنيل Cornell University

له ڕوانگەی زانكۆی كوڕنيل (Cornell University) گزيكردن واته بەكارهێنانی وشەو بيرۆكەی كەسانی تر وەك ئەوەی وشەو بيرۆكەی خۆيان بێت بە بێ ئاماژەكردن بە خاوەندارێتی كەسەكان. هەروەها بە بڕوای ئەو زانكۆیە گزيكردنی زانستی زۆرترين پشك و بەشداری لە شكاندن و پێشێلكردنی بنەماكانی دەستپاكی ئەكاديميدا هەيە( Recognizing and Avoiding Plagiarism. Cornell).

### ٣. ٤- زانكۆی كۆنكۆرديا Concordia University

له ڕوانگەی زانكۆی كۆنكۆرديا (Concordia University) گزيكردن واته كۆپيكردنی بابەتی كەسانی تر چ لە شێوەی وەرگرتنی تەواو يان دوبارە دارشتنەوە بێت، وەك وەرگرتن و كۆپی كردن لە كتێب و سايتی ئەلكترۆنی و خولەكانی ڕاهێنان و ڕاپۆرتی تاقيكاری و كاری هونەری و وەرگرتنی زارەكی. ئەمەش بە تەنها نووسين ناگرێتەوە، بەڵكو وێنەو گرافيك و خشتەو خەوارزميات و هەر ئامارزێكی تر دەگرێتەوە، تەنانەت وەرگێرانيش لە زمانێك بۆ زمانێكی تر كە بە بێ گەڕانەوەو ئاماژەدان بە سەرچاوەكەی بە گزيكردن و ناپاكی ئەكاديمی ئەژماردەكرێت (What is plagiarism? University Concordia, www. concordia. ca).

### ٣. ٥-زانكۆی مەيين University of Maine

له ڕوانگەی زانكۆی مەيين (University of Maine) گزيكردن بريتيە لە خستنەڕووی بيرۆكەو وشە وێنەو كار و داهێنانی كەسانی تر لە لايەن كەسێك وەك كاری خۆی بە بێ ئاماژەكرن بە سەرچاوەو مافی خاوەندارێتی خاوەنەكانيان. هەروەها ئەم زانكۆیە گزيكردن بە تاوانێكی گەورە دادەنێت تەنانەت ئەگەر بی مەبەستيش ئەنجام درابێت ( Plagiarism Tutorial. University of Maine. Farmington,www. plagiarism. umf. maine. edu).

### ٣. ٦-ئينستيتۆی زمانی ئينيگليزی English Language Institute

ئينستيتۆی زمانی ئينيگليزی(English Language Institute)كە پەيمانگايەكی نێودەوڵەتيە بۆ پەرەپيدانی زمانی ئينگليزی لەسەر ئاستێكی بالا، گزيكردنی زانستی بە شێوازێك لە شێوازەكانی فێڵكردن دادەنێت كە تيايدا كەسی گزيكەر پشت دەبەستێت بە خستنەڕووی كاری كەسانی تر بە بێ دانان بە سەرچاوەكەكانی. هەروەها پێی وايە نوسەران و توێژەرانی

تازە لەسەرشانی نوسەرانی پێشوو وەستاون، بۆیە ئەرکێکی پێویستە لە کاتی سوود وەرگرتن لە بەرهەم و داهێنانەکانیان ئاماژە بە سەرچاوەکانیان بکرێت و مافی خاوەندارێتی بەرهەمی فیکری و عەقڵیان یان پێشیل نەکرێت. (What is Plagiarism? English Language Institute, www. guides. lib. umich. edu).

### ٣. ٧-زانکۆی ئۆنژێ Université Angers

لە ڕوانگەی زانکۆی ئۆنژێ (Université Angers) گزیکردن بریتیە لە وەرگرتنی بیرۆکەو وشەی کەسانی تر لە لایەن کەسێك وەك ئەوەی بیرۆکەو وشەی خۆی بێت. ڕەنگە کردەوەکە مەبەستدار یا بیٚ مەبەست بێت، بەلاٚم لە ژێر هەر بارودۆخێدا ڕوو بدات شوێنێکی لە نووسینی ئەکادیمیدا نیە (Plagiat . C'est quoi le plagiat ? , Université Angers, www. univ-angers. fr).

### ٣. ٨- زانکۆی نەمیور Université de Namur

لە ڕوانگەی زانکۆی نەمیور(Université de Namur) گزیکردن بریتیە لە کۆپیکردنی کاری کەسانی تر بە بیٚ گەڕانەوەو ئاماژەکردن بە سەرچاوەکانیان، ئەم کردەوەیەش چ مەبەستدا یان بیٚ مەبەست بێت بە فیلٚ و دزی ساختەکاری لە قەڵەم دەدرێت( Plagiat. Définition du plagiat, Université de Namur, www. unamur. be).

### ٣. ٩-زانکۆی دیکارت لە پاریس Université Paris Descartes

زانکۆی دیکارت لە پاریس (Université Paris Descartes) ئاماژەنەکردنی ڕوون و تەواو بەسەرچاوەی بەکارهاتوو لە نووسیندا بە گزیکردن و تاوانێکی گەورە دەزانێت، لە ڕوانگەی ئەو زانکۆیە نووسینی ئەکادیمی پێویستە پشت بە سەرچاوەی زانستی دیار و باوەڕپێکراو ببەستێت نەك سەرچاوەی لاوەکی کە هەوڵی گزیکردن ئاسان دەکات و کەسی گزیکەر بە ئاسانی دەتوانیٚ دەستی پیٚ بگات. ئەو زانکۆیە یەکێك لەو ناوەندە زانستیانەیە کە پرۆگرامی تایبەتیان بۆ دەرخستن و ئاشکراکردنی دیاردەی گزیکردن هەیە ( Éviter le plagiat. Université Paris Descartes,www. parisdescartes. libguides. com).

### ٣. ١٠- ئەنیستیتۆی سێژێپ Cégep Saint-Jean-sur-Richelieu

لە ڕوانگەی ئەنیستیتۆی سێژێپ (Cégep Saint-Jean-sur-Richelieu) گزیکردنی زانستی بریتیە لە خواستن و وەرگرتنی بەرهەمی کەسانی تر بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەکانیان، ئەم بابەتەش بە تەنها پەیوەست نیە بە مافی نوسن و بڵاوکردنەوە، بەڵکو پەیوەستە بە ڕاستگۆیی فیکریشەوە. بۆیە دیاردەی گزیکردن بە هەر شێوازێك ڕوو بدات هەڵەیەکی گەورەی ئەکادیمیەو هیچ پاساوێکی بۆ نیە ( Le plagiat et la fraude. Cégep Saint-Jean-sur-Richelieu, www. guidemethodologie. cstjean . qc. ca).

### ٣. ١١- زانکۆی گرینچ University of Greenwich

لە ڕوانگەی زانکۆی گرینچ(University of Greenwich) گزیکردن تاوانێکی گەورەیەو پێویستە ئەنجامدەرانی بە پێی یاسا سزا بدرێن، هەروەها سەبارەت بە جۆرو شێوازەکانی گزیکردن ئاماژە بە کۆمەڵێك کردار دەکات  کە دەچنە خانەی گزیکردنی زانستیەوە، وەك بەکارهێنان و سوود وەرگرتن لە بەرهەمی چاپکراو و بڵاوکراوە بە بێ گەڕانەوەو ئاماژەکردن بە سەرچاوەکانیان و کۆپیکردنی وتار لە بەرنامە فێرکاریەکان و هاوکاری و پشت بەستن بە کەسێکی تر لە کاتی ئەنجامدانی کارێك وخستنەڕووی کارەکە وەك کاری کەسی و  بەکارهێنانی پرۆگرامی ژمێرەیی و کەرەستەو ئامرازەکانی کەسێکی تر بە بێ مۆڵەت و گەڕانەوە بۆ کەسەکە و پێشکەشکردنی کاری کەسێك لە لایەن کەسێکی تر و بەکارهێنانی زانیاری و داتاو بەڵگەی ئاماری بڵاوکراوە لەسەر تۆری ئەنتەرنێت کە دان پێدانراونین و کڕینی بابەت و کۆپیکردنی دەرنجامی کاری کەسانی تر و گۆڕین و دەستکاریکردنی دەرەنجامەکان وپێشکەشکردنی وتاری کەسانی تر و کڕینی دەق لە سایتە ئەلکترۆنیەکان و وەرگرتن و کۆپیکردن لە ئەنتەرنێت و سەرچاوەی تر بە بێ گەڕانەوەو ئاماژەکردنی  بە سەرچاوەکانیان و نووسینی دەقێك لە لایەن کەسێك و پێشکەشکردنی لە لایەن کەسێکی تر و دوبارە داڕشتنەوە بە مەبەستی پێکهینانی دەقێکی تازە بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەکان ( The little book of plagiarism,What it is and how to avoid it,www. hec. gov. pk).

## ٣.١٢- زانكۆی براتفۆرد University Of Bradford

زانكۆی براتفۆرد(University Of Bradford)ی بەریتانی گزیكردنی بە تاوانێكی گەورە داناوەو شێوازەكانی گزیكردنشی زانستی بە شەش جۆر دیاری كردووەو بریتین لە:

- **كۆپیكردنی ڕاستەوخۆ Direct copying**

تیایدا توێژەر پەنا دەباتەبەر كۆپیكردن و وەرگرتنی دەقی وشەكانی نووسینی توێژەرێكی تر چ لە كتێب یان گۆڤار یان سایتی ئەلكترۆنی و دەقی نووسینەكە وەك خۆی وەردەگرێت بە بێ گەڕانەوەو ئاماژەكردن بەسەرچاوەكانیان.

- **گۆڕینی وشەكان Word-switching**

تیایدا نوسەر یان توێژەر هەوڵی دەست بردن بۆ بەرهەمی كەسانی تر دەدات لە ڕێگەی لە ڕێگەی گۆڕینی وشەو دەستەواژەكان و دانانی وشەو دەستەواژەی هاو واتا لە شوێنیان بە بێ ئاماژەكردن بەوەی وشەو دەستەواژەی كەسێكی تری بەكارهێناوە.

- **گزیكردن لە ڕێگەی شاردنەوەی سەرچاوە Concealing sources**

تیایدا نوسەر پەنا دەباتە بەر وەرگرتنی بیرۆكەی كەسێكی تر بە بێ ئاماژەكردن بە سەرچاوەی بیرۆكەكە، یان بەكارهێنانی بیرۆكەكانی سەرچاوەیەك بۆ چەندین جار بە بێ بەكارهێنانی نیشانەكانی وەرگرتن بۆ هەموو جارێك كە بیرۆكەكانی بەكارهێناوە.

- **گزیكردن لە ڕێگەی كاركردن لەگەڵ فێرخوازانی تر Working with other students**

بە چەندین شێواز ئەنجام دەدرێت، وەك كۆپیكردنی كاری فێرخوازێك یان بەشێك لە نووسینی فێرخوازیك لە لایەن فێرخوازێكی تر و پێشكەشكردنی بە ناوی خۆی. یان بەشداریكردنی فێرخوازێك لەگەڵ فێرخوازێكی تر لە نووسینی بابەتێكدا و پێشكەش كردنی بابەتەكە بە ناوی یەك فێرخواز. یاخود یارمەتیدانی فێرخوازانی تر لە لایەن فێرخوازێك بۆ نووسین.

- گزیكردن له ڕێگەی كڕینی دەقی پێویست **Buying assignments**

وەك كڕینی دەقێك یان ڕاسپاردەیەك له كەسێكی تر لایەن فێرخوازێك كه به هەر هۆكارێكەوە بێت خۆی توانای نووسین و ئەنجامدانی ڕاسپاردەو كارەكانی نیه.

- گزیكردنی خودی و دووباره بەكارهێنانەوەی كارێك **Re-using your previous work**

بریتیه له سوود وەرگرتن له كارێك له لایەن كەسێك كه پێشتر خۆی ئەنجامی داوە، واته بەكارهێنان و سوود وەرگرتنی كەسێك له بەرهەمێكی پێشووتری خۆی به بێ ئاماژەكردن به سەرچاوە كۆنەكەی( .Academic integrity,Types of plagiarism (University Of Bradford, www. brad. ac. uk).

**٣. ١٢-زانكۆی سایمون فریزەر Simon Fraser University**

زانكۆی سایمون فریزەر (Simon Fraser University) گزیكردنی چ به مەبەست بێ یان بێ مەبەست به تاوانێكی گەورەی ئەكادیمی داناوەو شێوازەكانی گزیكردنیشی به سێ جۆر دیاری كردووە، جۆری یەكەمیان بریتیه له بەكارهینانی كاری كەسانی تر و سوود وەرگرتن له بەرهەمەكانیان، ئەم كردارەش هەندێ به بێ مۆڵەت و بێ ئاگاداری خاوەنی سەرچاوەكان ئەنجام دەدرێت، وەك بەكارهێنانی نووسینی كەسانی تر بێ ئاماژەكردن به سەرچاوەكانیان، بەڵام هەندێ جاری تر به ئاگاداری و به ڕێكەوتن لەگەڵ خاوەنی ڕەسەنی سەرچاوەكان ئەنجام دەدرێت، وەك كڕینی دەقێك له لایەن كەسێك له كەسێكی تر له بەرامبەر پێدانی بڕێك پارە، یان نووسینی دەقێك له لایەن كەسێك بۆ هاوڕێكەی به هۆی پەیوەندی نزیكایەتی و هاوڕێیەتی، یان كڕینی دەقێك له سایتێكی ئەلكترۆنی. جۆری دوومیان بریتیه له كۆپیكردنی ڕستەو برگەی ناو دەقی نووسینی كەسێكی تر به بێ ئاماژەكردن به سەرچاوەی دەقەكە، یان سوود وەرگرتن له كاری كەسانی تر به بێ ئاماژەكردنی ڕوون و تەواو به سەرچاوەكانیان، یان بەكارهینانی بیرۆكەو سوود وەرگرتن له شێوازی نووسینی نوسەرانی تر به بێ ئاماژەكردن به سەرچاوەی بیرۆكەو شێوازی بەكارهێنراو، یان بەكارهێنانی وێنەو گرافیك و داتای بەیانی كەسانی تر و وەرگێران له زمانی تر به بێ ئاماژەكردن بەسەرچاوەكانیان. بەڵام جۆری سێیەمیان بریتیه له له پاڕافرەیزكردن و دووباره داڕشتنەوەو كورتكردنەوەی زانیاریەكانی ناودەقێك به بێ ئاماژەكردن به سەرچاوەكە(SFU Library Plagiarism Tutorial,/www. lib. sfu. ca).

## ٤-جۆرو شێوازەکانی گزیکردن The Types of plagiarism

دیاردەی ناپاکی و گزیکردنی زانستی ڕیشەیەکی مێژوویی هەیەو مرۆڤ لە دێرزەمانەوە هەوڵی پێشیلکردنی مافی خاوەندارێتی و دزینی بەرهەمی فیکری کەسانی تری داوە، بەلاّم بە تێپەڕ بوونی کات و پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیا جۆری دزین فۆرمی تازەی وەرگرتووەو بە چەندین شێوەی جیاواز ئەنجام دراوە کە لە سەرجەمیاندا ئەوە بەدی دەکرێ کەسی نوسەر لە نووسینەکەیدا ئاماژەیەکی ڕوون و تەواوی بە سەرچاوەی زانیاریەکانی ناو بابەتەکە نەکردبێت.

سەبارەت بە جۆرو شیوازەکانی گزیکردن ، سایتی (Plagiarism Resource Site. CBB) لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئاماژەی بە چوار جۆر شێوازی گزیکردنی زانستی کردووە، شێوازی یەکەمیان گزیکردنی ڕاستەوخۆ(Direct Plagiarism)یە کە بریتیە لە کۆپیکردنی وشە بەرامبەر وشە لە بەشێکی کاری کەسێکدا لە لایەن کەسێکی تر بە بێ گەڕانەوەو ئاماژەکردنی تەواو بە سەرچاوەکە. شیوازی دووەمیان گزیکردنی خودی (Plagiarism –Self) یەو کاتێك ڕوو دەکات توێژەرێك بەرهەمێکی کۆنی خۆی وەك بەرهەمێکی تازە بناسێنی و پێشکەشی بکات، یان کاتێك لە کارە تازەکەیدا لە بەرهەمێکی پێشووتری خۆی بەکار دەهێنێت بە ئاماژەکردن بە سەرچاوە کۆنەکە و بە بێ مۆڵەتی سەرپەرشتیارانی توێژینەوەی پێشوو و مافی چاپ وخاوەندارێتی چاپکردن. شێوازی سێیەمیان گزیکردنی تێکەڵ( Mosaic Plagiarism)ەو کاتێك ڕوو دەدات توێژەر کۆمەڵێك دەستەواژە لە سەرچاوەیەك وەربگرێت بە بێ بەکارهێنانی نیشانەکانی وەرگرتن، یان گۆڕین و لابردنی هەندێ وشەو بەکارهێنانی وشەو زاراوەی تری هاو واتای وشەکان لەگەڵ مانەوەی هەمان پێکهاتەو شێوازی زمانەوانی دەقە ئەسڵیەکە. شێوازی چوارەمیشیان گزیکردنی بێ مەبەست ( Accidental Plagiarism)ەوکاتێك ڕوو دەدات توێژەر کەمتەرخەمی لە ئاماژەکردن بە هەندێ سەرچاوە دەکات و پشتگوێیان دەخات، یان بەکارهێنانی سەرچاوەو سوود وەرگرتن لێیان بە شێوەیەکی خراپ، یاخود دووبارە داڕشتنەوەی بڕگەیەك بە بێ مەبەست بە بەکارهێنانی وشەی هاوشێوە و بەکارهێنانی هەمان شێوازی زمان( Overview of Terms: The Common Types of Plagiarism,www. abacus. bates. edu) .

هەروەها سایتی (Turnitin) کە سایتێکی خزمەتگوزاری بازرگانی ئەلکترۆنیە بۆ ئاشکرا کردن و دەرخستنی گزیکردن ئاماژە بە بوونی دە شێوازی گزیکردن دەکات، وەك:

- لەبەر نووسینەوە(Clone): پێشکەشکردنی کۆی بەرهەمی کاری نوسەرانی تر لە لایەن نوسەرێك بە ناوی خۆیەوە.
- لەبەر گرتنەوە(Ctrl-c): وەرگرتنی چەند بەشێکی گەورە لە سەرچاوەیەکی دیاریکراو بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەکە.
- گۆڕین(Find-replace): دەستکاری کردنی دەقێك لە ڕێگەی گۆڕینی هەندی وشەو دەستەواژە بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەی دەقەکە.
- تێکەڵکردن(Remix):دوباری دارشتنەوەو ئاوێتەکردنی زانیاریەکان لە ڕێگەی کۆمەڵێك سەرچاوی جۆراوجۆر بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەکان.
- دوبارەکردنەوەی شتەکان (Recycle)دوبارە سوود وەرگرتن لەسەرچاوەیەکی کۆنی نوسەر خۆی و ئاماژەنەکردن بە سەرچاوەی پێشوو(گزیکردنی خودی).
- دوو ڕەگە(Hybrid) وەرگرتن لە چەند سەرچاوەیەکی جۆراوجۆر بە گۆڕانکارییەکی کەم لە پێناو دروستکردنی دەقێکی نوێ بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەکان.
- ئاوێتەکردن(Mashup):نوسراوێك کۆمەڵێك بابەتی وەرگیراو لە چەند سەرچاوەیەکی جۆراوجۆری لەخۆ گرتبێت بە بێ ئاماژەیەکی ڕوون بە سەرچاوەکان.
- هەڵەی(٤٠٤ error ٤٠٤):خستنەڕووی کۆمەڵێك زانیاری ناڕوشن کە لە سەرچاوە بەکارهاتووەکان بوونیان نەبێت.
- کۆکردنەوە(Aggregator):نوسراوێك لە کۆکردنەوەو وەرگرتنی زانیاریەکاندا ئاماژەی تەواو بە سەرچاوەی زانیاریەکان کراوە، بەڵام هیچ مەرجی ڕەسانایەتی تێدا نیە.
- دوبارە نووسینەوە(Rewrite): نوسراوێك تەنها پشتی بە زانیاری ناو سەرچاوەکان بەستووە بە بێ هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکی تازەو بەکارهێنانی سەرچاوەکان بە شێوازێکی ڕوون و ئاشکرا (Ten Types of Plagiarism,www. ed. ac. uk).

به شێوەیەکی گشتی گزیکردنی زانستی و ناپاکی لە کاری ئەکادیمیدا چەندین جۆرو شێوازی تری هەیە، دیارترینیان بریتین لە:

### ٤. ١–گزیکردنی تەواو Complete Plagiarism

ترسناکترین شێوازی گزیکردنە کاتێك نوسەر یان توێژەرێك دەقی کەسێکی تر دەبات و لەژێر ناوی خۆی بڵاوی دەکاتەوە، یان کەسێك دەقێك دەنوسێت و لە بەرامبەر بڕە پارەیەکدا دەیدات بە کەسێکی تر تا بە ناوی خۆی بڵاوی بکاتەوە، یان پەنابردن بۆ کڕینی زانیاری و ڕاسپاردنی کەسێکی تر بە نووسین و ئەنجامدانی توێژینەوە کە بەرهەمی ڕەنج و ماندووبوون و عەقڵ و بیرکردنەوەی کەسەکە نیە، یان زۆر جار هاوڕێیەك دەقێك لە جیاتی هاوڕێکەی دەنوسیت، یاخودیەکێك لە ئەندامانی خێزان دەقێك لە بری ئەندامێکی تری خێزانەکەیان دەنوسێت. هەموو ئەم هەوڵانە دەچنە خانەی دزیکردن و ناپاکی ئەکادیمی.

### ٤. ٢– گزیکردنی ڕاستەوخۆ Direct Plagiarism

لەم شێوازەدا کەسێك هەڵدەستێت بە وەرگرتنی پەڕەگرافێك یان بەشێك لە نووسینی کەسێك یان کتێبێك و بەکارهێنانی لە نووسینەکەیدا وەکو خۆی بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەکەی. گزیکردن کاتێك گزیکردنی ڕاستەوخۆیە کە پەڕەگرافەکە وەکو خۆی وەرگیرابێت هەتا ئەگەر چەند وشەیەکیشی لێرەو لەوێ لێ لابرابێت( All types of plagiarism including .(cxamples,www. scribbr. com

### ٣. ٣–دارشتنەوەی دووبارە Paraphrasing plagiarism

دوبارە دارشتنەوە، یەکێك لە بەربڵاوترین شێوازی گزیکردنە کە تیایدا نوسەر هەوڵی دوبارە داڕشتنەوەی دەقی نووسینی کەسێکی تر دەدات و تێکەل بە نووسینی خۆی دەکات، یان پارافرەیزکردنی چەند لاپەرەی کتێب یان توێژینەوەیەك بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەکە، یان کاتێك چەند سەرچاوەیەکی پەیوەندار بە بابەتەکەی دەخوێنێتەوە هەوڵ دەدات بیرۆکە و خاڵە سەرەکیەکانیان وەربگریت و وەك بیرۆکەی خۆی پێشکەشیان بکات، یاخود پەڕەگرافێك لە زمانێکی بێگانە وەردەگێرێت و دوبارە بە شێوازی خۆی داڕشتنەوەی بۆ دەکات. ئەم کردارە بە گزیکردن دانانرێت کاتێك نوسەر لە دووبارە داڕشتنەوەدا ئاماژە بە سەرچاوەکە بکات.

### ٤. ٤–گزیكردنی خودی Self-plagiarism

گزیكردنی خودی بریتیه له دزیكردن له خۆ و سوود وەرگرتن له دەقیكی پێشووتری نوسەر خۆی به بێ ئاماژەكردن به سەرچاوەكه. ئەم شێوازه زیاتر توێژەر و نوسەره بەناوبانگەكان دەستی بۆ دەبەن نەك فێرخوازانی زانكۆ و كەسانی تر كه ئەزموونی نووسینیان كەمه، تیایدا كەسی نوسەر چەند بەشێكی گرنگ له نووسینەكانی پێشووتری دەهێنێت و له بابەته تازەكەیدا جێیان دەكاتەوه به بێ گەڕانەوەو ئاماژەكردن به سەرچاوه كۆنەكانی.

### ٤. ٥–گزیكردن له سەرچاوه Source-based Plagiarism

ئەم شێوازه بەهۆی هەمەجۆری سەرچاوەكانەوه ڕوو دەدات، یان هەندێ جار بەهۆی گرنگی سەرچاوەیەك وپێویستی به سەرچاوەكه ڕوو دەدات، بۆ نموونه توێژەرێك ئاماژه به سەرچاوەیەك دەكات كه له ڕاستیدا بوونی نەبێت، یان بەهەڵەبردن و سەرلێ شێواندنی خوێنەر به دانان و ڕیزكردنی هەندێك سەرچاوه له لیستی سەرچاوەكاندا كه لەنێو ناوەڕۆكدا بەكار نەهێنرابن، یان هەندێ جار توێژەر سوود له هەندێ سەرچاوه وەردەگرێت كه سەرچاوەی دووەمن و له سەرچاوەی تر وەرگیراون بەڵام ئاماژه سەرچاوەی یەكەم دەكات نەك سەرچاوەی دووەم كه پشتی پێ بەستووه. هەموو ئەو كردارانه پەیوەندیان به زۆری سەرچاوەو گرنگی و پێوستی به به سەرچاوەكانەوه هەیه كه ئەنجامدانیان دەچێته خانەی گزیكردنی زانستی (Sabnis, ٢٠١٨).

### ٤. ٦– نا ڕۆشنی وناڕوستی له نووسیندا Inaccurate Authorship

دەست بردن بۆ شێوازی نادروست له نووسیندا جۆریكی تری گزیكردنه كه له زۆربەی كاتدا به دوو ڕێگا ئەنجام دەدرێت: له نموونەی یەكەمدا كەسێك بەشداره له نووسینی بابەتێكدا بەڵام خاوندارێتی لێ ناكات، له نموونه دووەمدا پێچەوانەی نموونەی یەكەم كەسێك خاوەندارێتی له بابەتێك دەكات به بێ ئەوەی هیچ جۆره بەشداریەكی له نووسینی بابەتەكه كردبێت، ئەم كردارەش هەر لایەنێكیان ئەنجامی بدات به گزیكردن و پێشیلكردنی یاساو ڕێساكانی نووسینی ئەكادیمی ئەژمار دەكرێت (Sabnis, ٢٠١٨).

## ٤. ٧–گزیکردنی تێکەڵ Mosaic Plagiarism

گزیکردنی تێکەڵ یان مۆزایکی جۆرێکی ترە لە ناپاکی ئەکادیمی تیایدا نوسەر هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەو هەڵێنجانی بیرۆکە لە کۆمەڵێك سەرچاوەی جۆراجۆر بە مەبەستی پێکهێنانی دەقێکی تازە لە بیرۆکەو وشەی کەسانی تر و پێشکەشکردنی بە ناوی خۆی بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەی بیرۆکەکان، یان وەرگرتنی کۆمەڵێك دەستەواژە لە سەرچاوەیەك لە رێگەی لابردن و زیادکردنی هەندێ وشە بە بێ بەکارهێنان و دانانی نیشانەکانی وەرگرتن. ئەم جۆرە گزیکردنە هاوشێوەی شێوازی گزیکردنی دوبارە داڕشتنەوەیە و هەندێ جار مەبەستدار و هەندێ جاری تر بێ مەبەست ئەنجام دەدرێت.

## ٤. ٨– گزیکردنی بێ مەبەست Accidental Plagiarism

گزیکردنی بێ مەبەست لە ئەنجامی نەزانی ونەشارەزایی و کەمتەرخەمی و تێ نەگەیشتن لە بابەتەکاندا ڕوو دەدات و لە زۆربەی کاتدا بێ مەبەست ئەنجام دەدرێت. بۆ نموونە کەمتەرخەمی لە ئاماژەکردن بە سەرچاوەو پشتگوێ خستنیان، یان وەرگرتن بە شێوازێکی خراپ و نەشیاو، یان دوبارە داڕشتنەوەی بابەتێك بە بەکارهێنانی وشەی هاوشێوە بە بێ گەڕانەوەو ئاماژەکردن بە سەرچاوەکەی. ئەم شێوازەی گزی کردن تا ڕادەیەك لە شێوازی گزیکردنی تێکەڵ نزیکە، بەڵام جیاوازیان لەوەدایە کە گزیکردنی تێکەڵ مەبەستدارەو بە مەبەست لە لایەن نوسەرەوە ئەنجام دەدرێت، هەرچی گزیکردنی بێ مەبەستە هۆکارەکەی نەشارەزایی و کەمتەرخەمی نوسەرە لە گەڕانەوەو ئاماژەکردن بە سەرچاوەکان. بێگومان نەشارەزایی و کەمتەرخەمیش لە بەپرسێتی نوسەر بەرامبەر کارەکەی کەم ناکەنەوە، بەڵکو گزیکردنەکە وەك هەمووجۆرەکانی تری گزیکردن هەمان مامەلەی لەگەڵ دەکرێت و خاوەنەکەشی ڕوبەڕووی هەمان ڕەخنەو لێپێچینەوەو سزای یاسایی دەبێت (رجب، ٢٠١٦).

## ٤. ٩– گزیکردن لە شێوازی نووسین Style Plagiarism

لەم جۆرە گزیکردنە نوسەر یان تویژەر لە نووسین و داڕشتندا پشت بە شێوازی نووسینی نووسەرێکی تردەبەستێت بە بێ ئاماژەکردن بە خاوەنەکەی. یان خستنەڕووی بیرۆکەو دارشتنی بیرۆکەکان بە هەمان ستایل و داڕشتنی سەرچاوەیەکی تر بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەکە.

### ٤. ١٠–گزیکردنی ئەلکترۆنی Electronic Plagiarism

هەندێ جار نوسەرێك پەنا دەباتە بەر گزیکردن لە سایتە ئەلکترۆنیەکان، وەك گواستنەوەو کۆپی کردن لە ڕێگەی ئەنتەرنێتەوە بە بێ ئاماژەیەکی ڕوون بە سەرچاوە ئەلکترۆنیەکان، یان بەکارهێنانی کەرەستەو زانیاری یارمەتیدەر بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەی کەرەستەو زانیاریەکان.

### ٤. ١١–داتای نادروست و ساختەکاری Data fabrication and falsification

یەکێك لە ترسناکترین شێوازەکانی گزیکردن کە هەندێ نوسەر بە هەر هۆکارێك بێت پەنای بۆ دەبەن ساختەکاری و خستنەڕووی داتای نادروستە، وەك کەڵك وەرگرتن لە دەرەنجامی توێژینەوەیەکی تر و دانانی ژمارەو داتای نادروست، یان سوود وەرگرتن لە دەرەنجامی کاری کەسێك و ئاماژە نەکردن پێی. یاخود لاسایی کردنەوەو سوود وەرگرتن لە کاری کەسێکی تر بە بەکارهینانی ئامرازی تر بە بێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەکەی.

### ٤. ١٢–گزیکردنی زارەکی Oral plaigirism

گزیکردنی زارەکی(Oral plaigirism) شێوازێکی دیکەی گزیکردنە کە تیایدا نوسەر ئاماژە بە سەرچاوەی ئەو زانیاریانە ناکات کە لە ڕێگەی گفتوگۆ و تۆمارکردنی دەنگی و ڤیدیۆ و ئامارە دەنگی و ڕەنگیەکان وەری گرتوون.

### ٤. ١٣–گزیکردنی هونەری Artistic plagiarism

لە گزیکردنی هونەریدا کەسی گزیکار هەوڵ دەدات کاری کەسێکی تر دووبارە بکاتەوە بە بەکارهێنانی ئامرازی تر، وەك دیزاین و وێنە و هێڵکاری و گرافیك و ڤیدیۆ، ئەم شێوە گزیکردنەش هیچی لە شێوەکانی تر کەمتر نیەو هەمان یاساو ڕێساکانی گزیکردنی بەسەردا دەسەپێنرێت و ئەنجامدەرەکەشی ڕووبەڕووی هەمان سزای یاسایی شێوەکانی دیکەی گزیکردن دەبێتەوە.

### ٤. ١٤–گزیکردن بە ڕێگای دووبارە وەرگێڕان Back Translation

ئەم شیوازە، یەکێکە لە تازەترین شێوازی گزیکردن کە بە شێوەیەکی بەرفراوان لە لایەن فێرخوازان و هەندێ لە توێژەرە تازەکان ئەنجام دەدرێت، بە پێی ئەم ڕێگایە کەسی گزیکار

دەقێك لە زمانێکەوە وەردەگرێت و بۆسەر زمانێکی تر کە زمانی دووەمە وەری دەگێرێت، دواتر دەقە وەرگێردراوەکە دووبارە بۆ زمانی یەکەم وەردەگێرێت، لە زۆربەی کاتیشدا بۆ ئەم مەبەستە پرۆگرامی (Google translate) و(Babelfish) وفەرهەنگە ئەلکترنیەکانی تر بەکاردەهێنێت.

بەسەرنجدان لە کۆی رێگاو شێوازەکانی گزیکردن دەشێت سەرجەمیان لە پێنج شێوازدا کۆبکرێنەوە، ئەوانیش پێك هاتوون لە کۆپیکردن، گۆرینی وشە ودووبارە دارشتنەوە، شێواز و رێباز.




شێوە(٣. ٢)شێوازەکانی گزیکردن ڕوون دەکاتەوە

## ٥-هۆكارەكانی گزیكردن The causes of plagiarism

پەنابردنی نوسەر یان توێژەر یاخود فێرخواز بە گزیكردن و ناپاكی ئەكادیمی لە كارەكەیاندا دەگەڕێتەوە بۆ هۆكارگەلێكی وەك:

### ٥. ١- نە شارەزایی لە بنەماكانی نووسینی ئەكادیمی

لاوازی ئاستی فیكری و ڕۆشنبیری و نەشارەزایی لە بنەماكانی نووسینی ئەكادیمی و ناكارامەیی لە نووسیندا هۆكاری یەكەمی پەنابردنی زۆرێك لە نوسەران و توێژەرانی كەم ئەزموونە بە گزیكردن و ناپاكی ئەكادیمی، چونكە زۆربەیان لە مانای ناپاكی ئەكادیمی و دەرەنجام و زیانە زانستیەكانی نەگەیشتوون.

### ٥. ٢-بێ توانایی لە ڕێكخستنی كاتدا Inability to manage time

بێ توانایی لە سوود وەرگرتن لە كات و دابەشكردنی كاتدا هۆكارێكی تری دەست بردنە بۆ ناپاكی ئەكادیمی لە لایەن هەندێ فێرخواز و توێژەری تازەی كەم ئەزموون، چونكە كاتێكی دیاریكراویان لەبەردەستەو ناتوانن لە دوا مۆڵەتدا كارەكەیان تەواو بكەن.

### ٥. ٣-ئارەزووی گەیشتن بە پلەی بەرز Desire to get a good grade

زۆر جار ئارەزووی گەیشتن بە پلەو پایەی بەرز یان ناوبانگ و پارەی زۆر هەندێ كەس دووچاری گزیكردن دەكات، بۆ نموونە هەوڵدان بۆ بەرزكردنەوەی پلەی زانستی هۆكارێكی سەرەكی پەنابردنی هەندێ مامۆستایە بە ناپاكی ئەكادیمی، وەك ئەوەی ئەنجامدانی توێژینەوەیەكی نایاب و بڵاوكردنەوەی توێژینەوەكە لەگۆڤارێكی ئەكادیمی باوەڕ پێكراودا یەكێكە لە پێداویستیەكانی بەدەست هێنانی پلەی زانستی و ئەوانیش كەم توانان لە ئەنجامدانی.

### ٥. ٤-هەست نەكردن بە بەهای كار Lack of sense of value of work

هەست نەكردن بە بەهای كارەكەیان لای هەندێ فێرخواز و توێژەری تازە هۆكاریكی تری پەنابردنە بۆ گزیكردن، بۆ نموونە فێرخوازێك تەنها ئامانجی سەركەوتن و بە دەستهێنانی نمرەیە لە پرۆژەكەیدا هەوڵ دەدات لە كورترین كات و بە كەمترین هەوڵ و ماندووبوون كارەكە

تەواو بکات. هەروەها هەستی خۆپەرستی و حەزی خۆدەرخستن و خۆجیاکردنەوە لە کەسانی تر هۆکارێکی ترە بۆ پەنابردنی هەندێ کەسی خۆپەرست بە گزیکردن.

### ٥. ٥-پەروەردەی هەڵە Poor education

پەروەردەی هەڵەو ڕاهێنانی نادروستی فێرخوازان لە قۆناغەکانی بنەڕەتی و ئامادەیی لە لایەن هەندێ مامۆستاوە. بۆ نموونە بێ توانایی و نەشارەزایی هەندێ مامۆستا لە فێرکردنی فێرخوازانی قۆناغی ئامادەیی بە چۆنیەتی وتار نووسین و ڕێ و شوێن و هەنگاوەکانی ڕاپۆرت نووسین.

### ٥. ٦- ترس لە شکست Fear of failing

هەستکردن بە پێویستی بۆ دەرنەکەوتن لە وێنەیەکی شکست خواردوودا و پەنا بردن بۆ گزیکردن و کۆپیکردن بۆ دەرکەوتن وێنەیەکی سەرکەتوودا. ترس و بێ باوەڕی بەخۆ وای لە هەندێ فێرخواز و توێژەری تازە کردووە وا هەست بکەن کە بە تەنها نەتوانن کارەکەیان ئەنجام بدەن و نمرەی پێویست بەدەست بهێنن، بۆیە پەنا بۆ گزیکردن دەبەن، یان خواستی هێنانەدی نمرە یان پلەیەکی بەرز لە لەژێر فشار و داواکاری توندا، بۆ نموونە فشار و پاڵەپەستۆی دایك و باوك وا هەندێ فێرخواز دەکات بۆ ئەوەی دەربچن یان نمرەیەکی بەرز لە توێژینەوەکەیان بەدەست بهێنن پەنا بۆ گزیکردن ببەن.

### ٥. ٧-سەرچاوەی ئەلکترۆنی Electronic References

بڵاوبوونەوەو فەراهەم بوونی زانیاری و سەرچاوەی جۆراوجۆر لە سایتە ئەلکترۆنیەکان لەم سەردەمەدا هۆکاریکی هەرە بەهێزی پەنا بردنە بۆ گزیکردن، چونکە دەست پێ گەیشتنیان و گزیکردن تیایاندا ئاسانە، هەروەها بێ توانایی فێرخوازان و هەندێ توێژەر لە سوود وەرگرتن لەو سەرچاوانەو دوبارە داڕشتنەوەی بیرۆکەو بابەتەکان بە شێوازی تایبەتی خۆیان.

### ٥. ٨-هەستکردن بە زیان Feeling of harm

هەستکردن بە زیان و قەرەبوکردنەوەی زیانەکانی ڕابردوو وا لە هەندێ توێژەر دەکات لە ڕێگەی گزیکردنەوە هەوڵی گێڕانەوەی هەموو ئەو شتانە بدەن کە لە ڕابردوودا لە دەستیان داوە.

### ٥. ٩-پشتگوێ خستنی سەرچاوەکان Ignore references

گرنگی نەدان بە ئاماژەکردن بە سەرچاوەو پشت گوێ خستنیان هۆکارێکی تری ڕوودانی گزیکردنە. بۆ نموونە نوسەرێك بە مەبەست و بە ئاگاییەوە ئاماژە بە هەندێ سەرچاوە چ لە نێو ناوەڕۆك یان لیستی سەرچاوەکاندا ناکات و پشت گوێیان دەخات.

### ٥. ١٠- نووسینگەی بازرگانی بۆ گزیکردن Business Offices for plagiarism

بوونی نووسینگەی بازرگانی و بازرگانی کردن بە زانست لە زۆر ولآت بۆتە هۆی ئەوەی بە بڕە پارەیەکی کەم توێژینەوەیەکی زانستی گەورە بە ناوی کەسێکەوە بنوسرێت، بە تایبەت لە ولآتانەی بێ بەشن لە بوونی سیستمێکی دەستپاکی ئەکادیمی و دەزگایەکی چاودێری ورد بەسەر ڕەوشی و زانست و بێ توانایی و کەم تەرخەمی لە هوشیارکردنەوەو ئاراستەکردنی تاکەکان دۆخیك دروست دەکات کە زۆرێك لە نوسەر و توێژەرەکان پەنا بۆ بە گزیکردن ببەن.




شێوە(٣. ٣)گرنگترین هۆکارەکانی گزیکردن دەخاتەڕوو

## ٦-چۆنیەتی ڕێگرتن لە گزیکردن How to combat plagiarism

پەرەسەندنی دیاردەی گزیکردن و زیادبوونی مەترسیەکانی وای لە زۆرێك زانکۆ و ناوەندە زانستی و ئەکادیمیەکان کردووە چەندین ڕێ و شوێنی گرنگ بە مەبەستی چۆنیەتی ڕوبەڕوبوونەوەو بنبڕکردنی دیاردەکە بگرنەبەر.

زانکۆی شیکاگۆ (University of Chicago)لە لێکۆڵینەوەیەکدا دەربارەی کۆمەڵگای ئەکادیمی و پێوەرە زانستی و مۆڕاڵیەکان کە لە سایتی زانکۆکە بڵاوکراوەتەوە ئاماژە بە گزیکردن وەك تاوانێکی مۆڕاڵی گەورە کراوە بە جۆرێك ئەنجامدەرانی تاوانەکە بە پێی یاساو ڕێسا ئەکادیمیەکانی زانکۆکە سزا دەدرێن. هەروەها ئاماژە بە پێویستی بەکارهێنانی ڕێبەری ڕێنماییکاری بۆ دوورکەوتنەوەو خۆپارێزی لە گزیکردن لە لایەن فێرخوازان دەکات و کردنەوەی خولی تایبەت بە ئاشناکردنی فێرخوازان بە بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی بە گرنگ دەزانێت (The University of Chicago Press,www. press. uchicago. edu). هەروەها ماڵپەڕی کتێبخانەی زانکۆی تەکساس (University of Texas Libraries) لە ئۆستنی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پرۆگرامێکی ڕاهێنان و فێرکاری تایبەت بە گزیکردن و چۆنیەتی دوورکەوتنەوە لە ناپاکی ئەکادیمی تەرخان کردووە، ئامانج لە دانانی پرۆگرامەکە ئاشناکردنی مامۆستا و فێرخوازەکانە بە دیاردەی ناپاکی ئەکادیمی و مەترسی و زیانەکانی گزیکردن، هەوەرها ڕاهێنان و فێرکردنیان لەسەر چۆنیەتی بەکارهێنانی سەرچاوەو سوود وەرگرتن لە زانیاری کەسانی تر لە چوارچێوەی یاساو ڕیسا ئەکادیمیەکان و پابەندبوونیان بە بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی ( Avoid Plagiarism. University of Texas Libraries, www. legacy. lib. utexas. edu).

کتێبخانەی کونیلی(Connelly Library) زانکۆی لاسال(La Salle University)ی ئەمەریکی پێنج ئامۆژگاری بۆ دوورکەوتنەوە لە گزیکردن خستۆتەڕوو، وەك تێگەشیتن لە بابەت و سەرچاوەکانی بابەت پێش بەکارهێنانیان و پشت نەبەستنی زۆر بە بیرۆکەی کەسانی تر و دڵنیا بوون لە زانین و فێربوونی چۆنیەتی وەرگرتن و ئاماژەکردن بە سەرچاوەکان و بەکارنەهێنانی ئەنتەرنێت و پشت بەستن بە کتێبخانەو تاقیگەو سەرچاوەی زانستی دیار

(Connelly Library. la salle University,www. lasalle. edu). هەروەها کتێبخانەی زانکۆی ویلایەتی ئیندیانا (Indiana State University Library) لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پرۆگرامیکی بە مەبەستی پێش گرتن لە گزیکردن پێشکەش کردووە کە چەندین زانیاری گرنگی لەخۆگرتووە، وەك گزیکردن و ناساندنی، جۆرو شێوازەکانی گزیکردن، چۆنیەتی دوورکەوتنەوە لە گزیکردن و سوود وەرگرتن لە سەرچاوەو بەکارهێنانیان بە شێوازێکی دروست (Plagiarism Tutorial. Indiana State University, www. panther . indstate. edu).

کتێبخانەکانی زانکۆی ویلایەتی میسوری(University of Missouri Libraries)لە ولاتە یەکگرتووەکان لەسەر مالپەری فەرمیدا چەند وانەیەکی تایبەت بە دوورکەوتنەوە لە گزیکردن (Avoid Plagiarism)ی پێشکەش کردووە، ناوەڕۆکی وانەکان چەند بابەتێکی گرنگیان لەخۆ گرتووە، وەك پێشەکی، تاقیکردنەوەی پێشوو، گزیکردن چیەو دەرەنجامەکانی چین، پشت بەستن بە سەرچاوەی تایبەت، جۆرەکانی وەرگرتن و گواستنەوە، چۆنیەتی گواستنەوەو سوود وەرگرتن لە بەرهەمی نوسەرانی تر، سوود وەرگرتن لە وتەو سەرچاوەی زارەکی و کورتکردنەوەی زانیاریەکان ( Plagiarism and Copyright,University of Missouri Libraries, www. libraryguides. missouri. edu). هەروەها کتێبخانەکانی زانکۆی دیوك لە ئەمەریکا (Duke University USA) لەسەر مالپەری فەرمیدا ناوەندێکی هاوبەشیان بۆ ژیانی فیکری زانکۆکە پێك هێناوە و هەولیان داوە بەردەوام کار لەسەر زیادکردنی زانیاری و شارەزایی تایبەت بە دیاردەی گزیکردن لای سەردانیکارنی مالپەرەکەیان بکەن، گرنگترین ڕینمایی و ئامۆژگاریەکانی ناوەندەکە بریتین لە دوورکەوتنەوە لە گزیکردن و پاراستنی مافی خاوەندارێتی فیکری کەسانی تر و چۆنیەتی سوود وەرگرتن لە سەرچاوەو بە دروستی بەکارهێنانیان و پیشکەشکردنی کورتە ڤیدیۆ ڕێنماییکاری بۆ دوورکەوتنەوە لە گزیکردن (Avoiding Plagiarism,Duke University Libraries, www. library. duke. edu).

زانکۆکانی بەریتانیا چەند هەنگاوێکی ئەکادیمی گرنگیان ناوە بۆ بەرگرتن بە دیاردەی گزیکردن، کتێبخانەی زانکۆی بریستۆل(University of bristol) لە سەر مالپەری ئەلکترۆنیدا لاپەڕەیەکی بە ناو نیشانی گزیکردن:زانیاری و ئامۆژکاری( Plagiarism: information and

advice) بە مەبەستی ئاشناکردنی سەردانیکارانی سایتەکە بە ناپاکی ئەکادیمی وهۆکارەکان و جۆرەکانی ناپاکی ئەکادیمی و چۆنیەتی دوورکەوتەوە لە گزیکردن و پابەندبوون بە بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی تەرخان کردووە( Plagiarism:information and advice, University of Bristol,www. bris. ac. uk). هەروەها کتێبخانەی زانکۆی کۆلۆمبیای بەریتانی(University of British Columbia) لەسەر ماڵپەری فەرمیدا پرۆگرامێکی فێرکاری و پەروەردەیی تایبەتی بە ناونیشانی دەستپاکی ئەکادیمی (Academic Integrity) تەرخان کردووە، پرۆگرامەکە ڕونکردنەوەی گزیکردن وەك چەمك و دیاردەو چەند چەندین ئامۆژگاری گرنگ بۆ دوورکەوتنەوە لە گزیکاری و فیلمی فێرکاری ( Citing: When and Why) لەخۆ گرتووە ( Academic Integrity,The University of British Columbia, www. learningcommons. ubc. ca).

کتێبخانەی زانکۆی لیدز(Leeds University Library) لە بەریتانیا لەسەر ماڵپەری فەرمی لە چوارچێوەی خزمەتگوزاری ئەکادیمیدا پرۆگرامێکی تایبەت بە دەستپاکی ئەکادیمی و گزیکردن (Academic integrity & plagiarism) ساز کردووە، ناوەڕۆکی پرۆگرامەکە چەند بابەتێکی دەربارەی دەستپاکی ئەکادیمی و گزیکردن و چۆنیەتی دوورکەوتنەوە لە دیاردەکەو مافی خاوەندارێتی فیکری و بەکارهێنانی سەرچاوە زانستیەکان دوور لە گزیکاری و ناپاکی ئەکادیمی( Academic integrity and plagiarism. Leeds University Library, www. library. leeds. ac. uk) . هەروەها زانکۆی هێریۆت-وات(Heriot-Watt University) لە شاری ئەدنبرە(Edinburgh)ی پایتەختی سکۆتلاند (Scotland) گایدێکی ڕێنماییکاری تایبەت بە گزیکردنی بە ناونیشانی (گزیکردن، ئاشکرا کردنی دیاردەکەو ڕێنمایی کردن بۆ چۆنیەتی دوورکەوتەوەو خۆپاراستن لێی) بۆ فێرخوازان لەسەر سایتی زانکۆکە بلاوکردۆتەوە، ناوەڕۆکی گایدەکە ناساندنی گزیکردن و یاساو ڕێسا ئەکادیمیەکان بۆ سوود وەرگرتن لە سەرچاوەو بەکارهێنانیان و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەل دیاردەکەی لە خۆگرتووە، لە ڕوانگەی ئەو زانکۆیە گزیکاری تاوانێکی گەورەیەو کەسی گزیکار چ مامۆستا یان قوتابی بە پێی جۆر و قەبارەی گزیەکە سزا دەدرێت، بۆ نموونە لە بەرامبەر ڕوودانی گزیکردندا فێرخواز ڕووبەڕووی سزای دوورخستنەوە یان دەرکردن لە زانکۆ دەبێتەوە، یان دووبارە کردنەوەی بەشێك لەو

بابەتانەی فێرخوازەکە تیایدا سەرکەوتوو بووە بەڵام بە دەرچوون بۆی ئەژمار ناکرێت (Student Guide to Plagiarism, Heriot-Watt University,www. hw. ac. uk).

زانکۆکانی کەنەدا بۆ وەستانەوە بەرامبەر دیاردەی گزیکردنی زانستی چەند هەنگاویکی گرنگیان ناوە، بکتێبخانەی زانکۆی کۆنکۆردیا(Library of Concordia University) لە کەنەدا لە ڕێگەی سایتی ئەلکترۆنیەوە گزیکردنی بە تاوانێکی گەورە داناوە بە جۆرێك کەسی گزیکار ڕووبەری سزای یاسایی و ئەکادیمی دەبێتەوە، ئەم تاوانەش بە پێی مادەی (A١٦)ی وڵاتی کەنەدا خستنەڕووی کاری کەسێکی ترە بێ مۆڵەت و بێ ئاگاداری کەسەکە، ئەمەش جۆرێکە لە دزی و دەست بردن بۆ مافی کەسانی تر( Academic Code of Conduct ,Concordia University,٢٠١٥,www. concordia. ca). هەروەها کتێبخانەی زانکۆی سایمۆن فریزەر (SFU Library) لە کەنەدا سیستمیکی فێرکاری و ڕێنمایکاری تایبەت بە دیاردەی گزیکردنیان بە ناونیشانی(The Canvas Course Management System) لەسەر ماڵپەری فەرمی کتێبیخانەی زانکۆکە داناوە، سیستمەکە چەندین بابەتی گرنگی دەبارەی دوورکەوتنەوە لە گزیکردن لەخۆ گرتووە، وەك گزیکردن چیە؟ بۆچی بە تاوانیکی ترسناك دادەنرێت؟ دەرەنجامە ترسناکەکانی چین؟ چۆن توێژەر خۆی لە گزیکردن بە دوور دەگرێت؟، هەوەرها کۆمەڵێك ئامۆژگاری گرنگ دەبارەی چۆنیەتی بەکارهێنانی سەرچاوەو دووبارە دارشتنەوەی زانیاری و کورتکردنەوەیان و چۆنیەتی ئامازەکردن بە سەرچاوەکان و پاراستنی مافی خاوەنداریتی فیکری کەسانی تر و پابەندبوون بە بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی (Avoiding plagiarism. SFU Library,www. lib. sfu. ca).

زانکۆی سیدنی(University of Sydney) لە وڵاتی ئوستراڵیا لەسەر ماڵپەری فەرمی کتێبخانەکەیدا پرۆگرامێکی تایبەتی بەناونیشانی گزیکردن و ڕاستی زانستی( Plagiarism and academic honesty) و فیلمێکی ڕێنماییکاری داناوە، ئامانجی پرۆگرامەکە ئاشناکردنی سەردانیکارانی ماڵپەرەکەیە بە بنەماکانی دەسپاکی ئەکادیمی و دوورکەوتنەوە لە دیاردەی گزیکردن( Plagiarism and academic honesty. University of Sydney, www. library. sydney. edu. au). هەروەها زانکۆی مەندل (Mendel University in Brno) لە برۆنۆی پایتەختی وڵاتی چیك لە تەمموزی ٢٠١٥ کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی لەسەر ناپاکی

ئەکادیمی گرێ داو بڕیارو ڕاسپاردەکانی کۆنگرەشی لەسەر ماڵپەڕی ( www. plagiarism. cz) بڵاوکردەوە، تەوەری بابەتەکانی کرنگرەکەش ستراتیژی هۆشیار کردنەوەوخۆپارێزی و ئاشکرا کردنی ناپاکی ئەکادیمی و داهێنانی ئامرازی ئەلکترۆنی و تەکنیکی بۆ دەرخستن و ئاشکرا کردنی گزیکردن و ڕووبەڕووبوونەوەی دیاردەکەی لەسەر ئاستی هەرێمی و نیشتیمانی لەخۆ گرتبوو ( Plagiarism Across Europe and Beyond ,٢٠١٥, Mendel University, (www. gs. elaba. lt.

لەسەر ئاستی وڵاتانی عەرەبی زانکۆی شاسعود(King Saud University) لە عەرەبستان و زانکۆی پەترا(University of Petra) ولە ئوردن و زانکۆی ئەسکەندەریە( Alexandria University) لە میسر بۆ وەستانەوە بەرامبەر دیاردەی گزیکردن چەند هەنگاوی گرنگیان ناوە. زانکۆی شا سعود(King Saud University)یەکێکە لەو زانکۆ عەرەبیانەی نامیلکەیەکی ڕێنمایی لە شێوەیی زنجیرەیەك ئامۆژگاری لەژێر ناونیشانی(چۆن فێرخوازەکانت لە هەڵەو گزیکردن دوور دەخەیتەوە) بۆ مامۆستایان و وانەبێژانی زانکۆکە داناوە، ناوەڕۆکی نامیلکەکە چەند ڕێنماییەکی گرنگی بۆ مامۆستایان لەخۆگرتووە وەك، پێویستە لە یەکەم ڕۆژی دەستپێکی خوێندندا فێرخوازان ئاشنا بکرێن بە چەمکی گزیکردنی زانستی و گرنگی مافی خاوەندارێتی فیکری و بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی و چۆنیەتی سوودوەرگرتن لە سەچاوەو بەکارهێنانیان و یاسا و ڕێساو ئەو سزایانەی پەیوەستن ئەنجامدانی ناپاکی ئەکادیمی. هەروەها پێویستە فێرخوازان ئاگادار بکرێنەوە تا خۆیان لە نووسینگە بازرگانیەکان بە دوور بگرن و تێ بگەیەندرێن لەوەی ئامانج لە توێژینەوەدا فێربوونی کارامەیی شیکاری و ڕاڤەکاری و چونیەتی بەکارهێنانی زانیاریەکانە نەك تەنها کۆکردنەوەی بابەت و گەیشتن بە دەرنجامێکی کۆتایی، پێویستە فێرخوازان لەسەر بەکارهێنانی سەرچاوەی جۆراوجۆر هان بدرێن و ڕوون کردنەوەی تەواویان سەبارەت بە بەکارهێنانی سایتە ئەلکترۆنیەکان پێ بدرێت و فێری چۆنیەتی ئاماژە کردن بە سەرچاوەو دانانی پەراوێزو پابەندبوونیان بە پەیڕەوکردنی میتۆدی زانستی بکرێن (كيف تجنب طلابك خطأ الوقوع في السرقة العلمية؟ جامعة الملك سعود، www. sdl. edu. sa). هەروەها زانکۆکانی عەربستانی سعودی کۆمەڵێك سزایان دیاری کردووە لە بەرامبەر ئەو مامۆستاو وانەبێژانەی بە هاوکاری مامۆستایانی تر پەنا بۆ گزیکردن دەبەن، وەك دابەزاندن ولێ سەندنەوەی پۆست و پوچەڵکردنەوەی بەرزبوونەوەو ڕاگرتن و برینی موچەو لێ

سەندنەوەی مافی وانەبیژی و چەندین سزای تر(عقوبات قاسية بحق أساتذة الجامعات المتهمين بالسرقة العلمية، ٢٠١٥، صحيفة عاجل الالكترونية، www. qa . ajel. sa).

زانكۆی بەترا(University of Petra) لە ولاتی ئوردن ناوەندێکی بە ناوی سەنتەری پەرەپێدانی ئەکادیمی داناوە کە یەکێك لە ئامانجەکانی ڕێگریکردنە لە دیاردەی گزیکردن بە پشت بەستن بە بەکارهێنانی پرۆگرامی(Turnitin)کە یەکێکە لە پرۆگرامە هەرە باشەکانی بواری ئاشکراکردن و دەرخستنی گزیکاری و لەگەڵ زمانی عەرەبیشدا کار دەکات (دورة حول نظام كشف الانتحال الأدبي(Turnitin)في جامعة البترا، جفرا نيوز، www. jfranews. com. jo). هەروەها زانکۆی ئەسکەندەریە(Alexandria University) لە میسر لە نیسانی ٢٠١٥ لە دەست پێشخەریەکدا هەڵمەتێکی فراوانی ئەنجامدا بە مەبەستی ئاشناکردنی مامۆستا و فێرخوازەکان بە چەمکی گزیکردنی زاستی و هوشیارکردنەوەیان و پابەند بوونیان بە بنەما زانستی و مۆراڵیەکانی توێژینەوی زانستی(رمضان، ٢٠١٥).

بە پێی بەڵگەنامەیەك کە سەپەرشتیارانی سایتی (Turnitin)بۆ دەرخستن و ئاشکراکردنی گزیکردن پێشکەشیان کردووە لەبڕگەیەدا لە وەڵام بەو پرسیارەی کە دەڵێت ئایا سزاکانی گزیکردن چین؟(What are the punishments for plagiarism)ئامارەیان بە سێ جۆر سزا بۆ گزیکردن کردووە، یەکەمیان سزای ئەکادیمی (Academic sanctions) ە کە مەبەست لێی ئەو ڕێ و شوینانەیە کە زانکۆ و ناوەندە ئەکادیمەیەکان بە مەبەستی مامەلکردن لەگەل دیاردەکەو کەسی گزیکاردا دەیگرنەبەر، وەك خستن و هیشتنەوەو دوورخستنەوەو لێ سەندنەوەی مافی مامۆستایەتی ودەرکردن لە زانکۆ. بەڵام سزای دووەمیان سزای یاسایی (Legal sanctions) ە کە مەبەست لێی جێبەجێ کردنی ڕێ و شوێنە یاساییەکانە لەبەرامبەر کەسی گزیکاردا کە سزای دارایی و بەندکردن دەرگرێتەوە، وەك سزادان بە پێ بژاردنی ١٠٠ دۆلار تا ٥٠٠٠٠ هەزار دۆلار وبەندکردنیش بۆ ماوەی یەك ساڵ، چونکە بە پێی یاسای زۆربەی ولاتان گزیکردن بە تاوان ئەژمارکراوەو گزیکاریش وەك تاوانبار سزا دەدرێت. هەرچی سزای سێیەمە سزای دامەزراوەیی(Institutional sanctions)ە کە مەبەست لێی ئەو ڕێ وشوێنانەیە کە دەزگا و دەمەزراوەکان لەبەرامبەر گزیکردندا پەیرەوی دەکەن، وەك سزا دان بە دەرکردن لەکار کە بەهۆیەوە گزیکار کارەکەی لە دەست دەدات (Citation FAQ,Document provided by Turnitin. com,www. website. aub. edu. lb).

## ٧- پێداویستیە بنەڕەتیەکانی دوورکەوتنەوە لە گزیکردن Prerequisites to avoid plagiarism

دوورکەوتنەوە لە دیاردەیەی گزیکردن(Plagiarism) و ڕێگری کردن لە ناپاکی ئەکادیمی لە زانکۆو ناوەندە ئەکادیمی و فێرکاریەکاندا پێویستی بە ڕێنمایکردن و ئاشناکردنی فێرخوازان و توێژەران هەیە بە بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی، هەروەها پێویستی بە هەوڵی جدی و یەکگرتووی سەرجەم دام و دەزگا زانستیەکان هەیە، وەك:

### ٧. ١-هوشیاری مۆراڵی Ethical Awareness

گزیکردنی زانستی دیاردیەکی مۆراڵیە، ڕێگریکردن لە دیاردەیەکە بەر لە هەر شتێك پێویستی بە هۆشیارکردنەوەی مۆراڵی تاکەکان هەیە، چونکە ئەزموونی ڕابردوو سەلماندوویەتی کە نە یاساو ڕێساکان و نە ڕێگا تەکنیکاریەکان و پرۆگرامە ئەلکترۆنیەکان بە تەنها ناتوانن کۆنترۆڵی دیاردەکە بکەن. بۆ نموونە زۆربەی کتێب و سەرچاوە کۆنەکان ڕەنگە نەخرابنە نێو تۆرەکانی ئەنتەرنێت تا لە ڕێگەی پرۆگرامە ئەلکترۆنیەکانەوە چۆنیەتی بەکارهێنانیان بزانرێت، بۆیە لە ئێستادا زۆربەی زانکۆکانی جیهان بۆ ئەم مەبەستە پەنایان بردۆتە بەر هوشیارکردنەوەی مۆراڵی و ڕاهێنانی ئەکادیمیانەی فێرخواز و توێژەرەکان لەسەر مەترسی و زیانەکان و چۆنیەتی خۆپاراستن و دوورکەوتنەوە لە گزیکردن و پابەندبون و ڕێزگرتنیان لە بنەماکانی دەستپاکی ئەکادیمی (عیسانی، ٢٠١٥).

### ٧. ٢-ڕێنماییە ئەکادیمیەکان Academic Guidance

نووسینی ئەکادیمی(Academic writing) پرۆسەیەکە لەسەر بنەمای کۆمەلێك ڕێنمایی و نەریتی زانستی بەڕێوە دەچێت کە پێوستە لەسەر تاکی نوسەر بۆ دوورکەوتنەوەو خۆپاراستن لە هەر دیاردەیەکی ناپاکی ئەکادیمی پەیڕەوییان لێ بکات.

### ٧. ٣- پرۆگرامە ئەلکترۆنیەکان Electronic programs

یەکێك لە دیارترین ئەو ڕێگایانەی کە بۆ بەرگرتن لەدیاردەی گزیکردنی زانستی (Plagiarism)بەکار دەهێنرێت و زۆربەی زانکۆ و ناوەندە زانستیەکانیش پشتی پێ دەبەستن

تۆڕەکانی ئەنتەرنێت وبوونی چەند پرۆگرامێکی ئەلکترۆنی تایبەتە بە دەرخستن و ئاشکراکردنی دیاردەی گزیکرن.

**٧. ٤–بەدواداچوونی یاسایی legal procedures**

گزیکردنی زانستی(Plagiarism)دەست درێژی کردنە بۆ سەر بەرهەمی کەسانی ترو پێشێلکردنی مافی خاوەندارێتی فیکری کەسانی ترە، ئەمەش کردەوەیەکی تاوانکاریەو پێویست بەوە دەکات بکەرەکەی ڕووبەڕووی یاساو سزای یاسایی بکرێتەوە، بۆیە بەکارهێنانی ڕێگای یاسایی و جێبەجێ کردنی یاسا بەسەر ئەنجامدەرانی گزیکردندا ئەگەر دیاردەکە بنبڕیش نەکات ئەوا لە چوارچێوەیەکی تەسکدا سنووورداری دەکات.




شێوە(٣. ٤)پێداویستیە بنەرەتیەکانی دوورکەوتنەوە لە دیاردەی گزیکردن ڕوون دەکاتەوە

## ٨-ئامرازەکانی ئاشکراکردنی گزیکردن Plagiarism Detection Tools

پەرەسەندنی دیاردەی گزیکردن(Plagiarism) و پێشیلکردنی مافی خاوەندارێتی فیکری کەسانی تر لە ناوەندە ئەدەبی و زانستیەکاندا بۆتە هۆی دەرکەوتنی چەندین پرۆگرامی ئەلکترۆنی بۆ دەرخستن و ئاشکراکردنی گزیکردن و لێکۆڵینەوە لە ڕەسەنایەتی بابەت و توێژینەوەکان. ئەم پرۆگرامانە زیاتر لەسەر ئاستی زانکۆ و ناوەندە زانستیە گەورەکان بەکار دەهێنرێن، هەندێکیان خزمەتگوزاریەکەیان بێ بەرامبەرە، بەڵام هەندێکی تریان سەرەتا وەك ڕیکلام بۆ پرۆگرام و کۆمپانیای خاوەنی پرۆگرامەکان بە خۆڕایی کار دەکەن، دواتر داوا لە بەکاربەر دەکات بیکڕێت و تێچووی بەکارهێنانیشان گرانە.




وێنە(٣. ٥)چەند نموونەیەك لە پرۆگرامەکانی ئاشکراکردنی گزی زانستی دەخاتەڕوو

## ٨. ١–پرۆگرامی iThenticate

پرۆگرامی(iThenticate) یەکێکە لە سایتە گەورەکانی تایبەت بە دەرخستن و ئاشکارکردنی گزی کردن لەسەر ئاستی هەموو جیهاندا، پرۆگرامێکە بە مەبەستی دڵنیابوون لە ڕەسەنایەتی بەرهەمەکان پێش چاپکردن لە لایەن نوسەران وتوێژەرانی دەزگا و دامەزراوەی ئەکادیمی و سەنتەرەکانی توێژینەوە بەکار دەهێنرێت. ئەم پرۆگرامە پشت دەبەستێت بە بەراوردکرنی بەرهەمی نوسراو بە بەرهەمەکانی پێشوو لەسەر زیاتر لە ٥٠ ملیار لاپەڕەی ئەنتەرنێت و بەروردکردنیان بە ٤٠ ملیۆن وتارو لێکۆڵینەوەی بلاوکراوە لە ٥٩٠ ناوەندی بلاوکردنەوەی زانستی و پزیشکی و تەکنیکاری جیهانیدا. سیستمی بەروردکاری پرۆگرامەکە زیاتر لە ملیۆنیك پوختەو سەرچاوەی گۆڤارەکان و ٢٠٠٠ هەزار ناونیشانی توێژینەوەی جۆراوجۆرو پێرستی زیاتر لە ١٠ ملیۆن سایتی لەخۆ گرتووە. سیستمەکە ٣٠ زمانی لەخۆ گرتووەو لە ڕێگەیەوە دەتوانرێت ئاستی هاوجووتی و هاوشێوەیی نێوان دوو دەق بزانرێت ( About iThenticate Plagiarism Detection Software, iThenticate, www. ithenticatc. com).




شێوە(٣. ٦)پرۆگرامی (iThenticate)بۆ ئاشکرارکردن و دەرخستنی گزیکاری دەخاتەڕوو

## ۸.۲-پرۆگرامی Turnitin

پرۆگرامی (Turnitin) بە یەکێك لە پرۆگرامە پێشەنگەکانی بواری ئاشکراکردنی گزی زانستی دادەنرێت، ساڵی ١٩٩٦ لە لایەن کۆمەلیك توێژەر لە زانکۆی کایفۆرنیا (UC Berkeley)وەك پرۆگرامێکی بازرگانی سەر بە کۆمپانیای (iParadigms, LLC) دامەزراوە. پرۆگرامەکە ٣١ زمانی لەخۆ گرتووەو لەلایەن زیاتر لە ١٥٠٠٠ زانکۆ و ناوەندی زانستی و پەروەردەیی و ٢٦ ملیۆن بەکاربەر کە مافی بەکارهێنانیان هەیە بەکار دەهێنرێت. بە بەکارهێنانی ئەم پرۆگرامە بەکاربەر دەتوانێت بەراورد لە نێوان بەرهەمێکی تازە لەگەڵ چەندین بەرهەمی نوێ بکات لەسەر ٢٤ بلیۆن لاپەڕەی ئەنتەرنێت و زیاتر لە ٣٠٠ ملیۆن توێژینەوەی بلاوکراوەدا. ئامانجی سەرەکی پرۆگرامەکە باشترکردنی ئاستی نووسینی فێرخوازو توێژەرە نوێکانە لە رێگەی بەربەست دانان لەبەردەم گزیکردن و دەوڵەمەندکردنیان بە تێبینی و رێنمایی زانستی دروست (Education with Integrity. Turnitin, www. turnitin . com).




شێوە(٣. ٧)پرۆگرامی (Turnitin) بۆ ئاشکراکردنی گزیکردن دەخاتەروو

### ٨. ٣-پرۆگرامی DupliChecker

ئەم پرۆگرامە یەکێکە لە ئامرازە هەرە باشەکانی لێکۆڵینەوە لە گزیکردنی زانستی و پشت دەبەستێت بە بنەمای دابەشکردنی دەق بەسەر ڕستەو بەراوردکردنیان بە دەرەنجامەکانی بزوێنەری گەڕان(Search engine)، بەکاربەر بە بەکارهێنانی دەتوانێت بە خێرایی لە ڕێگەی کۆپی کردن و دانان لە شوێنی تایبەتدا لێکۆڵینەوە لە دەقێك بکات کە ژمارەی وشەکانی لە ١٠٠٠ وشە زیاتر نەبێت. شێوازی بەکارهێنانیشی ئاسانە وهەر کەس دەتوانێت بەکار بهێنێت، دەشێت لە ڕێگەی کۆپی کردن و دانان یاخود هەڵگرتنی فایلێك بە کلیککردن لەسەر(Search) لە ماوەی چەند چرکەیەکدا ڕاپۆرتێکی تێرو تەسەل دەربارەی بابەت وهەڵەو کەم و کورتیەکانی بابەتەکە بە دەستەوە دەدات( DupliChecker. Free online Software For Plagiarism Detection,www. duplichecker. com).




شێوە(٣. ٨)پرۆگرامی(DupliChecker) بۆ لێکۆڵینەوە لە گزیکردن دەخاتەڕوو

**٨. ٤-پرۆگرامی Plagiarism Checker**

جۆرێکی ترە لە پرۆگرامەکانی ئاشکراکردنی گزی زانستی و هەرکەس دەتوانێت بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە کێشەکانی گزیکردن بەکاری بهێنێت، ئەم پرۆگرامە یارمەتی کەسی بەکاربەر دەدات لەکاتی لیکۆلینەوە لە دەقێکدا بەشە لێکچوو و هاوشێوەکانی دەقەکە لەگەڵ دەقەکانی تری سەر تۆری ئەنتەرنێت دەربخات، ئەویش بە رێگەی گەڕان لە ١٠ بلیۆن لاپەڕەی پێڕستکراو لە(Google and Bing) کە لە ماوەی چەند چرکەیەکدا ڕاپۆرتیکی تێرو تەسەل دەربارەی دەقەکە بە دەستەوە دەدات، ناوەڕۆکی ڕاپۆرتەکە سەرچاوەگەلی جۆراوجۆر و دیاریکردنی ڕێژەی سەدی گزیکردنی بە ڕەنگی جیاواز لەخۆ گرتووە( Plagiarism Checker. Smallseotools, www. small seotools. com).

شێوە(٣. ٩) پرۆگرامی(Plagiarism Checker) بۆ گەڕان و ئاشکراکردنی دیاردەی گزیکردن و گزیکاری لە نووسیندا دەخاتەڕوو

### ٨. ٥-پرۆگرامی Plagiarism detect

ئامرازێکی تری ئاشکراکردنی گزی زانستیەو بەکارهێنانیشی بە خۆڕاییە، تا ڕادەیەك بە سستی و هێواشی و کار دەکات بەڵام لە بەرامبەردا دەرەنجامی زۆر ورد بە دەستەوە دەدات. بە بەکارهینانی ئەو پرۆگرامە بەکاربەر دەتوانێت لە ماوەیەکی کەمدا وردبینی بۆ بابەتەکەی بکات، سەرەتا دەقەکەی خۆی هەڵدەگریت و لە شوێنی دیاریکراودا دایدەنیت، دواتر دەقەکە دابەش دەبیت بۆ چەند یەکەیەکی زمانەوانی بچووك بە مەبەستی بەراوردکردنی بە سەرجەم دەقە هاوشێوەکان لەسەر تۆرەکانی ئەنتەرنێت کە کراوەن بۆ پرۆسەی پێوانەکردن و بەراوردکردنەکە (Plagiarism Detect,www. plagiarismdetect. org).




وێنە(٣. ١٠)شێوازی بەکارهێنانی پرۆگرامی (Plagiarism detect) بۆ ئاشکراکردن و دەرخستنی دیاردەی گزیکردن دەخاتە ڕوو

### ٨. ٦-پرۆگرامی Plagiarisma

یەکێکە لەو ئامرازە گرنگانەی بۆ لێکۆڵینەوەو وردبینی لە دەقەکان بەکاردەهێنرێت و لەسەر ئاستێکی فراوان فێرخوازان و مامۆستایان و توێژەرانی بواری توێژینەوەکاری پشتی پێ دەبەستن. ئەم پرۆگرامە لەگەل سیستمی ویندۆز(Windows) و ئەندرۆید(Android) و بلاك بێری (BlackBerry) ومودل(Moodle) تۆڕەکانی ئەنتەرنیت(Web) کار دەکات و ، لە لایەن هەریەکە لە (Google, Yahoo, Babylon, Google Scholar and Google Books) پاڵپشتی کراوەو زیاتر لە ١٩٠ زمانی لەخۆگرتووە. بەکاریەر بە بەکارهێنانی ئەم پرۆگرامە لە ڕێگەی هەڵگرتن و کۆپیکردن یان هەڵگرتنی مەلەفێك و دانانی لە شوێنی تایبەتدا دەتوانێت لە ماوەی چەند خولەکێکدا پشکنین و وردبینی بۆ بابەتێك بکات و لە پاکنووسی و ڕەسەنایەتی بابەتەکە دڵنیا بێت ( Plagiarisma. ,Free online plagiarism checker for teachers and students. plagiarisma. net,www. plagiarisma. net).




شێوە(٣. ١١)پرۆگرامی (Plagiarisma) بۆ لێکۆڵینەوەو وردبینی لە دەقی نوسراو لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت دەخاتەڕوو

### ٨. ٧-پرۆگرامی Checkforplagiarism

پرۆگرامی(Checkforplagiarism)بە یەکێك لە ماڵپەرە گرنگەکانی ئاشکراکردنی گزی زانستی دادەنرێت کە بە هۆیەوە کەسی بەکاریەر دەتوانێت وردبینی بۆ بابەتێك بکات و لە ڕەسانەیەتی بابەتەکە دڵنیا بێت، ئەویش لە ڕێگەی دانانی بابەت و ناردنی زانیاری و ناونیشانی ئەلکترۆنی بۆ سایتەکە کە لە ماوەیەکی ڕاپۆرتی وردبینیەکەی لە ڕێگەی ئیمەلەوە بۆ دێت، ڕاپۆرتی یەکەم بێ بەرامبەرە تەنها ڕێژەی سەدی ڕەسانایەتی بابەتەکەی لەخۆگرتووە، بەڵام گەیشتنی ڕاپۆرتی دووەم کە ڕاپۆرتێکی تێرو تەسەلەو زانیاری وردو درشتی دەربارەی بابەتەکە لەخۆ گرتووە پێویستی بە کڕین هەیەو خزمەتگوزاریەکە بەخۆڕایی نابەخشرێت Checkforplagiarism. Why plagiarism checking?,www. checkforplagiarism . )
.(net

شێوە(٣. ١٢)پرۆگرامی (Checkforplagiarism) بۆ ئاشکراکردن و دەرخستنی گزیکردن دەخاتەڕوو

## ٨.٨- پرۆگرامی Ferret Copy Detection Software

پرۆگرامێکی بێ بەرامبەرە ساڵی ٢٠١١ لە لایەن کۆمەڵێك پسپۆری زانکۆی هێرتفۆردشایر (University of Hertfordshire)ی بەریتانی دیزاینی بۆ کراوە و لە لایەن ( Ruth Barrett, Bob Dickerson, Caroline Lyon and James Malcolm) پەرەی پێ دراوە، دواتر بە هاوکاری (Jun-Peng Bao) سیستمی پرۆگرامەکە بە جۆرێك رێکخراوە کەلەگەڵ زمانی چینیدا کاربکات. ئامانجی پرۆگرامەکە دەرخستن و ئاشکارکردنی دیاردەی گزیکردنە لە نامەی ماستەر و دکتۆرا و هەر ئەرکێکی تر کە فێرخوازان ئەنجامی دەدەن. پرۆگرامەکە لە کارکردندا پشت بە سیستمی کارکردنی ویندۆز (Windows) دەبەستێت و یەکێکە لەو پرۆگرامانەی کە لەگەڵ زمانی عەرەبیشدا کار دەکات ( Ferret - Copy-detection software. University of Hertfordshire,www. homepages. herts. ac. uk).




شێوە(٣. ١٣)پرۆگرامی(Ferret Copy Detection Software) بۆ دەرخستن و ئاشکراکردنی دیاردەی گزیکردن دەخاتەڕوو

### ٨. ٩ –پرۆگرامی Grammarly

پرۆگرامی(Grammarly) بریتیە لە لێکۆڵەر و وردبینێکی ڕۆبۆتی کە بە ئاسانی دەتوانێت نوسراوەکان بخوێنیتەوەو هەڵەو کەم و کورتیەکانیان دەربخات، ئەم پرۆگرامە لەسەر ١٦ ملیار لاپەڕەی ئەنتەرنێت کار دەکات. کەسی بەکارهێن لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەم وردبینە ڕۆبۆتیە دەتوانێت دەقی بابەتەکەی بە بابەت و توێژینەوەکانی نێو ملیارەها لاپەڕەی ئەنتەرنێت بەراورد بکات و بە هۆیەوە بە سەرجەم کەم و کورتیە زمانی و ڕێزمانیەکانی بابەتەکەی بزانێت و ڕێژەوەکانی گزیکردن و بەرهەمی چاپکراو بلاَوکراوەی هاوشێوەی بابەتەکەی بۆ ئاشکرا بێت، هەروەها یەکێکە لەو پرۆگرامانەی کە لەسەر ئاستێکی بەرافراوان لە هەموو جیهاندا بەکاردەهێنرێت. (Parker,٢٠١٨).




شێوە (٣. ١٤)دەرکەوتنی دەرەنجامەکان بەبەکارهێنانی پرۆگرامی(Grammarly) بۆ لیکۆلینەوەو ساغکردنەوەی دەقیکی نوسراو لەسەر تۆری ئەنتەرنێت ڕوون دەکاتەوە

### ٨. ١٠ –پرۆگرامی PlagScan

پرۆگرامێکی تری ئاشکراکردن و دەرخستنی گزی زانستیە و لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت کاردەکات ، یەکێکە لەو ئامرازە گرنگانەی مامۆستاو فێرکارەکان بە مەبەستی یارمەتیدانی فێرخوازان بۆ باشترکردنی شێوازی نوسینیان و چۆنیەتی بەکارهێنان وسوود وەرگرتن لەسەرچاوەی زانستی بە شێوەیەکی دروست بەکاری دەهێنن. ئەم پرۆگرامە ساڵی ٢٠٠٩ لە لایەن دوو پسپۆڕی پرۆگرامسازی ئەڵمانی مارکوس گۆلدباخ (Markus Goldbach) و یوهانز کناب (Johannes Knabe) داهێنراوەو ئێستا لە زانکۆکانی ئەڵمانیاو ئوتریش و سویسرا بە شێوەیەکی بەرفراوان و زۆرێك لە پەیمانگا و زانکۆی تر بەکاردەهێنرێت، لە دوای ٢٠١٥ ساڵی زیاتر لە ١٠٠٠ دامەزراوەی ئەکادیمی لە جیهاندا ئەم پرۆگرامە بەکاردەهێنن لە ناویاندا زانکۆی ئەردەنی (University of Jordan) و زانکۆی فۆرتس کۆلیج–لارگۆ ( Fortis College Largo) و زانکۆی بەرلینی ئازاد (Free University of Berlin) و چەندین زانکۆ و پەیمانگا و ناوەندی ئەکادیمی تر (info . What is plagscan,Word finder,www. findwords).



شێوە(٣. ١٥)پرۆگرامی(PlagScan)بۆدەرخستن و ئاشکراکردنی گیزیکردن دەخاتەڕوو

## ٨. ١١-پرۆگرامی Eve Plagiarism Detection System

ئەم پرۆگرامە بە یەكێك لە پرۆگرامە كۆنەكانی بواری ئاشكراكردنی گزی زانستی دادەنرێت، لە ماوەی كاركردنیدا لە ساڵی ٢٠٠٠ تا ئەمڕۆ زیاتر لە ١٥٠ ملیۆن پرۆسەی وردبینی ئەنجام داوە، پرۆگرامێكی تا ڕادەیەك كۆنەو بەكاریەر لە بەرامبەر بەكارهێنانیدا پێویستە ٢٩. ٩٩ دۆلاری ئەمەریكی بدات( Top ٨ Plagiarism Detector Tools for Teachers, Educational Technology and Mobile Learning,www. educatorstechnology .com).




شێوە(٣. ١٦)چۆنیەتی كاركردنی پرۆگرامی(Eve Plagiarism Detection System) بۆ ئاشكراكردنی گزیكردن لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت ڕوون دەكاتەوە

### ٨. ١٢-پرۆگرامی Essay Verification Engine

پرۆگرامێکی ترە لە پرۆگرامەکانی بواری ئاشکراکردن و دەرخستنی گزی زانستی کە لە هۆیەوە کەسی بەکارهێن دەتوانێت وردبینی بۆ دەقێك بکات لە رێگەی بەراوردکردنی بە دەقەکانی تری سەر تۆری ئەنتەرنێت. ئەم پرۆگرامەتا رادەیەك جیاواز لە پرۆگرامەکانی تر و راستەوخۆ لەسەر تۆری ئەنتەرنێت نابێتەوە، بەڵکو پێویستی بە داگرتن هەیە لەبەرامبەر ٢٩. ٩٩ دۆلاری ئەمەریکی.

شێوە(٣. ١٧)پرۆگرامی ئەلکترۆنی (Essay Verification Engine) بۆ دەرخستن و ئاشکراکردنی گزیکردن دەخاتەڕوو

### ٨. ١٣-پرۆگرامی Plagrtracker

یەکێکە لە سەرنج ڕاکێشترین پرۆگرامەکانی ئاشکراکردنی گزی زانستی و بە بێ بەرامبەر لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێتدا کار دەکات، ئەم پرۆگرامە دەتوانێت لێکۆڵینەوە لە دەقێك بکات بە مەرجێك ژمارەی پیتەکانی لە ٥٠٠٠ پیت زیاتر نەبێت، دوای نزیکەی ٣٠ خولەك ڕاپۆرتی وردبینیەکە لە ڕێگەی ناونیشانی ئەلکترۆنیەوە بۆ کەسی بەکارهێن دەنێرێت (اوباری، ٢٠١٥).




شێوە(٣. ١٨)پرۆگرامی(Plagrtracker)بۆ ئاشکراکردن و دەرخستنی گزیکردن دەخاتەڕوو

## ٨. ١٤-پرۆگرامەکانی Plagtracker,Copycatch,Paperrater and Plagiserve

پرۆگرامی(Plagtracker) پرۆگرامێکی بێ بەرامبەرە بۆ لێکۆڵینەوە و وردبینی لە دەقێکی بلاوکراوە بەکاردەهێنرێ بە مەرجێك ژمارەی وشەکانی لە ٥٠٠٠ وشە زیاتر نەبێت، لەگەل زمانەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەلمانی و ئیتالی و ئیسپانی و رۆمانی کاردەکات، لەسەرەتای بەکارهێنانیدا داوای ناونیشانی ئەلکترۆنی لە کەسی بەکاربەر دەدات ولە دوای ٣٠ خولەك راپۆرتی هەڵسەنگاندنی بۆ دەنێرێت (اوباری، ٢٠١٥).

پرۆگرامی(Copycatch)جۆرێکی ترە لە پرۆگرامەکانی ئاشکراکردن و دەرخستنی دیاردەی گزیکردن کەسی بەکارهێن دەتوانێت لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر جێگیری بکات. ئەم پرۆگرامە بە مەبەستی ئاشکراکردنی رێککەوتن و لە ژێرەوە رێککەوتنی فێرخوازەکان بەکاردەهێنرێت لە رێگەی لێکۆڵینەوە لە لێکچوون و هاوشێوەیی نێوان وشەو دەستەواژەکان لە کاتی پێشکەشکردنی کارێکی بە کۆمەڵدا. خالی بەهێزی پرۆگرامەکە لەوەدایە کە بە ئامرازێکی گرنگ دادەنرێت بۆ یارمەتیدانی فێرخوازان و باشترکردنی توانستی نووسینیان لە رێگەی نیشاندانی ئەو شێوێنانەی کە هەڵەیان تێدا کردووەو ئەو سەرچاوانەی کە بە باشی بەکاریان نەهێناوە و ئامازەی تەواویان پێ نەرکردووە، بەلام خالی لاوازی پرۆگرامەکە لەوەدایە کە توانای ئاشکراکردنی ئەو بابەتانەی نیە کە لە سایتەکانەوە دادەبەزێنرێن (Kent& Salim,٢٠٠٩).

پرۆگرامی(Paperrater)جۆرێکی ترە لە پرۆگرامەکان و پشت بە سیستمی زیرەك و زانستی داتایی و هەڵسەنگاندنی میکانیکی دەبەستێت، کەسی بەکارهێن لە لە رێگەیەوە دەتوانێت وردبینی بۆ دەقێك بکات و دوای ٥-١٥ چرکە وەلامی وردبینیەکەی وەربگرێتەوە (Parker,٢٠١٨). هەروەها پرۆگرامی(Plagiserve) پرۆگرامێکی تری ئاشکراکرن و دەرخستنی گزی زانستی و لەسەر تۆری ئەنتەرنێت کار دەکات، لە کاتی بەکارهێنانیدا کەسی بەکارهێن پێویستە بە یەك جار بابەتەکانی پێشکەش بکات و لە رێگەیەوە دەتوانێت وردبینی بۆ بابەتیك بکات و لە پاکی و رەسەنایەتی ناوەرۆکی بابەتەکە دڵنیابێت. ئەم پرۆگرامە خاوەن چوارچێوەیەکی زانیاری فراوانە پێك هاتووە لە ٩٠,٠٠٠ هەزار لاپەرە لە وتار و لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر لە ماوەی ١٢ کاتژمێردا راپۆرتی بابەتەکە بە دەستەوە دەدات( Kent& Salim,٢٠٠٩).

## ٨. ١٥-پرۆگرامەکانی کارنێت و ئەلپاگ و مەعریفە Qarnet,Aplag and E-marefa

پرۆگرامی کارنێت(Qarnet)لە داهێنانی کۆمپانیایەکی سعودیەو تایبەتە بە ئاشکراکردن و دەرخستنی گزی زانستی، ئامانجی سەرەکی پرۆگرامەکە بریتیە لە رێگریکردن لە گزیکردن لە رێگەی لێکۆڵینەوەو وردبینی لە رەسانەیاتی توێژینەوەکان بە شێوازێکی فێرکاری و رێنماییکاری، لەگەڵ چەندین زماندا کاردەکات لە ناویاندا زمانی عەرەبی، بۆیە لە زۆربەی کاتدا بۆ لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوەی دەقە عەرەبیەکان بەکاردەهێنرێت. سیستمی کارکردنی پرۆگرامەکە بە تەنها پشت بە لێکۆڵینەوە لە لێکچوون و هاوشێوەیی دەقەکان نابەستیت، بەڵکو پشت بە زۆر لایەنی تری وەك وەرگرتنی دەق لە رێگەی گۆرینی وشەو دەستەواژەو دوبارە دارشتنەوەیان و بەکارهێنان و سوود وەرگرتن لە بیرۆکەو شێوازی نووسینی کەسانی تر دەبەستێت (قنبر وعبداللة، ٢٠١٧).

پرۆگرامی ئەلپاگ(Aplag) پرۆگرامێکی تری ئاشکراکردن و دەرخستنی گزیی زانستیە لە زمانی عەرەبیدا، ناوەکەی کورتکراوەی دەستەواژەی (Arabic Plagiarism)یەو ساڵی ٢٠١١ لە لایەن بەشی ئینفۆرماتیکی زانکۆی شا سعود لە عەرەبستانی سعودی داهێنراوە، پرۆگرامێکی تایبەتە بەکارکردن لەسەر ئاشکراکردنی دیاردەی گزیکردن لە دەقی عەرەبی دەکات بە پشت بەستن بە بنەمای لۆژیکانەو زانستیانەی دەق لە رووی برگەو رستەو وشەکان و بەراوردرکردنی بە ١٢ دەقی تردا (صالح و السيد، ٢٠١٤).

هەروەها یەکێکی تر لەو پرۆگرامانەی بە مەبەستی دەرخستن و ئاشکراکردنی دیاردەی گزیکاری و ناپاکی ئەکادیمی لە ناو دەق و توێژینەوەعەرەبیەکان بەکاردەهێنرێت پرۆگرامی ئەلمەعریفە(E-MAREFA) ی ئوردەنیە، ئەم پرۆگرامە لە داهێنانی کۆمپانیای (المعرفە)ی ئوردنیە و بە هاوکاری و رێککەوتنی ٢٨٠ زانکۆ و ناوەندی ئەکادیمی و رێکخراوی هەرێمی لە ١٩ وڵاتی عەرەبی کارەکانی ئەنجام دەدات، کەسی بەکارهێن بە کارهێنانی پرۆگرامەکە دەتوانێت لێکۆلینەوەو وردبینی بۆ دەقێکی عەرەبی بە بەراوردکردنی دەقەکە بە ٢٥٠,٠٠٠ هەزار دەقی تر بکات، دوای پرۆسەی وردبینیەکە راپۆرتێکی تێرو تەسەلی دەربارەی هاوجووتی و ناهاوجووتی دەقەکە لەگەڵ دەقەکانی تر و هەر کێماسی و ناتەوایەك کە لە دەقەکەدا هەبێت بە دەست بکات (قنبر وعبداللة، ٢٠١٧).

## ٩-بەناوبانگترین دیاردەکانی گزیکردن The most famous cases of plagiarism

گزیکردن(plagiarism) بە هەموو شێوەو جۆرەکانیەوە بریتیە لە دەست درێژی کردن بۆسەر بەرهەمی نوسراوی کەسانی تر بە مەبەستی سوود وەرگرتن لە بەرهەمەکانیان لە کاریکی ئەدەبی یان زانستی بە بێ ناو هێنان و ئاماژەکردن بەسەر چاوەکانیان، خودی کردارەکەش چ لە زانکۆو یان ناوەندە ئەکادیمی و زانستیەکان لە بواری توێژینەوەو توێژینەوەکاری، یان لە لە بوارەکانی تری ئەدەبی و هونەری و زانستی ئەنجام بدرێت گزیکردنەو ناشیرینترین جۆری ناپاکیە کە مرۆڤ ئەنجامی بدات و کاریگەریەکانی بە شێوەیەکی گشتی لەسەر تاك و کۆمەلگا بریتین لە:

- گزیکردن دەبێتە هۆی زیادبوونی رێژەی ناپاکی و گەندەڵی لە کۆمەلگادا.
- گزیکردن کاریگەری ڕاستەوخۆی لە سەر کەسایەتی وئاکار و رەوشت و باری دەروونی و کۆمەلآیەتی کەسی گزیکار هەیە.
- گزیکردن وەك پرۆسە هەڵخەلەتاندنی خود وکەسانی ترە، بۆیە کەسی گزیکار هەمیشە لە دۆخێکی ناسەقامەگیری دەروونیدا دەژیت، هەمیشە هەست بە هەڵەو تاوانی کارەکە دەکات، یان هەست دەکات ئەو شتەی لە ڕێگەی گزیکردنەوە بە دەستی هێناوە بەرهەمی عەقڵ و بیرو ڕەنج و ماندووبوونی خۆی نیە.
- گزیکردن کاریگەری لەسەر نەوەکانی داهاتوو ئاییندەو دوارۆژی کۆمەڵگا هەیە.

گزیکردن(plagiarism) دیاردەیك نیە تەنها پەیوەست بێت بە فێرخوازان و نوسەر و توێژەرە لاوەکان کە تازە چوونەتە نێو دونیای نووسین و توێژینەوەکاری و بە هەر هۆکارێکەوە بێت دەستیان بۆ گزیکردن بردووە، بەڵکو زۆریك لە نوسەر و هونەرمەند و سیاسەتمەدار و توێژەرە بەئەزموون و ناودارەکانیش دەستی بۆ دەبەن و لە ڕابردووشدا چ بە مەبەست یان بێ مەبەست دەستیان بۆ بردووە، زۆریك لە کەسایەتیە گەورەکان بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا بە ئەنجامدانی گزیکردن لە کارەکەیاندا تاوانبارکراون. ئەمانەی خوارەوە دیارترین کەیسی ئابڕوچوونی ناپاکی و گزیکردنن کە لە لایەن کەسایەتیە بەناوبانگەکانی جیهان ئەنجامدراوە.

## ٩. ١–هیلین کیللەر و گزیکردن لە قۆناغی منداڵیدا Helen Keeler and plagiarism in childhood

هیلین کیللەر[١٥](Helen Keller)نوسەر و ئەدیبێکی مەزنی سەدەی نۆزدەهەم بووە، لە تەمەنی شەش بۆ حەوتساڵی بە هۆی دووچاربوونی بە هەورکردنی چاو و نەخۆشی تاراخوما هەردوو هەستی بینین و بیستنی لە دەست داوە، بەڵام کوێری و کەڕی نەبۆتە بەربەست لەبەردەم خواست هێنانەدی ئامانجەکانی و هەستکردن بە کەمێتی و وای لێ کردووە ڕۆژ بەڕۆژ لە هەوڵ وکۆششدا بێت تا گەشتۆتە ئەو ئاستەی ببێت بە یەکێك لە نوسەر و ناوەدیارەکانی سەردەمی خۆی، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی هەمیشە وەك نموونەی ئافرەتێکی مەزن و ئیرادەو خۆڕاگری مرۆڤانە ناوی بهێنرێت.

کیللەر(Keller)جگە لەوەی نوسەرو چیرۆکنووسێکی گەورە بووە، وانەبێژو چالاکوانێکی سیاسی و کۆمەلأیەتی دیاری سەردەمی خۆی بووە، لە ژیانی سیاسی و کۆمەلأیەتیدا بەشداری چەندین چالاکی سیاسی و کۆمەلأیەتی کردووەو دامەزرێنەری چەندین ناوەند و ڕێکخراوی سیاسی و کۆمەلأیەتی و ڕێکخەری چەندین میتینگ بووە، لە ماوەی ژیانیدا ١٨ شاکاری بێ وێنەی نوسیووە کە بە هۆیانەوە چەندین خەلأتی جیهانی بەدەست هێناوە، بەرهەمەکانیشی بۆ سەر زیاتر لە ٥٠ زمان وەرگێردراون وبەناوبانگترینیان بریتین لە چیرۆکی ژیانم( The Story of

[١٥] هیلین کیللەر(Helen Keller) نوسەرو چیرۆکنوس و چالاکوانێکی ئەمەریکی بە ڕەگەز ئەڵمانیە، ساڵی ١٨٨٩ لە شاری تۆسکومبیا(Toscumbia)ی ویلایەتی ئەلەباما(Alabama)لە ئەمەریکا لە دایك بووە،وەك منداڵێکی ساغ لە دایك بووە بەڵام لە تەمەنی هەشت مانگیدا دووچاری چاوئێشەی گرێداربووە بە هۆیەوە کوێربووەو هەستی بیستنیشی لەدەست داوە،بەهۆی ئەوەی نابینا و نابیسا بووە لە سەنتەری پیرکنز(Perkins)کە تایبەت بووە بە ڕاهێنان و فێکردنی کەسانی نابیناو نابیسا لە ژێر سەرپەرشتی ئانانۆس (Anagnos)بەرپرسی سەنتەر و یەکێك لە مامۆستاکانی بە ناوی ئان سولیڤان مێسی( Anne Sullivan Macy)فێری خوێندنەوەی نوسین بووە،لە قۆناغی منداڵی سەرەتاییەوە دەستی بە نوسین کردووەو تا دوا ساتەکانی ژیانی بەردەوام بووە کە بەرهەمەکی هەژدە شاکاری گەورەو بۆسەر زیاتر لە ٥٠ زمان وەرگێردراون،ساڵی ١٩٠٤ لە تەمەنی بیست و چوار ساڵیدا بەکالۆریۆسی لە فەلسەفەو زانست بە دەست هێناوە،لەگەل ئەوەی نابینا بووە بەلام فێری شوفێری و مەلەوانی بووە،بەشداری چەندین میتینگ و کۆبوونەوەو ڕێکخراوی سیاسی و کۆمەلأیەتی کردووە،زۆربەی کاتی خۆی بۆ خزمەتکردنی کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت تەرخان کردووە.ساڵی ١٩٦٨ لە تەمەنی حەفتاوهەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

(My Life)، مامۆستا(Teacher:Anne Sullivan Macy) که کۆمەڵە چیرۆکێکە دەرباری مامامۆستاکەی ئان سولیڤان میسی(Anne Sullivan Macy)، دەرچوون لە تاریکی( Out of the Dark)، ئەو جیهانەی تیایدا دەژیم(The World I Live In)، گەشبینی (Optimism)، بۆ خۆشەویستی ئەم ژیانە(To Love This Life)، هیلین کیللەر لە سکوتلەندا ( Helen Keller in Scotland) ، گۆرانی دیوارە بەردینە(The Song of the Stone Wall)، ئایینی من(My Religion)، بۆ ژیان و بۆ بیرکردنەوەو بۆ ئومید: بەخششێك( To live,To Think,To Hope:Inspirational)، چۆن یارمەتی جیهان بدەم ( How I Would Help the World)، چۆن سۆشیالیستێك بم(How I became a Socialist)، پاشای سەرهەڵگرتوو(The Frost King)، دەرگای کراوە(The Open Door)، ژیانی یاخی بووەکان(Rebel lives)، ڕوناکیەك لە نێوتاریکیمدا(Light in My Darkness) دوای مردنیشی چەندین فیلمی بەڵگەنامەیی دەربارەی ژیان و تێکۆشانی بەرهەم هێنراون کە بە ناوبانگرینیان فیلمی خولقینەری موعجیزە (The Miracle Worker) و چەندین فیلمی کارتۆنی کە گوزارشتیان لە سەرتای ژیان وقۆناغی منداڵی ئەو کردووە (حفیضی، ٢٠١٧).

ساڵی ١٨٩٢ کیللەر(Keller) بە گزیکردن لە یەکێك لە بەرهەمەکانیدا تاوانبار دەکرێت ، کاتێك لە تەمەنی ١١ ساڵیدا چیرۆکی پاشای شێرەبەفرینە(The Frost King) دەنووسێت و بۆ مایکل ئانانۆس (Michael Anagnos)ی بەرپرسی سەنتەری پیرکنز (Perkins) بۆ فێرکردن و ڕاهێنانی منداڵانی خاوەن پێداویستی تایبەتی دەنێرێت بۆ ئەوەی لە ڕۆژی لە دایك بوونیدا وەك دیارییەکی بە نرخ پێشکەشی بکات، ئەویش بە چیرۆکەکە سەرسام دەبێت و لە ڕاپۆرتی سەنتەرەکە بڵاوی دەکاتەوە. دوای ماوەیەك لە کاتی بەراوردکردنی چیرۆکەکە بە چیرۆکێکی مارگریت کانبی (Margaret Canby)بە ناونیشانی (The Frost Fairies) کە پێشتر لە کتێبی کۆمەڵە چیرۆکی (Birdie and His Friends) بڵاو کرابووەوە دەرکەوت هاوشێوەیی و لێکچوونێکی لە ڕادەبەدەر لە نێوان هەردوو چیرۆکەکەدا هەیە، بۆیە ناوبراو کیللەر(Keller)ی بە گزیکردن لە چیرۆکەیدا تاوانبارکرد. ئەم ڕوداوە بووە هۆی ئەوەی لیژنەیەك لەسەنتەری پیرکنز (Perkins)بە سەرپەرشتی ئانانۆس(Anagnos)بۆ لێکۆڵینەوە لە کەیسەکە پێك بهێنرێت. کیللەر(Keller)لە سەرەتادا بە توندی نکوڵی لەوەکرد کە پێشتر چیرۆکەکەی کانبی(Canby) خوێندبێتەوەو ڕوداوەکەی بە دوو شتی هاوشێوەو نزیك لەیك چوواند، ئەم

لێکچوونەش تەنها ڕێکەوتێك بووەو هیچ زانیارییەکی پێشینەی دەربارەی ناوەڕۆکی چیرۆکەکەی کانبی(Canby) نەبووە، هاوتا لەگەڵ کیللەر(Keller) مادام سولیڤان ( Miss Sullivan) ی مامۆستاکەشی سەرسەختانە داکۆکی لە کیللەر کرد و بە توندی وەڵامی تۆمەتبارکردنەکەی دایەوە، ئەم شێوازە توندەشیان ئانانۆس(Anagnos)و لیژنەکەی زیاتر نیگەران کرد. لە کۆتاییدا لیژنەی لێکۆڵینەوە ڕوونیان کردەوە کیللەر(Keller) پێشتر چیرۆکەکەی خوێندۆتەوە پێش ئەوەی کانبی(Canby) بڵاوی بکاتەوە، ئەمەش لە کاتێکدا بووە کە منداڵ بووەو وێنەیەکی دەستنوسی چیرۆکەکەی لە ماڵی سۆفیا سی هەپکنیز( Sophia C. Hopkins) لە بروستر (Brewster) بینیووە، بەلاَم سوود وەرگرتن لەناوەڕۆکی چیرۆکەکەو بەکراهێنانی لە لایەن کیللەر (Keller) مەبەستدار نەبووە، بەڵکو سەرچاوەی زانیاری چیرۆکەکەی بیرچۆتەوەو ڕووداوەکانی ناو چیرۆکەکە وەك زانیاری گشتی لە هزرو خەیاڵیدا ماون، بەمەش کیللەر لە لێکۆڵینەوەکەدا تا ڕادەیەك بە پاکی دەرچوو، بەلاَم ڕووداوەکە کاریگەری زۆری لەسەر داناوە، چونکە بووە هۆی لەکەداربوونی کەسێتی و لە دەستدانی ئانانۆس (Anagnos) کە نزیکترین وئازیترین کەسی بوو بە جۆرێك تا لە ژیاندا بوو کاریگەری ڕووداوەکەی لەسەر مابوو (Boles,٢٠١٤) & (Monceaux ,٢٠١٥).

خاڵی سەرنج ڕاکێش لە چیرۆکی گزیکردنی (Keller)لەوەدایە کە یەکەم منداڵی نابینا و نابیسابووە بە بەکارهێنانی ڕێگەی بریل (Braille)فێری خوێندنەوەو نووسین بێ و بە هەوڵ و کۆششی بێ وچانی ببێت بە یەکێك لە نوسەرە گەورەکانی جیهان، یەکەم ئافرەتی نوسەر بووە کە بە بێ بینین و بیستن چەندین شاکاری مەزن پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکات کە بۆ هەتایە وەك سەرمایەیەکی ئەدەبی و فیکریی مرۆیی دەمێننەوە، بەلاَم هەر ئەو ئافرەتە بلیمەتە لە قۆناغێکدا لە یەکێك لە بەرهەمەکانیدا دووچاری گزیکردن بووە تا ئەو ئاستەی نەیتوانییوە پەردەپۆشی بکات و دانی بە گزیکردنەکەدا ناوە. چیرۆکی کیللەر(Keller) و ژیانی بوێرانەو پڕ لە دەستکەوتی نوسەرێکی نابیناو نابیسای مەزن کە لە هەڵوێستێکدا دووچاری گزیکردن بووە ئەو ڕاستیە ڕوون دەکاتەوە گزیکردن پەڵەیەکی ڕەشە تەنانەت دوای مەرگیش بۆ هەمیشە بەسەر ناو ناوبانگی کەسی گزیکاردا دەمێنێتەوە.

### ٩. ٢-ستیفان ئەمبرۆز و گزیکردن لە نووسینی مێژوودا Stephen Ambrose and Plagiarism in Writing History

سیفان ئیدوارد ئەمبرۆز(Stephen Edward Ambrose) نوسەر و یادەوەری نووس و مێژوو نووسیکی ناوداری ئەمەریکیە، ساڵی ١٩٦٢ دکتۆرای لە زانکۆی ویسکونسن ( University of Wisconsin) لە بواری مێژوو بەدەست هێناوە، نزیکەی ١٣ کتێبی دانسقەی دەربارەی مێژووی ئەمەریکا و ژیاننامەو یادەوەری چەندین کەسایەتی ناوداری وڵاتەکەی نوسیووەتەوە بە جۆرێك نووسینەکانی ڕەهەندێکی جەماوەریان هەبووە، بەڵام لە دوا ڕۆژانی ژیانیدا بە گزیکردن تۆمەتبارکرا (Stephen Edward Ambrose, www. britannica. com).

ساڵی ٢٠٠٢ لە کاتێکدا کتێبیەکانی ئەمبۆرز(Ambrose) پرفرۆشترین کتێب بوونە لە ئەمەریکا بە کۆپی کردنی چەند بەشێك لە کتێبەکە تازەکەی بەناونیشانی (The Wild Blue) تاوانبار کرا، چونکە ڕوداوەکانی ناو کتێبەکە لێکچوون و هاوشێوەیەکی زۆریان لەگەڵ ڕووداوەکانی ناو کتێبێکی تۆماس چایلدرز(Thomas Childers) هەبوو کە لە ساڵی ١٩٥٥ بە ناونیشانی (The Wings of Morning) بڵاوی کردۆتەوە، هەردوو کتێبیەکە باسیان لە چیرۆکی دوو فرۆکەوان لە جەنگی جیهانی دووەمدا کردووە، ئەمبرۆز (Ambrose) لە کتێبە تازەکەیدا چەندین برگەو دەستەواژەی ناو کتێبەکەی چایلدرز (Childers)ی بە بێ ئاماژەکردن بە بە خۆی و کتێبەکەی وەك خۆی بەکارهێناوە.

سەبارەت بە لێکۆلینەوە لە بابەتەکە فرید بارنس (Fred Barnes) نوسەر و بەرێوەبەری نووسینی گۆڤاری (The Weekly Standard)ئاماژەی بە چەندین دەستەواژەی وەك (glittering like mica) کردووە کە لە هەردوو کتێبەکەدا هەن بەڵام نوسەری دووەم ئاماژەی بە سەرچاوەی نوسەری یەکەم نەکردووە، بۆیە ڕەخنەی توندی لە ئەمبرۆز(Ambrose) گرت و دیاردەکەی بە گزیکردنێکی ئاشکرا ناوبرد، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەمبۆرز(Ambrose) دووچاری ئابروچونێکی گەورە بێت وکەیسی ئابروچوونەکەی لە سەرجەم هەواڵنامەو دەزگاکانی ڕاگەیاندا دەنگ بداتەوە، بە تایبەت دوای ئەوەی مارك لویس(Mark Lewis) لە گۆڤاری (Forbes. com)چوار دیاردەی تری گزیکردنی لە کتێبەکانی دیکەی ئەمبرۆز (Ambrose) ئاشکرا کرد(Kirkpatrick ,٢٠٠٢).

## ٩. ٣–ڤیڤیان ویستوود و گزیکردن لە نووسینی یادەوەریدا Vivienne Westwood and Plagiarism in Biography

ڤیڤیان ئیزابیل سوایر(Vivienne Isabel Swire) کە بە ڤیڤیان ویستوود ( Vivienne Westwood)ناسراوە ساڵی ١٩٤١ لە گلۆسۆپ، دیربیشایر(Glossop, Derbyshire) لە بەریتانیا دایك بووە، یەکێکە لە بەناوبانگترین دیزاینەری جل و بەرگ لە جیهاندا و تەنانەت ناوبانگەکەی لە بواری دیزایندا لە سەرەتاسەری جیهاندا بلاّبۆتەوە، سەرەتای ئەو ناوبانگەشی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی ساڵانی حەفتاکان کاتێك لە دەستپێکی کارەکانیدا لە سەر شێوەی پانك ڕۆك(punk rock)دیزایینی بۆ جل و بەرگەکانی کردووە، ساڵی ١٩٦٢ لەگەڵ دیریك ویستوود (Derek Westwood)دا هاوسەرگیری ئەنجام داوەو بە هۆیەوە بە نازناوی هاوسەرەکەی وەرگرتووە، بەلاّم دوای سێ ساڵ لە یەکتر جیابوونەوەتەوەو.

ویستوود(Westwood) لە ئێستادا خاوەنی کۆمپانیایەکی گەورەی جل و بەرگە بە جۆرێك بەهای کۆمپانیاکەی بە ٥٥ ملیون دۆلار دەخەملێنرێت، لە ماوەی ژیانیدا چەندین جار خەلاّت کراوەو چەندین نازناوی گەورەی لە بواری کارەکەیدا بەدەست هێناوە، بۆ دوو جار نازناوی باشترین دیزایینەری بەریتانیا بەدەست هێناوە، ساڵی ١٩٩٢ بە هۆی داهینانەکانی لە بواری دیزاییندا میدلیای ئیمپراتۆری بەریتانیای پێ بەخشراوە، لە ماوەی ٣٠ ساڵ کارکردن و داهێنان و لەگەڵ هەموو ئەو ناوبانگ و سامانەی کە بەدەستی هێناوە کەچی وەك مرۆڤێکی ئاسایی لە باشووری لەندەن لە هەمان ماڵە سادەکەی جارانی ژیاوە کە کرێی مانگانەکەی ٤٠٠ دۆلار بووە و بە پاسکیلیش هاتوچۆی کۆمپانیاو شوێنی کارکردنی کردووە.

ویستوود(Westwood) ئافرەتێکی سادەو زادەی پەروەدەو پێگەیاندنی ناو خێزانێکی ساکار بووە، لە کابانی ماڵەوە بۆتە بەناوبانگترین دیزایینەری جل و بەرگ، لە ئاستێکی بژێوی مامناوەندەوە بۆتە سەرمایەدارێکی گەورەی ولاّتەکەی، بەلاّم لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ناوبانگ و دەوڵەمەندیەکەی ژیانی سادەی جارانی لێ نەسەندۆتەوە، بۆیە شێوازی ژیانی ئەو ئافرەتە بۆتە جێی سەرنجی زۆرێك لە میدیاکاران و دامەزراوە ئەدەبی و هونەریەکان بووەو چەندین بابەتی ئەدەبی و هونەریان نمایش کردووە کە گوزراشتیان لە ژیانی ویستوود(Westwood) و ڕاز و نهێنیەکانی ئەو ئافرەتە کردووە، لە دواترین کاری هونەریشدا لە ولاّتە یەکگرتووەکانی

ئەمەریکا لە تەمووزی ٢٠١٨ فیلمێکی بەڵگەنامەیی بەناو نیشانی(Westwood: Punk، Icon، Activist) لە دەرهێنانی لۆرنا تاکەر(Lorna Tucker) لەسەر ژیانی ویستوود بەرهەم هێنرا (Vivienne Westwood. Biography,www. biography. com).

گرنگترین کاری ویستوود(Westwood) لە بواری نووسیندا نووسینەوەی یادەوەریەکانیەتی ، بەلآم لە تۆکتۆبەری ساڵی ٢٠١٤ ویستوود(Westwood) بە گزیکردن لە کتێبی یادەوەریەکانی تاوانبار کرا، ئەم تاوانبارکردنەش دوای ئەوە هات کاتێك پۆل گورمان(Paul Gorman)لە کتێبی (The Look: Adventures in Rock and Pop Fashion) ئاماژەی بە زیاتر لە ٤٠ لاپەرەی کتیبی یادەوەریەکانی ویستوود(Westwood)کرد کە لە کتێبەکانی ئەو وەری گرتووە، رەخنەی توندی لە ویستوود ونوسەر بەشداربووی کتیبەکە ئیان کیلی(Ian Kelly)و دەزگای چاپ و وەشانی کتێبەکە گرت. بەمەش کتێبەکە بە هۆی لێڵی و نادیاری و مێژووی شێوێندرا و بوونی هەڵەی رێنوسی زۆر ڕووبەڕووی رەخنەی زۆر لایەن بووەوە، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا بڕیاری کێشانەوەی کتێبەکە لە بازاڕ نەدراوەو پێداچوونەو ڕاستکردنەوەشی بۆ نەکراوە.

گرنگی چیرۆکی ویستوود(Westwood) لەوەدایە کە ئەو یەکێك بووە لە بەناوبانگترین دیزاینەرەکانی جل و بەرگ لە جیهاندا و بە هۆی ناوبانگ و پیشەکەیەوە کتێبەکەی پڕ فرۆشترین کتێب بووە لە ساڵی ٢٠١٤، نووسینی یادەوەریش تەنانەت ئەگەر کەسێکی تریش بەشدار بوویێت لە نووسینیدا کارێکی کەسیەو گوزارشت لە ژیان و کارنامەی ڕابردووی کەسەکە خۆی دەکات و تیایدا کەسایەتی و خودی یادەوەری نووس ڕەنگ دەداتەوە، بۆیە ئەگەر کرداری گزیکردنەکە کاریگەریشی لەسەر ناو ناوبانگ و کارەکەی وەك دیزاینەرێکی بەناوبانگی جل و بەرگ نەبووبێت ، بێگومان کاریگەری زۆری بەسەر خودی کتێبەکە و بەهاو ڕاستگۆیی کتێبەکەی لەناو جەماوەردا هەبووە، چونکە نووسینی یادەوەری کارێکی کەسی و ڕەنگدانەوەی ئەزموونی کەسیە زۆر دوورە لە بابەتەکانی گزیکاری وناپاکی کردن لە نووسینیدا، لەوەشیاندا هەم ویستوود (Westwood)و هاورێی بەشداری وهەمیش شوێن و دەزگای چاپکەری کتێبەکە شکستیان هێناوە (Bailey , ٢٠١٤).

## ٩. ٤-دیدریك ستاپل و گزیکردن له بواری لێکۆڵینەوە له دەروونزانی زانین Diederik Stapel and plagiarism in Cognitive psychology

دەروونزان و توێژەری بەناوبانگی هۆڵەندی دیدریك ستاپیل(Diederik Stapel) ساڵی ١٩٦٦ له ئەمستردام له دایك بووە، ساڵی ١٩٩١ بڕوانامەی لیسانسی به پلەی نایاب له دەروونزانی و زانستەکانی گەیاندن له زانکۆی ئەمستردام(University of Amsterdam) وەرگرتووە، دوار چۆتە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و چەندین خولی فێربوون و ڕاهێنانی له زانکۆکانی شیکاگۆ (Chicago) و مەشیگان (Michigan) بینیووە، ساڵی ١٩٩٧ له زانکۆی ئەمستردام دکتۆرای به پلەی نایاب بەدەست هێناوەوتێزەکەی سەرکەوتوو بووە لەوەی خەڵاتی کۆمەڵەی دەروونزانانی کۆمەڵایەتی هۆڵەندی (ASPO) به دەست بهێنێت. ساڵی ٢٠٠٢ تا ٢٠٠٧ سەرۆکی ڕێکخراوی (ASPO)بووە، ساڵی ٢٠٠٠ مامۆستای زانکۆی گرۆنینگن ( University of Groningen) بووە، یەکێك بوو له دامەزرێنەرانی پەیمانگای تیلبۆرگ بۆ توێژینەوەی ئابووری ڕەفتاری (Tilburg Institute for Behavioural Economics Research) و تا ساڵی ٢٠٠٧ بەڕێوەبەری ئەو پەیمانگایە بووە. ساڵی ٢٠٠٦ وەك مامۆستای دەروونزانی مەعریفی له زانکۆی تیلبۆرگ (Tillburg) دەست بەکار بووە، دواتر پۆستی ڕاگری فاکەڵتی ئادابی له هەمان زانکۆ وەرگرتووە تا ساڵی ٢٠١٠ به تۆمەتی گزیکاری و ناپاکی ئەکادیمی له پۆستەکە لابراوەو گوێزراوەتەوە بۆ زانکۆی ئەمستردام (University of Amsterdam).

ستاپل(Stapel) دەروونزانێکی ناسراو ومامۆستاو توێژەرێکی چالاکی بواری دەروونزانی زانین بووە لەسەر ئاستی جیهاندا، به هۆی ئامادەبوونی بەردەوامی له دەزگاکانی ڕاگەیاندن هەمیشە وەك کەسایەتیەکی دیار دەرکەوتووە، چەندین توێژینەوەی گرنگی له بوارەکانی دەروونزانی زتنین و دەروونزانی کۆمەڵایەتی ئەنجام داوە که جێگەی سەرنجی زۆرێك له دەروونزانەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندن بووە، خاوەنی ئەو بیرۆکەیە که دەڵێت ژینگەی ناڕێکخراو مەیلی ڕەگەزپەرستانە لای خەڵك دروست دەکات.

ساڵی ٢٠١١ ستاپل (Stapel) به گزیکردن و ساختەکردنی داتاکان له چەندین توێژینەوەدا تاوانبارکرا که پێشتر له گۆڤاری ئاست بەرز و ناوەندی وەشاندنی باڵادا بڵاوی کردبوونەوە (Carey,٢٠١١). بەپێی ڕاپۆرتی لیژنەکانی لێکۆڵینەوە لەو کەیسە که له هەرسێ دامەزراوەی

ئەكادیمی هۆلەندی زانكۆی تیلبۆرگ(Tilburg University) و زانكۆی گرۆنگێن ( University of Groningen) زانكۆی ئەمستردام (University of Amsterdam)پێك هاتبوو، ریشەی رەفتارە گزیكاری و ساختەكاریەكانی ستابل (Stapel) لە توێژینەوەكاریدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢٠٠٤ كە تیایدا پشتی بەستووە بە یاریكردن بە داتاكان و هەڵبەستن و زانیاری نادروست لە سەرجەم كارە تاقیكاریەكانیدا، ئەم كارەشی لە نزیكەی ٣٠ توێژینەوەوەی بلاْوكراوەو پێداچونەوەو هەڵسەنگاندندا ئەنجامداوە(Carey,٢٠١١).

بە پێی راپۆرتی كاتی زانكۆی تیلبۆرگ(Tilburg University) لە ٣١ی ئۆكتۆبەری ساڵی ٢٠١١ كە ئەنجامی لیژنەكانی لێكۆڵینەوەی هەرسێ زانكۆكەی لە خۆگرتووە ئاماژە بە نزمی ئاستی رۆشنبیری ئەكادیمی و رەفتاری گزیكاریانەی ناوبراو كراوە كە لە ماوەیەكی زۆردا بێ سڵكردنەوە لە هیچ شتێك خەریكی گزیكردن بووە، . لە راپۆرتەكەدا هاتووە زۆربەی ئەو كەسانەی كەوتوونەتە ژێر كاریگەی راستوخۆی ستاپل(Stapel) و لە توێژینەوەكانیادا پشتیان بە دەرەنجامە ساختەكانی ئەو بەستووە قوتابی ماستەر و دكتۆرا و ئەو كەسانە بوونە كە لەگەڵ خۆی كاریان كردووە، هەروەها لە چەندین توێژینەوە دا پشت بە دەرنجامەكانی ناوبراو بەستراوە، جگە لە هاورێ و هاوپیشەكانی كە بە بێ ئاگا لە زۆر توێژینەوەدا پشتیان بە دەرنجامە ساختەكانی ستاپل(Stapel)بەستووە. لە هەندێ كاردا سناپل (Stapcl)پەیوەندی بە هاورێكانیەوە كردووە كە كۆمەڵێك دەرنجامی لەبەر دەستە هێشتا شیكردەوەیانی بۆ نەكردووە، ئەگەر ئەوان ئامادەی نووسین وشیكردنەوەی دەرەنجامەكان بن بەپێی پرسیارەكانی توێژینەوەكانیان، لە بەرامبەردا وەك توێژەری بەشداربوو لە كارەكەدا ناویان تۆمار دەكات. لە هەردوو باردا بەڵگەی روون و ئاشكر ا لەبەردەست نەبووە كە فێرخوازان و نوسەرانی بەشدار بوو لەگەڵ سناپل(Stapel) هیچ زانیاریەكیان دەربارەی ناپاكی و ساختەكاریەكانی ناوبراو هەبووبێت.

هەر سەبارەت بە بابەتی گزیكاریەكەی ستاپل(Stapcl)، جەنیفەر كرۆكەر( Jennifer Crocker) دەروونزازی كۆمەلاْیەتی و سەرۆكی ئەنجومەنی وەشاندن و پەیوەندیەكانی كۆمەڵەی ئەمەریكی بۆ نەخۆشیە دەروونیەكان(American Psychiatric Association) لە یەكێك لە وتارەكانیدا لە گۆڤاری (Nature) ئاماژە بەوە دەكات كە تێگەیشتن لە ناپاكی

ئەکادیمی گزیکاری پێویستی بە بیرکردنەوە لە چۆنیەتی ڕوودان و پەرەسەندنی هەیە نەك چۆنیەتی کۆتایی پێ هێنانی ، ئاشکرا بوونی ناپاکیەکی لەو شێوەیە کە ماوەیەکی زۆر ئەنجام دراوە ئینجا ئاشکرا بووە ئەتك کردنی زانست وکوشتنی پیشەو شورەییەکی گەورەیە بۆ دەروونزانی، بۆیە دەپرسێت ئایا جۆری ئەم ڕۆشنبیریە ئەکادیمیە چی بووە کە ڕێگەی بە ستاپل(Stapel)داوە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ ئەم ڕەفتارە نەشیاوە ئەنجام بدات؟!

ڕاپۆرتی کاتی لیژنەکانی لێکۆڵینەوەی هەرسێ زانکۆکە ئاماژە بە بوونی دوو هۆکاری گرنك دەکات کە لە پشت ڕوودانی ئەو ڕەفتارە نەشیاوەن و لە ماوەیەکی دوورو درێژدا کەس تێبینی نەکردوون، هۆکاری یەکەمیان پلەو پێگەی ستاپل (Stapel)و ئەو ڕێگا پێشکەوتووە بووە کە بەکارهێناوە، هۆکاری دووەمیشیان لاوازی ئامرازەکانی وردبینی و ڕەخنەی زانستین. بۆیە لە کۆتاییدا ڕاپۆرتەکە چەند ڕاپسپاردەیەك بۆ کاری داهاتوو دەخاتە ڕوو:

- پێویستە هەر قوتابیەکی دکتۆرا لە زانکۆی تیلبۆرگ(Tilburg) دوو سەرپەرشتیاری هەبێت.
- پێوستە لیژنەکانی خویندن لە زانکۆی تیلبۆرگ پێداچوونەوە بە شێوازی کۆکردنەوەی داتاکانی هەر فێرخوازێك بکەن و لە دەرنجامەکانیان دڵنیا ببنەوە.
- پێویستە لە هەر بەشێك لە بەشە زانستیەکاندا سەرپەرشتیاریك هەبێت بۆ دەستپاکی ئەکادیمی و چاودێر بێت بەسەر ڕەوشی توێژینەوەکاریدا.
- پێویستە داتاو زانیاریەکانی هەر توێژینەوەیەك بۆ ماوەی پێنج سال بەردەست بن.
- پێویستە لە هەر توێژینەوەیکدا شوێنی زانیاریەکان و چۆنیەتی کۆکردنەوەو دەستکەوتنیان دیاریکراوبێت.

لە کۆتاییدا دوای ئاشکرابوونی هەموو ئەو ناپاکیە ئەکادیمیانەی ستاپل(Stapel) ئەنجامی دابوون لە نامەیەکدا کە لە سایتی زانکۆی تیلبۆرگ(Tilburg) بلاوکرایەوە و داوای لێ بووردنی لە سەرجەم هاوڕێیانی وزانکۆی تیلبۆرگ (Tilburg)کردووە، دانی ناوە بەوەی ئەو نەیتوانیووە دەروونزانێکی باش بێت و وەك توێژەرێك شکستی هێناوە (McGwin&Veraellie,٢٠١١ ).

## ٩. ٥-ڕێنێ دیکسترا و گزیکردن له بواری دەروونزانی کۆمەڵایەتی René Diekstra and plagiarism in Social psychology

ڕێنێ دیکسترا (René Diekstra) دەروونزان وپزیشکی دەروونی هۆڵەندی کە بە هۆی گرنگیدان بە کێشەوگرفتەکانی خەڵك وەك دەروونزانێکی جەماوەری (Popular psychology) دەرکەوتووە. مامۆستاو ڕاگری بەشی دەروونزانی کۆمەڵایەتی و کلینیکی زانکۆی لیدن (University of Leiden) بووە، پێشکەشکاری چەندین پرۆگرامی دەروونی و پەروەدەیی و نوسەری دەیان و سەدان وتار لە گۆڤارە زانستیەکاندا بووە، ساڵی ١٩٨٧ تا ١٩٨٩ بەڕێوەبەری پرۆگرامی پەرەپێدانی لایەنە دەروونی و کۆمەڵایەتی و ڕەفتاریەکان بووە لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لە ژنێڤ(World Health Organisation in Geneva). هەروەها دامەزرێنەری دامەزراوەی نێودەوڵەتی بۆ توێژینەوە لە دیاردەی خۆکوشتن و ڕۆژنامەی زانستی (Archives of Suicide Research) بووە، یەکێك بووە لە دیارترین توێژەرە بە تواناکانی بواری لێکۆڵینەوە لە خۆکوژی و نوسەری چەندین توێژینەوەی جۆراوجۆر بووە لەم بوارەدا، خەلاتی (Stengel) ی پێ بەخشراوە کە بەرزترین خەلاتی جیهانیە لە بواری لێکۆڵینەوەی خۆکوژیدا (www. en. René Diekstra. Wikipedia, the free encyclopedia, wikipedia . org).

دیکسترا(Diekstra)ماوەیەك مامۆستاو بەڕێوەبەری بەشی پەرەپێدان و لاوان بووە لە زانکۆی پەروەدەیی پیشەیی(University for Professional Education) لە لاهای، هەروەها لە ئەکادیمیای ڕۆزڤێلت(Roosevelt Academy) و زانکۆی ئوترخت(University of Utrecht) کاری کردووەو چەندین توێژینەوەی نایابی لە بواری لێکۆڵینەوە لە گەشەو پەرەسەندنی منداڵان و هەرزەکاران ئەنجام داوەو چەندین وتارو لێکۆڵینەوەی لەسەر گرفت و هۆکارەکانی خۆکوژی و چۆنیەتی وەستانەوە بە ڕووی دیاردەکە نوسیووە( René Diekstra,Centro Botin,www. centrobotin. org). یەکێك بووە لەو دەروونزانانەی کە پێشنیاری چەندین چەندین ڕێگاو شێوازی تازەی بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەو گرفتەکانی لاوان و هەرزەکاران و چۆنیەتی چارەسەرکردنیان کردووەو لەبوارەکانی دەروونزانی گشتی(General psychology) و کەسایەتی(Personality) و دەروونزانی کۆمەڵایەتی(Social psychology) و دەروونزانی

منداڵ و هەرزەکار(Childhood and adolescence psychology)و دەروونزانی تاوان (Criminal Psychology) و تاوانناسی(Criminology) پسپۆری و شارەزاییەکی زۆری هەبووە(About René Diekstra, www. speakersacademy. com).

ساڵی ١٩٩٦ دیکسترا(Diekstra) ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی توند بووەوە سەبارەت وەرگرتن و کۆپیکردنی چەند دوو نوسەری ئەمەریکی، ئەم ڕەخنەگرتنەش دوای ئەوە هات کتێبیکی بەناو نیشانی (Upside Down)چاپ و بلاوکردەوە دەرکەوت لە نووسینیدا پەنای بردۆتە بەر کۆپی کردنی وشە بە وشەی ٨ لاپەڕەی کتێبێکی هەردوو نوسەری بەناوبانگی ئەمریکی هارولد بلومفیلد (Harold Bloomfield) و پیتر ماك ولیامز(Peter Mac Williams) بەناونیشانی چۆن مامەڵە لەگەڵ دڵەراوکیدا دەکەیت (How to deal with depression). بەلأم ئەمە تەنها سەرتای ئابوچونێکی گەورە بووە بچووك بووە بۆ چوونە ناو گزیکردنێکی گەورە، بۆیە بۆ جاری دووەم لە بەشێکی تری گزیکاریەکانی دەرکەوتەوە تیایدا لە کتێبێکدا پشتی بەستبوو بەکۆپی کردنی ٤٨ لاپەڕە لە کتێبی گەشەپێدانی عەقڵ(Mind Care) ی دوو مامۆستای بەشی پزیشکی دەروونی زانکۆی کلیفۆرنیا لە دێڤیس(UC Davis) دیان هالیس(Diane Hallis) ڕوبرت ئای هەلیس (Robert E Hollis). هەروەها لە جاری سێیەمدا پەنای بردبوو بە وەرگرتن و لێکدان و دوبارە داڕشتنەوەی ١٦ لاپەڕە لە کتێبی دڵەراوکێ و فۆبیا( The Anxiety and Phobia Workbook)ی دروونزانی ئەمەریکی و توێژەری بواری چارەسەرکردنی دڵەراوکێ ئێدمۆند جەی بۆرن(Edmund J. Bourne). لە قۆناغەکانی دواتری گزیکاریشیدا پشتی بە وەرگرتنی وشە بە وشە نەدەبەست ، بەڵکو تەنها جەختی لەسەر گۆڕینی ناوی نەخۆشە ئەمەریکیەکان دەکردەوە، وەك گۆڕینی ناوەکانی سوزان و سیندی و ستیڤ ومایك بۆ سوزان و مونیك و سیبستیان و ستیفان و ئەو ناوانەی زیاتر لە هۆڵەندا باون.

دیکسترا (Diekstra) بەردەوام بووە لەسەر کارە گزیکاریەکانی تا ساڵی ١٩٩٧ تاوانبارکرا بە ئەنجاندانی گزیکردن و کۆپیکردنی نووسین و بیرەوەری کەسانی تر و کەسانی تر، دوای ئاشکرابوون و سەلماندنی ناپاکیەکانیشی هەموو پلەو پۆستێکی لە زانکۆی لیدن(Leiden) لێ سەندرایەوەو لەو زانکۆیە دوورخرایەوە( Profiles in Plagiarism. Academia, www. is. muni. cz).

## ٦-شاهد عەزام و گزیکردن لە دینامیکای وزە Shahid Azam and Plagiarism in power Dynamics

شاهد عەزام(Shahid Azam) مامۆستای زانکۆی ریجینا(University of Regina) لە کەنەدا و و تویژەری بەشدار لە زانکۆی کۆلۆمبیای بەریتانی ( University of British Columbia)و ئەندازیاری جیوتەکنیکی بووە لە کۆمپانیای ( Crippen Berger Consultants Limited). لە زانکۆکانی بەترا(University of Alberta)و زانکۆی شا فەهد بۆ نەوت و کانزاکان(King Fahd University of Petroleum & Minerals) و زانکۆی ئەندازیاری و تەکنەلۆژی(University of Engineering & Technology) خوێندوویەتی و ئەزموونی ٢٥ ساڵ کارکردنی وەك توێژەر و ئەندازیارێکی جیوتەکنیکاڵ لە بواری جیۆتەکنیکدا لەکەنەدا و دەرەوەی کەنەدا هەبووە(Shahid Azam,Linkedin,www. linkedin. com).

لە نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠١٤ چیرۆکی ئاشکرابوونی گزیکردنەکەی عەزام (Azam) کە لەو کاتەدا مامۆستای سیستمی ژینگەیی بوو لە فاکەڵتی ئەندازەو زانستە کرداریەکانی زانکۆی ریجینا لە کەنەدا ، بوو بە ناوەندی دەنگ و باسی نیشتیمانی و جیهانی. کاتێك ئارجۆن پاول(Arjun Paul) یەکێك لە فێرخوازەکانی عەزام کە پێشتر لە ژێر سەرپەرشتی ئەودا ماستەری خوێندبوو ناوبراوی بە دزینی نامەکەی تۆمەتبارکرد، ئەویش لە کاتێکدا بوو کە عەزام (Azam)توێژینەوەیەکی زانستی لە گۆڤاری (GEOTECHNICS) ژینگەیی بلاو کردبووەوە . دوای لێکۆڵینەوە لە دۆخەکە گۆڤارەکە توێژینەوە زانستیەکەی عەزام (Azam)ی کێشایەوەو مافی بلاوکردنەوەی توێژینەوەی تری لە ناوبراو نەسەندەوە. تا ئێرە قەبارەی گزیەکە تا رادەیەك بچووك بوو بەلام کاتێك عەزام(Azam) وەڵامی پاوڵ(Paul)ی داوەتەوە بووە بە ئابڕوچوونێکی گەورەی نیشتیمانی، لە وەلامەکەیدا ڕاشکاوانە ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو گزیکەر نەبووەو هیچ بەشێکی نامەی فێرخوازەکەشی لە توێژینەوە تازەکەدا بەکارنەهێناوە کە ئاماژەی پێ نەکردبێت، هۆکاری هاوشێوەیی هەردوو دەقەکەش لە زۆر ڕووەوە بۆ گزیکردن ناگەڕێتەوە، بەڵکو لە بنەڕتدا ئەو خۆی بەشە گەورەکەی نامەی پاوڵ (Paul) نوسیووە، هەروەها زۆربەی نامەکەی پاوڵ(Paul) بە پشت بەستن بە کارێکی هاوبەشی هەردوولا ئەنجام دراوە کە بەشە گەورەکە ئەو نوسیویەتی، بەلام پاوڵ(Paul)لە وەلامدا وتوویەتی ئەو کاتێك

فێرخواز بووە هیچ کێشەیەکی لەو جۆرەی نەبووەوکاتێك فێرخواز بووە هیچ ترسی لە کارەکەی نەبووە.

ئەم ڕووداوە دەنگدانەوەیەکی زۆری لەسەر ئاستی زۆرێك لە ناوەندە ئەکادیمیەکان هەبوو، نەك تەنها لەبەر ئەوەی بابەتەکە پەیوەندی بە دینامیکیای وزەی ژینگەییەوە هەبووە، بەڵکو کۆمەڵێك پرسیاری گرنگی ورووژاندووە کە پێویستیان بە وەڵامدانەوە هەبووە. لە لایەك باوەڕکردن بە قسەکانی عەزام(Azam) بەوەی خۆی بەشێکی گەورەی نامەکەی پاوڵ(Paul)ی نوسیوە، چ شتێك پاڵی پێوە ناوە ئەو کارە بکات؟یان چی وای لێ کردووە بابەتی ناپاکی ئەکادیمی فەرامۆش بکات و بڕوانامەی ماستەر بە فێرخوازێك ببەخشێت کە شایستەی بڕوانامەکە نەبێت؟ لە لایەکی تر باوەڕکردن بە قسەکانی پاوڵ(Paul)بەوەی مامۆستاکەی بەشێکی نامەی ماستەرەکەی دزیووە، بۆچی مامۆستایەك گزی لە کاری فێرخوازێك کردووە کە پێشتر خۆی سەرپەرشتی کارەکەی کردووە بی ئەوەی لەسەری سزا درابێت؟! ( Bailcy , ٢٠١٤).

| Arjun Paul: 'Statistical modelling for tailings consolidation using index properties' (U of R master's thesis, December 2011) | Shahid Azam: 'Study on large strain consolidation of mine waste tailings' (ICE Publishing, February 2014) |
|---|---|
| Overall, the variability in the index properties of the tailings was attributed to the variable solid-liquid interactions. Derived from the geological background (mineralogical composition of the solids) and the mining operation. (Pg. 48, par. 1) | Overall, the variability in the index properties of the tailings was attributed to the variable solid-liquid Interactions. Derived from the geological background (mineralogical composition of the solids) and the mining operation. (Pg. 51, par. 3) |
| The above consistency limits depend on the type of water used during testing, but data on the water composition in the literature were not available for all of the materials. Generally, the consistency limits are highest for deionized water, followed by distilled water, and then by decant water. (Pg. 47, par. 1) | Although water composition data were not available for all of the materials, the above consistency limits depend on the type of water used during testing. Generally, the limits are highest for deionised water, followed by distilled water, and then by decant water. (Pg. 51, par. 1) |
| Consistency limits for sedimentary clays covered a wide range due to the presence of various clays. Sesquioxide coating of clays and dominance of non-clays resulted in lower liquid and plastic limits for residual soils. Higher consistency limits for oil sand tailings were due to residual bitumen that imparts thixotropy and lubrication. (Pg. 76, par. 1) | Consistency limits for sedimentary clays covered a wide range due to the presence of various clay minerals. Sesquioxide coating of clays and dominance of non-clays resulted in lower liquid and plastic limits for residual soils. The relatively high limits for oil sand tailings were due to residual bitumen that imparts thixotropy and lubrication. (Pg. 54, par. 2) |

شێوە(٣. ١٩)بەراوردکردنی توێژینەوەکەی عەزام(Azam)لەگەڵ نامەی ماستەری پاوڵ(Paul) بە پێی (CBC's iTcam) کە بە ڕێژەی ٪٢٤ هاوتان(Leo,٢٠١٧).

## ٩. ٧-باراك ئۆباماو گزیکردن لە وتاربێژی Barack Obama and plagiarism in public speaking

لە مانگی شوباتی ساڵی ٢٠٠٨ لە میانی بانگەشە بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی باراك ئۆباما (Barack Obama) بە دزینی چەند ڕستەیەك لە وتارەكەی دیڤال پاتریك(Daveal Patrick) ی فەرمانداری ویلایەتی ماساچۆستس(Massachusetts) تاوانبار كرا كە لە تشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٦ دا پێشكەش كرابوو، جگە لەوە ناوەڕۆكی وتارەكەی ئۆباما(Obama) چەندین بڕگەی وەرگیراوی تری لە وتارەكانی مارتن لۆتەر كینگ (Martin Luther King) و جۆن كەنەدی (John Kennedy)و وتاری مێژووی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمەریكای لەخۆگرتبوو، ئەمەش گزیكردنێكی ئاشكرابوو لە زنجیرەیەك وتار و بەڵگەنامە ناسراوەكانی مێژووی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا (Wallenfeldt & Mendell,٢٠١٨). .

ئەم بابەتە بووە هۆی ئەوەی ئۆباما(Obama) ڕاستەوخۆ بە گزیكردن تۆمەتبار بكرێت، لە بەرامبەریشدا ئۆباما وەڵامی تۆمەتباركردنەكەی بەوە دایەوە كە پاتریك (Patrick) هاوڕێی نزیكیەتی و پەیوەندی بەردەوامیان بە یەكەوە هەبووەو هەمیشە ئاڵوگۆڕی بیروڕایان لەگەڵ یەكتردا كردووە، تەنانەت پاتریك (Patrick)یش هەمان ڕای هەبووەو بۆ بەرگری كردن لە ئۆباما(Obamaلەسەر شاشەی تەلەفزیۆن ئامادەیی دەربڕیووە، بەڵام ئەمشیان ئۆباما (Obama) و كەسێتی ئۆبامایان بردە ژێر پرسیارێكی ترەوە، لەوەی چۆن دەبێت كەسێك خۆی بۆ سەرۆكایەتی وڵاتێكی گەورەی وەك ئەمەریكا كاندیت بكات كەچی فەزڵی چەند وتەیەك بۆ هاوڕێكەی بگێڕێتەوەو بڵێت من خاوەنی ئەو وتانە نیم؟!بەڵكو بابەتەكە زۆر لەوە گەورەتر بووە كە تەنها پەیوەندی بە وەرگرتنی چەند بڕگە لە وتاری هاوڕێیەكەوە هەبێت، یاخود بە بەرگری هاوڕێكەی لەو چەند وتەیە گزیە گەورەكە پەردەپۆش بێت كە سەرتاپای وتارەكەی گرتبووەوە، چونكە وتارەكە لەسەرەتاوە تا كۆتایی وەرگیراوبوو. بە پێی سایتی گزیكاری ئەمڕۆ (PlagiarismToday. com) كە سایتێكە بۆ دەرخستن وئاشكراكردنی دیاردەی گزیكردن لە نێوان دوو بابەت دوای بەراوردكردن لە نێوان هەردوو وتارەكەی ئۆباما(Obama) و پاتریك (Patrick)دا دەركەوتووە ناوبراو لە وتارەكەیدا چەندین وتەو بڕگەی نێو وتارەكەی پاتریك (Patrick)ی بەكارهێناوە بە بێ دانان نان بە مافی خاوەندارێتی خاوەنی ڕەسەنی وتارەكە، ئەمەش گزیكردنەو گزیكردنش هیچ بیانوو و پاساوێكی بۆنیە(Bailey,٢٠٠٨).

## ٩. ٨-میلانیا ترامپ و داننان بە گزیکردن Melania Trump and plagiarism admission

میلانیا ترامپ(Melania Trump) ی بە ڕەگەز سلۆڤینی وەك بەهرەو شارەزایی و پیشە ڕۆژێ لە ڕۆژان نە نوسەر و نە ڕۆژنامەنووس و نە وتارنووس بووە، بەڵکو دیزایینەرێکی بەناوبانگی جل وبەرگ بووە، بەڵام ئێستا هاوسەری دۆنالد ترامپ (Donald Trump) سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە. پێش هاتنی بۆ ئەمەریکا لە ژیانێکی سادەو بژێوییەکی مام ناوەند لە سلۆڤینیا لە گەڵ دایك و باوك و خێزانەی ژیاوە، باوکی بازرگانی ئۆتۆمبیل و دایکیشی دیزایینەری جل و بەرگ بووە، میلانیا(Melania)ش پیشەکە لە دایکیەوە فێر دەبێت و لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا بەهرەو شارەزاییەکی باش پەیدا دەکات و هەوڵ دەدات لە دەرەوەی ولاتەکەی کار بکات، بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندی بە ئاژانسی مۆدێلی میلانۆ( Milano Model Agency)دەکات ، دواتر بۆ خوێندن دەچێتە زانکۆی لیوبلیانا(University of Ljubljana) بەڵام بۆ ئەوەی لە پیشەکەی دانەبڕێت واز لە زانکۆ دەهێنێت و تەواوی ناکات،لە شارەکانی میلان(Milan) و پاریس(Paris) کار دەکات و ساڵی ١٩٩٦ یش بەرەو نیویۆرك (New York) ئەورووپا جێ دەهێڵێت و لەوێ کارێکی هەمیشەیی دەست دەکەوێت، لەگەڵ چەند فرتۆگرافەرێکی بەناوبانگ کار دەکات وەك پاتریك دیموسلێر(Patrick Demosler) و هیلموت نیوتن(Helmut Newton) بۆ نمایشکردنی وێنەی جل و بەرگی مەلەوانی و ژنان و پیاوان لە گۆڤارەکانی (Harper's Bazaar) بۆلگاری و ڤانتینی فێر (Vanity Fair)ی ئیتالی و جی کیو(GQ Magazine) کە تایبەت بوون بە نمایشکردنی مۆدێلی جل و بەرگی نیمچە ڕووت. لە ساڵی ١٩٩٨ دا لە یەکێك لە ئاهەنگێکیی نمایشکردنی جل و بەرگدا لە نیویۆرك دۆناڵد ترامپ دەناسێت و ئەم یەکترناسینە دەبیت بە سەرتایەك بۆ پێکهێنانی هاوسەرگیریەکەیان، ساڵی ٢٠٠٤ هاوسەرگیری ئەنجام دەدەن و لە ساڵی ٢٠٠٦دا کورەکەیان ویلیام ترامپ( William Trump) لە دایك دەبێت و بە هۆیەوە میلانیا دەبیت بە هاوڵاتیەکی ئەمەریکی و دواجاریش خانمی یەکەمی ئەو ولاتە (Melania Trump, Biography,www. biography. com).

ساڵی ٢٠١٦ لە لە میانی بانگەشەی سەرۆکایەتی بۆ هاوسەرەکەی لە یەکێك لە وتارەکانیدا تاوانبارکرا بە گزیکردن، ئەویش لە کاتێکدا بوو میلانیا (Melania) وتارێکی لە کۆنگرەی نیشتیمانی کۆماریەکان لە ساڵی ٢٠١٦ پێشکەش کرد تیایدا پەنای بردبووە بەر بەکارهێنانی

چەند برگە لە وتارێکی میشیل ئۆباما(Michelle Obama) کە لە ساڵی ٢٠٠٨ دا لە کۆنگرەی نیشتیمانی دیموکراتەکان پێشکەشی کردبوو.

بۆ نموونە میلانیا (Melania) لە وتارەکەیدا دەڵێت:

From a young age, my parents impressed on me the values that you work hard for what you want in life, that your word is your bond and you do what you say and keep your promise, that you treat people with respect.

بەڵام هەشت ساڵ لەمەوبەر میشیل ئۆباما(Michelle Obama) لە وتارەکەیدا هەمان وتەی پێشکەش کردووەو دەڵێت:

Barack and I were raised with so many of the same values — like you work hard for what you want in life, that your word is your bond and you do what you say you're going to do, that you treat people with dignity and respect.

لێرەدا بە ڕوونی دەردەکەوێت کە میلانیا(Melania) هەمان وتەکانی میشێل(Michelle)ی بە دڕاشتنەوەو جیاوازیەکی کەم دووبارەکردۆتەوە، ئەمەش گزیکردنێکی ڕوون و ئاشکرا بووە بە جۆرێك لە تەواوی ڕۆژنامەو تەلەفزیۆن و دەزگا ڕاگەیاندنەکانی ئەمەریکاو جیهان دەنگی دایەوە (18 High Profile Cases of Plagiarism,Ranker- vote on everything, www. ranker. com).

گزیکردن دیاردەیەکە دەشێت لە هەر کات و سات و بۆنەو شوێنێکدا ڕووبدات، گزیکردنەکەی میلانیا(Melania)ش تەنها دووبارەکردنەوەی چەند وتەیەك بووە لە وتاری زارەکی کەسێکی تر کە پێشتر پێشکەش کراوە، بەڵام هەردوو وتارەکە دوو وتاری سیاسی وفەرمی و لە دوو بۆنەو شوێنی فەرمیەوە پێشەکەش کراون، هەردوو وتارەکە لە کاتی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی و لە لایەن هاوسەری دوو کاندیدی سەرۆکایەتی بۆ بانگەشە بۆ هاوسەرەکانیان پێشکەشی کراون، دەنگۆی گزیکردنەکەش لە سەرجەم دەزگا ڕاگەیاندنەکاندا بڵاوبۆتەوەو لایەنی ڕکابەریش هەوڵی پڕوپاگەندەو زەقکردنەوەی زیاتری دۆخەکەی داوە تا گەیشتۆتە ئەو ئاستەی میریدیت میکایڤر (Meredith Mciver)ی نوسەری وتارەکانی میلانیا داوای لێ بوردن بکات و بڕیاری دەست لەکار کێشانەوە بدات، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی گزیکردنەکە لە شێوەو قەبارەی خۆی گەورەتر نیشان بدرێت (Bailey, ٢٠١٧).

## ٩. ٩–مایكڵ بوڵتن و گزیكردنی هونەری Michael Bolton and artistic plagiarism

مایكڵ بۆڵتن(Michael Bolton) گۆرانیبێژی پۆپ و نوسەرو هۆنەری شیعری گۆرانی و چالاكوانێكی كۆمەڵایەتی ئەمەركی ساڵی ١٩٥٣ لە شاری نیو هێڤن(New Haven)ی سەر بە ویلایەتی كونیتیكت(Connecticut)لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا لە دایك بووە، سەرەتای كاروانی هونەری وەك گۆرانیبێژ و دانەری شیعری گۆرانی لە هەشتاكانی سەدەی ڕابردوودا دەست پێ كردووە، لە سەرەتای كاركردنیشدا بە تەنها كاری كردووەو لە ژێر ناوی خۆیدا بەرهەمەكانی بڵاوكردۆتەوە، دوای سەركەوتنیشی وەك گۆرانبێژێك لە كاری تاكیدا بۆتە گۆرانبێژی سەرەكی گرووپی بلاك جاك (Blackjack) و لەگەڵ گرووپەكەدا دوو ئەلبوومی گۆرانی بڵاوكردۆتەوە، دواتر لە گرووپ جیا بۆتەوەو دووبارە وەك مایكل بۆڵتن( Michael Bolton) دەستی بە كاری تاكایەتی كردووە، بەمەش سەرتای قۆناغێكی نوێ ی لە گۆرانی و مۆزیكی ڕۆك دەست پێ كردووە.

بۆڵتن(Bolton)لە ژیانی هونەریدا زیاتر ٥٣ ئەلبوومی گۆرانی بڵاوكردۆتەوەو چەندین ئاواز و تێكستی شیعری بۆ گۆرانی داناوە و چەندین خەلاتی هونەری پێ بەخشراوە، ناوبراو بەردەوامە لە كاری هونەریدا و هەوادار و لایەنگرێكی زۆری لە ئەمەریكا و ئەوروپاو ئەفریقیادا هەیە (Michael Bolton. Biography, www. biography. com). بەڵام ڕووداوێك بۆتە پەڵەیەكی ڕەش بەسەر ژیان و كارنامەی هونەری پڕ لە دەستكەوت و داهێنانیەوە، ئەویش گزیكردن بووە لە تێكستێكی گۆرانی بریانی ئاسلی (Isley Brothers) كە بەهۆیەوە دووچاری گەورەترین سزا بووەوە كە لە بەرامبەر پێشێلكاری هونەری لە بواری هونەری گۆرانی و مۆزیكدا بەسەر هونەرمەندان سەپێنرابێت.

بابەتی گزیكردنی بۆڵتن(Bolton)یەكێكە لە دیارترین كەیسەكانی گزیكاری لە بواری هونەردا ، ساڵی ١٩٩١ بۆڵتن(Bolton) دوای تۆماركردنی یەكێك لە گۆرانیەكانی بە ناو نیشانی( love is a wonderful thing) تاوانبار كرا بەوەی هەمان ناو و هەندێ وشەی گۆرانیەكی برایانی ئایسلی (Isley Brothers) كە لەساڵی ١٩٦٦ تۆماری كراوە لە گۆرانیەكەدا بەكارهێناوە. لە بەرامبەر تاوانباركردنەكەیدا بۆڵتن(Bolton) ڕایگەیاند پێشتر گوێ بیستی گۆرانیەكە نەبووە،

بەڵکو تەنها لێکچوون و هاوشێوەییەك هەیە لە نێوان هەردوو گۆرانییەکەدا ، بەڵام هەموو بەڵگەکان ئاماژەبوون بەوەی گزییەکی ڕوون و ئاشکرا لە گۆرانییەکە ئەنجام دراوە. بۆیە لە تەمووزی ٢٠٠٩ لە ئەنجامی نەبوونی بەڵگەی بارەڕپێکەر لە لایەن بۆڵتن(Bolton) بۆ پاکانەکردن لە گۆرانییەکەیی و سەلماندنی هاوشێوەیی لە نێوان هەردوو گۆرانییەکەدا، دەستەی لێکۆڵەرانی کەیسەکە بڕیاریان دا بە قەرەبووکردنەوەی برایانی ئایسلی (Isley Brothers) بە ٤ .٥ ملیۆن دۆلار لە لایەن بۆڵتن(Bolton) و پێدانی ٦٦٪ ی قازانجی گۆرانییەکە و ٢٠٪ ی ئەلبوومی فرۆشراو بە برایانی ئایسلی(Isley Brothers)، ئەمەش بە گەورەترین سزادان و قەرەبووکردنەوە دادەنرێت لە بواری گزیکردنی هونەریدا.

گرنگی ئەم چیرۆکە لەوەدایە کە بۆڵتن(Bolton) دوای بیست و پێنج ٢٥ ساڵ لە گزییە هونەرییەکەیدا باجێکی گەورەی مادی و مەعنەوی داوە، ئەویش تەنها لەبەر ئەوەی ناوی گۆرانی و هەندی وشە لە گۆرانییەکەی برایانی ئایسلی(Isley Brothers) بێ مۆڵەت و بە بێ گەڕانەوە بۆ ئەوان وەك خاوەنی ڕەسەنی گۆرانییەکە لە گۆرانییە تازەکەیدا بەکارهێناوە، دەکرا ئەو باجە نەدات ئەگەر ئەو کارەی نەکردایە، یان ئەگەر ناوێکی تازەی بۆ گۆرانییەکە هەڵبژاردایە، یان ئەو چەند وشەیەی لە گۆرانییەکەدا بەکار نەهێنایە، لە ئەگەری بەکارهێنانیشیان پەیوەندی ئەوانەوە بکرادایەو لەسەر مۆڵەتی ئەوان ناو و وشەی گۆرانییەکەی ئەوانی لە گۆرانییە تازەکەدا بەکار بهێنایە، یاخود لە کاتی بەکارهینانیاندا ناوی ئەوانی لەسەر تایتلی گۆرانییەکە بنوسیایەو وەك خاوەنی گۆرانییەکە ناویانی بهێنایە، بەڵام کاتێك بە پێویستی نەزانیووە ئەوە بکات و نەیتوانیووە ڕێز لە مافی خاوەندارێتی هونەری هونەرمەندان و هاوپیشەکانی تری بگرێت، دووچاری گزیکردن بووەو باجی گزیکردنەکەشی بە ئابڕوچوون و بژاردنی چەندین ملیۆن دۆلار داوە، باجدانەکەشی بوو بە وانەیەك بۆ خۆی و هەموو ئەو کەسانەی چیرۆکی گزیکردنەکەی دەخوێننەوە تاکو بزانن گزیکردن تاوانێکە هەرچەندە هەوڵی پەردەپۆشکردنی بدرێت ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاشکرا دەبێت، باجی قورسی هەیەو بێ سزا تێ ناپەڕێت، کەسی گزیکاریش درەنگ یان زوو باجی گزیکردنەکەی دەدات ( Costly Price of .(Plagiarism,Hammertimev, www. hammertimev. wordpress. com

## ٩. ١٠-جیف کونز و گزیکردن لە بواری هونەری فۆتۆگرافی Jeff Koons and in photography plagiarism

جیف کونز(Jeff Koons) یەکێکە لەو هونەرمەندە ئەمریکیانەی لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا لە بواری هونەری جوانکاری و گرنگیدان بە شتی ئەنتیکە دەرکەوتووە، ساڵی ١٩٩٥ لە شاری یۆرك(York)ی ویلایەتی پەنسلڤانا(Pennsylvania)لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە دایك بووە، لە قوتابخانەی ئامۆژگای هونەر لە شیکاگۆ( School of the Art Institute in Chicago) خوێندوویەتی و لەگەڵ هونەرمەندی شیکاگۆیی ئید باشکی( Ed Paschke) کاری کردووە، ساڵی ١٩٧٦ پەیمانگای هونەری ماریلاند( Maryland Institute of Art)ی تەواو کردووە، دواتر لەشاری نیویۆرك(New York City) نیشتەجێ دەبێت و دەبێتە ئەندامی مۆزەخانەی هونەری مۆدیرن(Museum of Modern)، لە دەرەوەی کاتژمێری کارکردنیشدا وەك کاری زیادە لە وۆڵ ستریت(Wall Street)کاری کردووەو زۆربەی کاتی خۆی بۆ هونەر تەرخان کردووە.

کونز(Koons) لە سەرتای کارکردنی تا ئەم دواییانە زنجیرەیەك کاری هونەری بە شێوەیەکی ڕێکخراو پێشکەش کردووە، وەك زنجیرەی کاری ١٩٩٨٠ تا ١٩٨٣ لە ژێر ناونیشانی کارە نوێیەکان(The New) کە کۆمەڵێك کەسەتەی کارەبایی لە شووشە دروستکراو شت و مەکی ناو ماڵی لەخۆگرتبوو . هەروەها زنجیرەی کاری ١٩٨٥ کە کۆمەڵێك کەرەستەی برۆنزی و و یاری باسکەی سەر ئاوکەوتووی لە خۆ گرتووە، هەورەها زنجیرەی کاری ١٩٩٠ تا ١٩٩٩ لە ژێر ناونیشانی لەبەهەشت دروست کراوە(Made in Heaven series) کە کۆمەڵێك تابلۆ و پەیکەری ئیرۆتیك و سەرنج ڕاکیشی لە خۆ گرتبوو کە لە دەستکردی کۆنز(Koons) وئیلۆنا ئانا ستالەر (Elena Anna Staller)ی هاوسەرە ئیتالیەکەی پێشووی بوون. یەکێك بووە لەو هونەرمەندە پێشەنگانەی کاریان لەسەر دووبارە دروست کردنەوەو داڕشتنەوەی کەل و پەلی بازرگانی کردووە ، چەندین پیشاناگای تایبەتی کردۆتەوە، وەك پیشانگای مۆزەخانەی سان فرانسیسکۆ بۆ هونەری نوێ(San Francisco Museum of Modern Art in) لە ساڵی ١٩٩٢-١٩٩٣ و پیشانگای مۆزەخانەی ویتنی بۆ هونەری ئەمەریکی( Whitney Museum of American Art) لە ساڵی ٢٠١٤. هەروەها چەندین خەڵات و مەدالیای شەرەفی پێ بەخشراوە، وەك مەدالیای (Skowhegan) بۆ پەیکەر لە ساڵی ٢٠٠٥ و دیاریکردنی وەك

بەرپرسی تیپی مۆزیکی شەرەفی فەرەنسی لە ساڵی ٢٠٠٧ و میدایای هونەر( Medal of Arts)ی وەرزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە ساڵی ٢٠١٢ ( Wainwright . Lisa S. Jeff Koons, American artist. Encyclopedia Britannica, www. britannica. com).

ساڵی ٢٠١٧ دادگایەکی فەرنسی کونز(Koons) ی بە کۆپی کردنی وێنەیەکی فۆتۆگرافەری کۆچکردووی بەناوبانگی فەرەنسی ژان فرانسوا بۆغێ[16] (Jean-François Bauret) تاوانبارکرد، ئەم تاوانبارکردنەش دوای ئەوە هات کە هاوسەری هونەرمەندە فەرەنسیەکە لە ساڵی ٢٠١٤ دواکاریەکی دژی کۆنز و ئەو مۆزەخانەیە تۆمارکرد کە پەیکەرەکەی تێدا وەك ئامرازێکی ریکلامی بەکارهێنراوە، لە داواکاریەکەدا هاتبوو ئەو پەیکەرە پۆرسلینەی وێنەی دوو منداڵی رووتەو یەکێکیان چەپکە گوڵێك دەدات بە ئەوی تریان و چەند گوڵێکیش بە پەرش و بڵاوی لەژێر پێکانیاندایە لە وێنەیەکی کۆنی بوغێ (Bauret) وەرگیراوە.

سەبارەت بە چۆنیەتی ئاشکاربوونی گزیەکە راپۆرتێکی رۆژنامەی گاردیان(Guardian) ئاماژەی بەوە کردووە کە کلود بوغێ ئالاغد(Claude Bauret-Allard)هاوسەری هونەرمەندە فەرنسیەکە لە دیمانەیەکیدا لەگەڵ گۆڤاری تێلێغما(Télérama) ی فەرەنسی وتوویەتی تووشی شۆك بووم کاتێك بینیم وێنەی هاوسەرەکەم لەسەر پەیکەرەکەی کونز(Koons) بینی، چونکە هەمان وێنەی منداڵەکان (Enfants) بوو کە لە ساڵی ١٩٧٥ لەسەر پولێکی پۆستە نەخشێنراوە.

بۆ ئەم مەبەستە ئالاغد(Allard) هەوڵی داوە سەردانی کتێبخانەی نیشتیمانی فەرەنسی بکاو مۆڵەتی سەیرکردنی سەرجەم وێنەکانی هاوسەرەکەی لە بەڕێوەبەری وێنە فۆتۆگرافیەکانی

---

[16] ژان فرانسوا بوغێ(Jean-François Bauret) هورنەرمەند و فۆتۆگرافەرێکی گەورەی فەرەنسی بوو،ساڵی ١٩٣٢ لە پاریس لە دایك بووە،ساڵی ١٩٥٥ لە کاتی خزمەتی سەربازیدا لە شامبێغی(Chambéry) کلود ئالاغد فۆتۆگرافەری ناسیووەو لە ساڵی دواتردا هاوسەرگیریان ئەنجام داوە،ساڵی ١٩٥٧ لە گەڵ هاوسەرەکەیدا لە ئاوایی فونتینای موڤوازان(Fontenay Mauvoisin) نیشەجێ بوون،دواتر لە ساڵی ١٩٦٢ بریاریان دا لە پاریس بژین و لەو شارەدا ستۆدیۆیەکی فۆتۆگرافی بکەنەوە،لە سەرەتای شەستەکان تا پێش کۆچی دوای کردنی سەدان پۆرترێت و وێنەی فۆتۆگرافی نایابی کێشاوە کە زۆریەیان لە بەشی فۆتۆگرافی مۆزەخانەی نیشتیمانی پاریس پارێزراون، لە ٢ی ژانڤیەی ساڵی ٢٠١٤ لە پاریس کۆچی دوایی کردووە.

سەردەم وەربگرێت ، دوای سەیرکردنیان دڵنیا دەبێت لەوەی وێنەکە هەمان وێنەی منداڵەکان (Enfants)ی هاوسەرەکەیەتی لە کۆمەڵەی وێنەکانی ساڵی ١٩٧١ ، بەڵام لەکاتی بەکارهێنانیدا لە لایەن کونز(Koons)بە مەبەستی جوانکاری و شاردنەوەی گزیکردنەکە چەپکە گوڵەکەیان بۆ زیادکراوە، دواتر پەیوەندی بە هەریەکە لە کۆنز(Koons) و سەنتەری پۆمپی دوو( The Centre Pompidou) کردووە بۆ ئەوەی پێش نمایشکردنی پەیکەرەکە قەسەیان لەگەڵدا بکات ، بەڵام نە کۆنز(Koons) و نە مۆزەخانەکە وەڵامیان نەداتەوە، ئەمەش ناچاری کردووە داواکاری یاساییان لەسەر تۆمار بکات و بەڵگەکانی تاوانبارکردنیشیان پێشکەش بە دادگا بکات. بۆیە دادگا دوای سەلماندنی گزیەکە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا بڕیاری دا بە قەرەبووکردنەوەی خێزانی ژان فرانسوا بوغێ (Jean-François Bauret) بە ٤٠، ٠٠٠ هەزار یۆرۆ کە هاوتا بوو بە ٥٠,٠٠٠ هەزار دۆلاری ئەمەریکی لە لایەن هەردوو لایەنی جیف کونز( Jeff Koons) و سەنتەری پۆمپی دوو(The Centre Pompidou) لە بەرامبەر بەکارهێنان وکۆپیکردنی وێنەکە بە بێ مۆڵەت و ڕێککەوتن لەگەڵ میراتگرانی خاوەنی وێنەکە(Abrams,٢٠١٧).



شێوە (٣. ٢٠)نموونەی گزیکردنی فۆتۆگرافی لە لایەن کونز(Koons) ڕوون دەکاتەوە

## ٩. ١١-دیپاك پێنتال و گزیکردن لە بواری بۆماوەزانی Deepak Pental and plagiarism in Genetics

دیپاك پینتال(Deepak Pental) مامۆستای بۆماوەزانی وجێگری سەرۆکی زانکۆی دەلهی (University of Delhi) بووە، یەکێك بووە لە توێژەرە بەناوبانگەکانی بواری لێکۆڵینەوە لە میکانیزمی گواستنەوەی خاسیەت و تایبەتمەندیە ڕووەکیەکان و گەشەپیدان و ڕاستکردنەوەی بوهێڵەکان لە ڕوەکدا. ساڵی ١٩٩٥ لە دایك بووە، لە ساڵانی ١٩٧١ و ١٩٧٣ بەکالیۆریوس ( B. Sc) و ماستەر(M. Sc)ی لە بەشی ڕوەکناسی(Botany) زانکۆی پەنجاب ( Panjab University) وەرگتووە، ساڵی ١٩٧٨ دکتۆرا(Ph. D)ی لە زانکۆی ڕۆجەرز ( Rutgers University)لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەدەست هێناوە، سالی ١٩٧٨ بۆ ١٩٨٤ پۆست دکتۆرا (Postdoctoral)ی لە زانکۆی نوتنگهام(University of Nottingham) بەدەست هێناوە، ساڵی ١٩٨٥ گەڕاوەتەوە بۆ هیندستان و پەیوەندی کردووە بە پەیمانگای تاتا بۆ لێکۆڵینەوەی وزە(TERI)، سالی ١٩٩٣ وەك مامۆستای بۆماوەزانی لە زانکۆی دەلهی (University of Delhi)دەست بەکار بووە، لە ساڵی ٢٠٠٠ تا ٢٠٠٥ پۆستی بەڕێوەبەری بەشی لەو زانکۆیە وەرگرتووە، لە ساڵی ٢٠٠٥ تا ٢٠١٠ جێگری سەرۆکی زانکۆ بووە، زیالتر لە ٦٠ توێژینەوەی زانستی بلاوکردۆتەوەو تیایدا گرنگی بە لێکۆڵینەوە لە ڕوەکی خەردەل و لۆکە داوە، یەکێك بووە لەو مامۆستایانەی گرنگی بە سیاسەتی زانستەکۆمەلآیەتیەکانی پەیوەست بە بواری کشتوکاڵ داوە، بە هۆی گرنگیدانی زۆری بە زانستە کۆمەلآیەتیەکان بیری گاندهیان (Gandhian) میدالیای دیپلۆمی فەلسەفەی گاندهان (Gandhian Philosophy)ی لە لایەن زانکۆی پەنجاب پیّ بەخشراوە( Deepak Pental. Wikipedia, the free encyclopedia, www. en. wikipedia. org).

لە نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠١٤ دادگای شاری دەلهی لە هیندستان بە هۆی گزیکردن و دزینی بیرۆکەی مامۆستایەکی تر فەرمانی بەندکردنی بۆ ماوەیەکی کورت بۆ پینتال(Pental) مامۆستاو یاردیدەری ڕاوێژکاری زانکۆی دەلهی دەرکرد. ڕیشەی کێشکەش دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ١٩٩٥ کاتێك پرۆفیسۆر پاردها ساردامی (Pardha Saradhi) بە هاوکاری چەند فێرخوازێك دەستی کربوو بە پرۆژەیەکی تایبەت بە گەڕان و پشکنینی بۆماوە لە ڕوەکی خەردەلی هیندیدا. ساڵی ٢٠٠٠ یەکێك لەو فێرخوازانەی لەژێر سەرپەرشتی ساردامی(Saradhi)

له پرۆژەکەدا کاری دەکرد وازی هێناو چوو بۆلای پینتال(Pental) بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەودا کار بکات. دوای ئەوەی پرۆفیسۆر سارداهی(Saradhi) ساڵی ٢٠٠٨ گواسترایەوە بۆ زانکۆی دەلهی(Delhi University) هەستی بەوە کرد فێرخوازەکۆنەکەی کە ئێستا لەگەڵ پینتال (Pental)دا کار دەکات کارەکەی دزیووەو ناوەڕۆکی توێژینەوەکەی لای پینتال(Pental) ئاشکرا کردووە، کاتێك سەیری هەڵس و کەوتی ساردوسڕی پینتالی(Pental)یشی کردووە گومانەکەی لا زیاتر بووە کە فێرخوازەکە هەموو پرۆژەکەی لای پینتال ئاشکرا کردبێت. بۆ لێکۆڵینەوە لەو بابەتە سارداهی (Saradhi)داوای لە زانکۆی دەلهی کرد لە دۆخەکە بکۆڵێتەوەو ڕاستی شتەکان ئاشکرا بکات، بەڵام بە هۆی ئەوەی زانکۆ نەیتوانی کێشەکە چارەسەربکات ساڵی ٢٠٠٩ کەیسەکە گواسترایەوە بۆ دادگای نیشتیمانی، دوای ئاشکرابوونی گزیکاریەکە بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا، دادگا پینتال(Pental)ی بە ناپاکی ئەکادیمی و پێشێلکردنی مافی خاوەندارێتی فیکری و دەست بردن بۆ بەرهەمی توێژەرێکی تر تاوانبارکردو بڕیاری دا بەند بکرێت، بەڵام پارێزەرەکانی پینتال (Pental) زوو هەوڵیاندا لە بەرامبەر دانانی بڕێك پارە وەك بارمتە ئازادی بکەن و داوا لە دادگا بکەن پەلە بکات لە لێکۆڵینەوە لە کەیسەکە، ئەو فێرخوازەش کە کرۆکی کێشەکەبوو لەو کاتەدا لە دەرەوەی وڵات بوو، بەڵام چاوەڕوان دەکرا دوای گەڕانەوەی بۆ وڵات ڕووبەڕووی هەمان لێپێچینەوەی یاسایی ببێتەوە.

ڕووداوی گزیکردنەکەی پانتال(Pental) و شێوازی سزادانەکەی لەسەر ئاستی هەموو جیهان دەنگی دایەوە، چونکە بڕیاردان بە بەندکردنی مامۆستایەکی زانکۆ وەك تاوانبارێك لەسەر ناپاکی ئەکادیمی ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بووبێت تا ئەو ساتە وەختە شتێکی نامۆبوو، پێشتر دەیان و سەدان ڕووداوی لەو چەشنە ڕووی دابوو بەڵام جۆری سزادان تاوانەکە نەگەیشتۆتە ئاستی بەندکردن، بۆ نموونە لە واتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا توێژەری وا هەبووە ملیۆنەها دۆلاری لە ڕێگەی پرۆژەیەك دەستکەوتوو کە لە ڕێگەی گزیکردنەوە ئەنجامی داوە، یان پرۆژەیەکی دووانە یان دووبارە بووە، لە زۆربەی کاتدا سزاکان ڕەتکردنەوەو پوچەڵکردنەوەی پرۆژەکان و ڕاگرتنیان بووە، یان پێ بژاردنی بڕێك پارە بووە، یاخود قەدەغەکردنی توێژینەوە کاری بووە لێیان، لە قورسترین جۆری سزاشدا کەسی گزیکەر پلەو پایەی زانستی لێ سەندراوەتەوە و لە زانکۆ و ناوەندە زانستیەکەی دوورخراوەتەوەو دەرکراوە، بەڵام وەك تاوانبارێك لە دادگادا سزا نەدراوە بە تایبەت سزای بەندکردن(Bailey , ٢٠١٤).

## ٩. ١٢-مستەفا مارۆشی Mustapha Marrouchi

مستەفا مارۆشی(Mustapha Marrouchi) بەرەچەڵەك بەربەر خەڵکی باکوری ئەفریقیایە، لە فەرەنسا خوێندویەتی و ماستەر و دکتۆرای لە ئەدەبی بەروردکاری وەرگرتووە، دواتر چۆتە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆتە مامۆستای زمانی ئینگلیزی لە زانکۆی نیڤادا ( Nevada University) لە لاس ڤیگاس(Las Vegas)، نوسەری چەندین توێژینەوە و بەرهەمی ئەدەبی و بەراوردکاری و ڕەخنەیی بووە، لەوانە منداڵێتی و ترس(Childhood and fear) ، ئیسلام و تیرۆر(Islam and terrorism)، ئیدوارد سەعید لە کۆتاییدا( Edward Said at the limit).

مارۆشی(Marrouchi) لە نووسیندا گرنگی بە بوارگەلیکی جۆراوجۆر داوەو بەرهەمەکانی پێك هاتوون لە کتێب و توێژینەوەو وتار و ڕاپۆرت و وتاری ئەلکترۆنی، یەکێکە لەو نوسەرانەی لەسەر زۆرترین بابەت و بە زۆرترین شێواز شتی نوسیووە، بەڵام بە سەرنجدان لە کۆی بەرهەمەکانی تەنانەت لە وتارێکی سادەیدا تێبینی پشت بەستن بەسەرچاوەگەلی جۆراوجۆر بە بیّ گرنگی بە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەو ئامازەکردن بە سەرچاوەکان دەکرێت، لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا ڕاستەوخۆ پشتی بە لاسایی کردنەوەی شێوازی نووسینی نوسەرێك یان وەرگرتنی چەند برگە لە نووسینی نوسەرێکی تر بەستووە، بۆ ئەم مەبەستە سوودی لە بەرهەمەکانی چەندین نوسەر و وەك، ئیدوارد سەعید(Edward Said)و سەلمان روشدی(Salman Rushdie) وسلاڤۆی ژیژەك ( Slavoj Zizek) و لویس میناند(Louis Menand)و تیری ئیگلتن (Terry Eagleton) و جۆن ئاپدایك(John Updike) بینیووە (Read, ٢٠١٤) .

ساڵی ٢٠١٤ مارۆشی(Marrouchi)بە گزیکردن تاوانبارکراو دوای سەلماندنی تاوانەکانیشی مافی مامۆستایەتی بەشی زمانی ئینگلیزی زانکۆی نیڤادا (Nevada University) ی لیّ سەندرایەوە لە زانکۆ دەرکرا، ساڵی ١٩٩٢ بۆیەکەم جار مارۆشی(Marrouchi) بە وەرگرتنی چەند برگەیەك لە وتاری (W. J. T. Mitchell) تاوانبار کرا کە لە گۆڤاری ( London Review of Books) بلاوی کردبووەوە، ساڵی ١٩٩٤ هەریەکە لە تێری ئیگلتن( Terry Eagleton) و گایاتری سپیڤاك(Gayatri Spivak)لە گۆڤاری( New Statesman)ناوبراویان بە گزیکردن لە بەرهەمەکانیان تۆمەتبارکرد. ساڵی ١٩٩٩ لە گۆڤاری (London Review of Books) ستیفان هاو (Stephen Howe) لە وتارێکیدا لە میانی

پێداچوونەوەی بە کتێبێك مارۆشی بە گزیکردن تاوانبارکرد و بەڵگەی گزیکردنەکەشی خستەڕوو. ساڵی ٢٠٠٨ لە وتارێکدا کە مارۆشی لە گۆڤاری کالالو (Callaloo) بلاوی کردبووەوە بە وەرگرتنی چەندین برگە لە پێداچوونەوەی فیلمی ٣٠٠ تاوانبارکرا کە ساڵێك پێشتر لە لایەن دیڤید دینبی(David Denby)یەوە نوسرابوو. لە ئابی ٢٠١٤ وتارنوسێك لە لە وتارێکیدا لە گۆڤاری (Chronicle of Higher Education) مارۆشی بە گزیکردن لە زنجیرەك سەرچاوە تاوانبارکرد. هەموو ئەو بابەتانە بووە هۆی ئەوەی زانکۆی نیڤادا(Nevada University) لێکۆڵینەوە لە کەیسی مارۆشی بکات و لە نۆڤەمبەری ساڵی ٢٠١٤ بریاری دەرکردنی لە زانکۆکە بدات، ئەویش دوای ئەوەی بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکار سەلماندیان مارۆشی لە کۆی ٢٦ توێژینەوەی زانستی لە ٢٢ توێژینەوەدا پەنای بۆ گزیکردن بردووە کە لە نێوان سالانی ٢٠١٨-٢٠١٣ بلاوی کردوونەتەوە. چوار لە ئەندامانی لیژنەی لێکۆڵینەوە لە کەیسەکە لە کۆی پێنج ئەندام بریاری سزادانی ناوبراویان دا لە بەرامبەر یەك ئەندام کە لایەنگری سزادانێکی لەو شێوەیە نەبوو، بە پێی ڕۆژنامەی لاس ڤیگاس ڕیڤیو ژورناڵ (Las Vegas Review-Journal) لە ساڵی ٢٠١٣ موچەی مانگانەی مارۆشی لەو کاتەدا ١٢٥,٨٣٥ هەزار دۆلار بووە ( UNLV English professor fired for plagiarizing Updike, Said, Zizek, and more, www. retractionwatch. com).

ئەوەی جێگەی سەرنجە لەم چیرۆکەدا گەورەیی قەبارەی گزیکردنەکەیە کە مارۆشی لە ماوەی ٢٠ ساڵ پیشە ئەکادیمیەکەی لەسەر بنیات ناوە، ماوەی بیست گزیکردن و وەرگرتن و دەست بردن بۆ بەرهەمی کەسانی تر بە بێ گەڕانەوەو ئاماژەکردن بە سەرچاوەکانیان کەچی لەم ماوە دوور و درێژەدا دووچاری هیچ جۆرە سزایەك نەبووە، تەنانەت دوای چەند جار ئاگادارکردنەوەشی کەچی لەسەر ڕەفتارە گزیکاریەکانی بەردەوام بووە، بەڵام دواجار لە دوای ٢٠ ساڵ باجی هەموو گزیکاری و ناپاکیەکانی دەدات و پیشە ئەکادیمیەکەی لێ دەستێنرێتەوەو لە زانکۆ دەردەکرێت. ئەم چیرۆکە ئاماژەیەکە بەوەی ڕەنگە کەسانێك بتوانن لە بواری ئەکادیمیدا بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ بە بێ بەرەبەست و بە بێ هیچ جۆرە سزایەك پەنا بۆ گزیکردن و ناپاکی کردن لەپیشەکەیان ببەن، بەڵام دۆخەکە تا سەر نابێت و لە کۆتاییدا سزای ناپاکیەکانیان وەردەگرن، لە هەمان کاتیشدا زەنگێکە بۆ زانکۆ و ناوەندە ئەکادیمیەکان بۆ چۆنیەتی وەستانەوە بەرامبەر بە دیاردەکەو هەوڵدان بۆ بنبڕکردنی(Bailey , ٢٠١٤).

## ٩. ١٣- ماری لویز گاموشیان و گزیکردن لەکاری هەواڵسازی Marie-louise Gumuchian and plagiarism in news editor work

ماری لویس گاکوشیان(Marie-louise Gumuchian) بەناوبانگترین نوسەرو ڕۆژنامەنوس و هەواڵنێری ئەمەریکی بوو کە بە شارەزایی و کارمەیی لە کارەکەیدا سەرنجی زۆربەی دەزگا ڕاگەیاندنەکان و خەڵکی جیهانی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو، تەنانەت تا پێش ئاشکرابوونی ڕووداوی گزیکردنەکەی زۆرێك لە دەزگا هەواڵیەکان گرەویان لەسەر بەدەست هێنانی کردووە، یەکێك بوو لە هەواڵسازانەی کە گرنگیەکی زۆری بە ڕووداوەکانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست داوە.

لە مانگی ئایاری ساڵی ٢٠١٤ کەناڵی (CNN) بڕیاری دەرکردنی ماری گاموشیان (Mari Gumuchian)ی نوسەرو هەواڵنێری کەناڵەکە دا، ئەم بڕیارە دوای ئەوە هات کە ئاشکرا بوو گاموشیان (Gumuchian) لە ٥٠ هەواڵنامەدا ١٢٨ جار دوچاری گزیکردن بووە، هەواڵی دەرکردنەکەشی لە سایتی کەناڵەکە بلاۆکرایەوە. هاوکات لەگەڵ بڕیاری دەرکردنەکە کەناڵەکە بڕیاری لابردن وڕاستکرنەوەی هەموو ئەو هەواڵنانەی دا کە گزیکردنیان تێدا کراوە. هەوەرها بە پێی ڕاگەیاندنی کەناڵەکە گاموشیان پێش کارکردنی لە (CNN) لە ئاژانسی هەواڵی ڕۆیتەرز(Reuters News)کاری کردووە، زۆربەی ئەو هەواڵنامانەش کە گزیان تێدا کراوە هی ئەو سەردەم کە لەو ئاژانسەدا کاری کردووە نەك ئەو هەوڵنامانەی کە لە کارکردن لەگەڵ کەناڵی (CNN) ئامادەی کردوون، ئەم ئاشکرابوونەش دوای پڕۆسەی پێداچوونەوە و وردبینی ئاسایی (CNN) بۆ کارنامەی شەش مانگی ڕابردووی گاموشیان(Gumuchian) لە کەناڵەکە دەرکەوتووە (Bailey , ٢٠١٤).

ئەم کەیسە یەکێکە لە کەیسەگرنگەکانی ساڵی ٢٠١٤ لە بواری گزیکاریدا، گرنگیەکەی لەوە دایە کە ئاشکرابوون و دەرکەوتنی گزیەکە لە ڕێگەی پڕۆسەی وردبینی ناوخۆیی بووە لە کەناڵی (CNN) نەك لایەنی دەرەکی، ئەمەش گوزراشت لە دوو ڕاستی گرنگ دەکات، یەکەمیان گوزراشت لە گرنگی پڕۆسەی پێداچوونەوەو وردبینی ناوخۆیی و دووەمیشیان گوزراشت لە ئاستی کوالێتی و کۆنتڕۆڵکاری و ئاستی ڕێزگرتنی کەناڵەکە لە جەماوەرەکەی دەکات بەوەی بڕیاری داوە سەرجەم ڕاپۆرت و هەواڵنامەکانی ئەم هەوڵسازە لە کەناڵەکەدا لابەرێت (ڕجب، ٢٠١٦).

## ٩. ١٤–نیل هارمان و گزیکردن لە بواری هەواڵسازی وەرزشی Neil Harman and plagiarism in the sports news reporter

نیل هارمان(Neil Harman) یەکێك لە دیارترین و بەناوبانگترین نوسەر و راپۆرتنووسی بواری تێنس بووە، نوسەری چەندین کتێبی بوارەکەو بۆ چەندین ساڵ پەیامنێری رۆژنانەی تایمز (Times) و نوسەری کتێبی ساڵانەی ویمبلدون(Wimbledon)بووە. هەروەها پەیامنێری تۆپی پێ و تێنس لە رۆژنامەی دەیلی مەیل(Daily Mail) و پەیامنێری تێنس بووە لە رۆژنامەی سەندای تەلگراف(Sunday Telegraph)، بە هۆی چالاکی ولێهاتوویی لە بوارەکەیدا لە خوێنەر هەوادارو لایەنگریکی زۆری هەبووە، بەڵام بە شێوەیەکی کت و پر گۆڕانکاریەکی گەورە لە ژیانی پیشەی و کەسی هارمان(Harman)ڕوویدا، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ناوبراو بە گزیکردن تاوانبار کراو دوای لێکۆڵینەوە لە کەیسەکە سزادراو لە پیشەکەی دوور خرایەوە.

لە بەهاری ساڵی ٢٠١٤ لە لایەن رێکخەرانی پاڵەوانێتی ویمبلدۆن بۆ یاری تێنس(Tennes) داوا لە هارمان(Harman)کرا وەك بەڕێوەبەری کتێبی ساڵانەی ویمبلدون(Wimbledon) ئامادەی کۆبوونەوەیەکی فراوان بێت، لە کۆبوونەوەکەدا بە گزیکردن لە کتێبی ویمبلدون لە ساڵی ٢٠١٣ تاوانبار کرا، چونکە کتێبەکە ١٦٠ لاپەڕەی پڕ زانیاری لەخۆ گرتبوو بێ ئەوەی هیچ جۆرە ئاماژەیەك بە سەرچاوەی زانیاریەکان کرابێت.

ڕووداوی گزیکردنی هارمان(Harman) چیرۆکی کەوتن و شکست خواردنی رۆژنامەنوسێکی ناودارو بەناوبانگی بواری تێنسە کە پێگەو رێزێکی بێ ئەندازەی لە نێو بوارەکەدا هەبووە، لە هەمان کاتدا رۆڵ و کاریگەری ڕووداوەکە بەسەر ناو ناوبانگی دەزگایەکی وەك ویمبلدون (Wimbledon) کە لە نێو زۆربەی رێکخراوە وەرزشیەکاندا رێز و بەهایەکی بێ وێنەی هەبووە، چونکە شکستی هارمان وەك نوسەرێك لە کارەکەیدا بۆتە هۆی شکستی ویمبلدون (Wimbledon) وەك دەزگاو لایەنی کار، شکستەکەشی لە ئاشکراکردنی گزیەکی گەورە نەبووە لە کتێبەکەی هارمان(Harman)دا، بەڵکو لەوەدا بووە کە نەیتوانیوە دوای ئاشکرابوونی گزیەکە کتێبەکە لە بازار بکێشێتەوە، چونکە دەزگا لە ڕووبەڕووبوونەوەی گزیکردندا ئەرك و بەر پرسیاریەتێکی گەورەی هەیە بە تایبەت کاتی ئاشکرارکردنی، بۆیە بە پلەی یەکەم لەو کەیسەدا ویمبلدون(Wimbledon)شکستی هێناوە (Bailey, ٢٠١٤).

## ٩. ١٥-مۆرین داود و گزیکردن لە ڕۆژنامەگەری Maureen Dowd and plagiarism in journalism

مۆرین داود(Maureen Dowd) یەکێك بووە لە بەناوبانگترین ڕاپۆرت نووس و ستوون نووسەکانی ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز(New york times) کە بە شێوازێکی توندوتیژ و وروژێنەر ناسرابوو، پەیامنێری گۆڤاری تایم(Time) و نیویۆرك تایمز(New York Times) و یەکێك بووە لە باشترین ڕاپۆرتنووس و ستوونوسەکانی نیویۆرك تایمز، ، ساڵی ١٩٩٩ خەڵاتی پۆلیتزەری (Pulitzer Prize) پێ بەخشراوە( Maureen Dowd, American reporter and columnist, Encyclopedia Britannica, www. britannica. com). لە ئاياری ساڵی ٢٠٠٩ داود(Dowd) ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی گەورە بۆوە بەرامبەر کۆتا ستوونەکەی کە لە ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز(New york times) بلاّوی کردبووەوە تیایدا پشتی بە ستوونێکی جۆش مارشال(Josh Marshall) بەستبوو کە پێشتر لە ڕۆژنامەی (TalkingPointsMemo) بلاّوی کردبووەوە، بە پێی سایتی (PlagiarismToday. com) لە کاتی بەراوردکردندا دوو برگەی هاوشێوە لە هەردوو ستوونەکەدا دەرکەوتووە کە ٤٠ وشەیان لەخۆگرتووە، ئەمەش بەڵگە بووە لەسەر ئەوەی ستوونوسی دووەم زانیاریەکانی لە ستوونوسی یەکەم وەرگرتووە بە بێ گەڕانەوەو ئاماژەکردن بە ستوونەکەی کە هەفتەیەك پێشتر لە ڕۆژنامەیەکی تر بلاّوبۆتەوە. لە بەرامبەر تاوانبارکردن و خستنەڕووی بەڵگەی گزیکاریەکەی داود (Dowd) داوای لێ بوردنی کردووەو دانی بە هەڵەکە ناوەو کە لە نووسینی ستوونەکە یەکێك هاوڕێکانی یارمەتی داوە کە پێشتر ستوونەکەی جۆن مارشال(Josh Marshall)ی خوێندۆتەوە (Bailcy , ٢٠١٤).

ڕەنگە ڕوداوی گزیکردنەکەی داود(Dowd)بە مەبەست نەبووبێت و قەبارەی گزی کردنەکەشی هێندە گەورە نەبووبێت، بە تایبەت ئەو ستوونوسێکی بە توانتر بووە لە مارشاڵ (Marshall) و ڕۆژنامەکەشی ڕۆژنامەیەکی بەرزتر بووە، ڕەنگە ڕوداوەکە دروست کراویش بووبێت چونکە هەردوو ستوونوسەکە سەر بەدوو بەرەی جیاوازی سیاسی بوونە، بەلاّم لەگەڵ هەموو ئەو ئەگەرانەشدا گزیکردن چ گەورە بێ یان بچووك، چ مەبەستدار بێت یان بێ مەبەست هیچ پاساوێکی بۆ نیە، دوا جار داود(Dowd) نەك هەر دانی ناوە بە گزیکردنەکە، بەڵکو ئەوەشی ئاشکرا کردووە کە لە نووسینی ستوونەکەیدا کەسێکی تر یارمەتی داوە، ئەمەش قەبارەی گزیکردنەکەی گەورەتر کردووە.

## ٩. ١٦- گزیکردنی بە کۆمەڵ لە کۆریای باشوور South Korea's Massive Plagiarism

کۆریای باشوور(South Korea) یەکێکە لە وڵاتە هەرە پێشکەووەکانی کیشوەری ئاسیا کە ساڵانە سەدان توێژینەوەی زانستی لەسەر ئاستێکی بەرز تێدا ئەنجام دەدرێت، لە بواری توێژینەوەکاریدا زۆر جار پلەی یەکەم و هەندێ جاریش دوای ئیسرائیل بە پلەی دووەم دێت.

لە سەرتای ساڵی ٢٠١٦ هەواڵی ئاشکرابوونی گزیکردنێکی بە کۆمەڵ تەواوی وڵاتی کۆریای گرتەوە، گزیکردنێك کە زیاتر رەهەندێکی ئەفسانەیی بەخۆوەگرتبوو تیایدا ٢٠٠ مامۆستا لە ٥٠ زانکۆی ئەو وڵاتە بە هۆی گزیکردن و ناپاکی ئەکادیمیەوە ڕووبەرووی لێکۆڵینەوەو سزای یاسایی بوونەوە. دوای لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکان دەرکەوت زۆربەی ئەو مامۆستایانە هەوڵیان داوە بە ڕێککەوتن لەگەڵ کەسانی تر خۆیان بکەنە خاوەنی کۆمەڵێك کتێب و توێژینەوە کە بەرهەمی خۆیان نەبووەو هیچ جۆرە بەشداریەکیان لە نووسین و ئامادەکردنیاندا نەبووە.

بە پێی ڕاپۆرتی داواکارانی گشتی کەیسەکە، زۆربەی ئەومامۆستایانە لە کاتێکدا ناپاکیان کردووە کە پلەو پایەی بەرزیان پێ دراوەو پێگەی زانستی وئەکادیمی خۆیان بە خراپی بۆ ئەم مەبەستە بەکارهێناوە، یاخود هەوڵیان داوە لە ڕێگەی گزیکردنەوە پۆست و پلەی بەرز بەدەست بهێنن. بۆ نموونە داوایان لە توێژەرێك یان گرووپێکی توێژەر کردووە کە توێژینەوەیەکیان ئەنجام داوە ناوی ئەوان وەك بەشداربوویەکی توێژینەوەکە تۆمار بکەن. یان لە کاتی نووسینی کتێبێکدا داوایان لە نوسەری کتێبەکە کردووە لە پاڵ ناوی خۆی ناوی ئەوان وەك نوسەری دووەم بخەنە سەر کتێبەکە، هەندێ جار لە ڕێگەی بەرتیل و پارەو هەندێ جاری تر بە ڕێککەوتن لەگەڵ نوسەر و توێژەرە ڕاستەقینەکان ودەزگاکانی چاپ و وەشاندن کارەکەیان ئەنجام داوە، ئامانجی هەموو لایەکیشیان بە گشتی بەرژەوەندی تایبەت تابەت بووە وەك بە دەستهینانی پارەو گەشتن بە پلەو پۆستی بەرزبووە.

بە پێی ڕاپۆرتی داواکارانی گشتی ڕیشەی دیاردەکە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٠ بەلام درەنگ ئاشکرا بووە، هەرچەندە لە دوای ساڵی ٢٠٠٠ ەوە هەوڵەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ناپاکی ئەکادیمی چڕوپڕتر کراون، بۆ نموونە ساڵی ٢٠٠٥ چیرۆکی سەرکەوتنی توێژینەوەکەی هوانگ ئو سووك(Hwang Woo-suk) دەبارەی کۆپیکردنی کۆرپەلە لە مرۆڤدا ( Cloning

سەرەنجی هەموو جیهانی ڕاکێشا، بەڵام دواتر دەرکەوت توێژینەوەکە(human embryos) دروستکراوەو هیچ بنەمایەکی زانستیان نیە، بۆیە لەسەر بابەتەکە نابراو سزا درا. هەوەرها ساڵی ٢٠١٣ بەڕێوەبەری دەستەی فەرمانبەرانی نووسینگەی سەرۆکی کۆریا بە گزیکردن لە نامەی دکتۆراکەی تاوانبارکراو دوای سەلماندنی ناپاکیەکە لەسەر کردارەکە سزا درا، ئەمانەو چەندین کەیسی دیکەی گزیکاری کە کەسانی دیار و بەناوبانگ تێوەی گلابوون لە ناویاندا وەزیری تەندروستی و بەڕێوەبەری تەلەفزیۆنی و ئەندامی لیژنەی ئۆلومپی نێودەوڵەتی، بەڵام لە ساڵی ٢٠١٦ دا گزیکردن لە شێوەو فۆڕمێکی کۆمەڵکاریانەی ئابڕوو بەرانە ئاشکرابوو کە گەورەترین و ڕێکخراوترین پڕۆسەی گزیکاری بووە لە جیهاندا.

لە کۆتایی ڕاپۆرتی داواکارانی گشتی کەیسەکەدا هاتووە زۆربەی مامۆستاکان و هاوکارەکانیان لە گزیکردندا لە کاتی لێکۆلینەوە دانیان بە هەڵەو تاوانەکانیان ناوەو سزا دراون. پە پێی یاساکانی وڵاتی کۆریاش ناپاکی ئەکادیمی تاوانێکی گەورەیەو گزیکار لە بەرامبەر کردەوەکەدا تا ٥٠ ساڵ زیندانی دەکرێت و بە بڕێك پارە تا دەگاتە ٥ ملیۆن یەن کە دەکاتە ٤٢٠٠٠ هەزار دۆلاری ئەمەریکی سزا دەدرێت. هەروەها بە پێی یاساو ڕێسای زانکۆکانی ئەو وڵاتە هەر مامۆستایەك لە بەرامبەر ناپاکی کردندا بە بڕی زیاتر لە ٣ ملیۆن یەن کە دەکاتە ٢٥٠٠ دولاری ئەمەریکی سزا درابیت مافی گەڕانەوەی بۆ زانکۆ و دووبارە دەست بەکاربوونەوە نیەو لە ئەنجامدا گزیکار پیشەکەی لە دەست دەدات(Bailey, ٢٠١٧).

## سەرچاوە عەرەبییەکان


ابراهيم، محمد. (٢٠١٤). كيف تستخدم الخرائط الذهنية لإطلاق العنان لإبداعك؟!، اراجيك، تاريخ الاسترداد ٣ اذار، ٢٠١٧، من https://www.arageek.com/٢٠١٤/٠٦/٢٥/how-to-create-mind-map.html

إبن خلدون، عبالرحمن بن خلدون. (٢٠٠٨). مقدمة ابن خلدون، ط١، القاهرة، مؤسسة المختار.

اوباري، الحسين(٢٠١٥) ٦ من افضل ادوات اكتشاف الانتحال العلمي – البلاجياريزم، تعليم الجديد، تاريخ الاسترداد ١ كانون الاول، ٢٠١٨، من https://www.new-educ.com

الجابرى، محمد. (١٩٨٤). تكوين العقل العربي، بيروت ، مركز دراسات الوحدة العربية.

الجابرى، محمد. (١٩٨٦). بنية العقل العربي، بيروت ، مركز دراسات الوحدة العربية.

الجبوري، حيدر غضبان محسن(٢٠١١) اهمُ تعريفات اللّغة عندَ علماء اللّغةِ الغربيّينَ، جامعة بابل، كلية الاداب، تاريخ الاسترداد ٤شباط، ٢٠١٧، من http://www.uobabylon.edu.iq/uob Coleges/lecture.aspx?fid=٨&lcid=١٨٦٦٨

الرفاعي، نجيب عبدالله . (٢٠١٣). الخريطة الذهنية-خطوة. . . خطوة، ط٣، الكويت، معهدمهارات للاستشارات والتدريب.

الرشيدي ، فهيمة سعد خلف (٢٠١٧) فن المقالة وانواعها، موقع الدكتورة عائشة الحكمي، ٢٥ يونيو، ٢٠١٧، تاريخ الاسترداد ١ تشرين لاول، ٢٠١٧، من http://www.dr-aysha.com/inf/articles.php?action=show&id=٤٤٤٧

السماك، محمد ازهر سعيد واخرون(١٩٨٦) اصول البحث العلمي، ط١، جامعة الوصل، دار الكتب للطباعة والنشر.

الشهراني، سعد بن علي. (٢٠١١). الكتابة الأكاديمية – خصائصها ومتطلباتها ، الرياض، جامعة نايف العربية للعلوم الأمنية.

الفضلي، عبدالهادي (١٩٩٢) اصول البحث، ط١، بيروت، دار المؤرخ العربي.

الكتابةالاكاديمية، مفهوم الكتابة الأكاديمية وخصائصها، تاريخ الاسترداد، ٢ كانون الثاني، ٢٠١٧ ، من www.sites.google.com

الكتابة الأكاديمية، مهارات الكتابة الأكاديمية، تاريخ الاسترداد، ٢ كانون الثاني، ٢٠١٧، من www.sites.google.com

العزاوي، عبدالرحمن حسين (٢٠٠٨) اصول البحث العلمي، ط١، عمان، دار الخليج للنشر والتوزيع.

الموسى، سمر . (٢٠١٤)٥ . خطوات لتعلم أساسيات الكتابة الأكاديمية، موقع سمر الموسى، تاريخ الاسترداد، ٤ شباط، ٢٠١٧، من http://www.samar-almossa.com/blog/p/٤٠٦١

المقال وانواعه، منتديات غيوم الثقافية، تاريخ الاسترداد، ٣١ مارس، ١٠١٧ ، من http://www. ghyoom. net/ib/index. php?showtopic=١٥٩٣

النابلسي، اديب . (٢٠٠١). فن المقالة : عناصرها و انواعها، موقع المقالات اسلام ويب، تاريخ الاسترداد، ١ تشرين الاول، ٢٠١٧، من http://articles. islamweb. net/media/index. php? Page =article&lang=A&id=٤٩٣٢

بدر، احمد (١٩٨٢) اصول البحث العلمي و مناهجه، ط٦، الكويت، وكالة المطبوعات.

حريري، عبدالرحمن . (٢٠١١). اهم الخصائص و المزايا (Literature Review) من الالف إلى الياء، موقع الاكاديمية، تاريخ الاسترداد، ١٠ كانون الثاني، ٢٠١٧، من http://educad. me /١٠٣١/ literature-review/

حفيضي، عبد الحق. (٢٠١٧). الحياة بلا بصر او سمع: قصة هيلين كيلر، دخلك بتعرف، تاريخ الاسترداد ٢٨ كانون الاول، ٢٠١٨ ، من https://dkhlak. com/life-of-helen-keller/

خضر، مجد. (٢٠١٧). كيف تعمل مجلة، خصائص المجلات، الموضوع، تاريخ الاسترداد ١٢ كانون الاول/٢٠١٧، من www. mawdoo٣. com

خليل، ابراهيم و امتنان الصمادى. (٢٠٠٩). فن الكتابة والتعبير، ط٢، عمان، دار المسيرة للنشر والتوزيع.

دورة حول نظام كشف الانتحال الأدبي (Turnitin) في جامعة البترا، جفرا نيوز، تاريخ الاسترداد ٨ كانون الثاني، ٢٠١٩، من http://www. jfranews. com. jo/. . . /more-٥٩٩٩٤-١٢-%D٨ %AF%D٩٪٨٨٪D٨٪B١٪D٨٪A٩

ربابعة، إبراهيم علي. (٢٠١٦). تعريف الكتابة ومفهومها، الالوكة الادبية واللغوية، تاريخ الاسترداد ١ شباط ، ٢٠١٧، من http://www. alukah. net/literature_language/٠/١٠١٠٩٨/

رجب، فوزى. (٢٠١٦). الانتحال العلمي. دوحة، منظمة المجتمع العلمي العربي، تاريخ السترداد ٤ تشرين الثاني، ٢٠١٨، من https://staffsites. sohag-univ. edu. eg

رمضان، رجب. (٢٠١٥). مبادرة قومية بجامعة الإسكندرية لمكافحة الانتحال العلمي في مصر، مصرس، تاريخ الاسترداد ٨ كانون الثاني، ٢٠١٩، من https://www. masress. com /almasr yalyoum/٣٧١٤٦٩٣

زكور، الأخضر . ( ٢٠٠٧ ). الأغاليط المنطقية المشهورة، تاريخ الاسترداد، ١٨ شباط، ٢٠١٧، من http://news. maktoob. com/forum/news٢٨٣٥

زهدي ، عبدالرؤوف و ابوزيد، سامي يوسف . (٢٠٠٩). فن المقالة ، ط٣، الكويت ، مكتبة الفلاح للنشر والتوزيع.

شبلي، احمد . (١٩٩٠) . كيف تكتب بحثا او رسالة، ط٢١، القاهرة، مكتبة النهضة العربية.

شكشك، انس . (٢٠٠٨). علم النفس العام والقوى النفسية المعرفية والقوى النفسية المحركة للسلوك، ط١، حلب، دار المنهج للدراسات والنشر والتوزيع.

صالح، عماد عيسى و السيد، اماني محمد . (٢٠١٣). دور المكتبات الاكاديمية في منع السرقات العلمية واكتشافها . تاريخ الاسترداد١ كانون الاول، ٢٠١٨، من www. kau. edu. sa/Files / ١٢٥١٠/ Researches/٦٣٥٧٢_٣٤٧١٩. pdf

صبيح، ابراهيم واخرون. (١٩٩٧). فن الكتابة والتعبير، دار الحامد للنشر والتوزيع، عمان–الاردن

عقوبات قاسية بحق أساتذة الجامعات المتهمين بالسرقة العلمية (٢٠١٥) صحيفة عاجل الالكترونية، الأربعاء ٦ مايو، ٢٠١٥، تاريخ الاسترداد ٩ كانون الثاني، ٢٠١٩، من https:// qa . ajel. sa/local/١٥٦٤٧٦٦

عناية، غازي . (٢٠٠٨). البحث العلمي–منهجية اعداد البحوث والرسائل الجامعية (بكاليوريوس، ماجستير، دكتورا)، ط١، عمان ، دار المناهج للنشر والتوزيع.

عيساني، طه . ( ٢٠١٥ ). الممارسات الأكاديمية الصحيحة واساليب تجنب السرقة العلمية، مقال ضمن اعمال ملتقى ادبيات البحث العلمي الجزائر، ٢٩ ديسمبر ٢٠١٥.

فضل اللة، مهدي. (١٩٩٣). اصول كتابة البحث و قواعد التحقيق، ط١، بيروت، دار الطليعة .

فن إعداد التقارير وكتابتها، ستوب–منتدى البحوث الجامعية والمدرسية الشاملة، ٢٥، نوفمبر ٢٠١١، تاريخ الاسترداد، ٦ حزيران، ٢٠١٧، من http://www. stop٥٥. com/٣٤٥٤٧٢. html

فوائد الخرائط الذهنية، النجاح، تاريخ الاسترداد ٤ اذار، ٢٠١٧، من https://www. annajah. net /article-٩٧٥١

فودة، حلمي محمد و عبداللة، عبدالرحمن صالح (١٩٧٥) المرشد في كتابة الابحاث، عمان، دار الفكر ناشرون وموزعون.

قنبر، هدى عباس و عبداللة، يسرى محمد(٢٠١٧)الاستدلال العلمي في الرسائل والاطاريح الجامعية ، طرائق كشفها وسبل تجنبها، مجلة الاستاذ، العدد الخاص بالمؤتمر العلمي الخامس لسنة ٢٠١٧.

كيف تلخص؟رمسات عمانية، تاريخ الاسترداد، ٢ تشرين الثاني، ٢٠١٧، من http://forum. ramsat. net/showthread. php?t=٧٥١٥#. Wib١mtKnHIU

كيف تكتب ملخصا او خلاصة البحث، منتديات المنشاوي، تاريخ الاسترداد، ٦ تشرين الثاني، ٢٠١٧، من http://www. minshawi. com/vb/showthread. php?t=٢٠٢٢

كيف تكتب مراجعة لكتاب (Review) ؟ مدونة مؤرّخ، تاريخ الاسترداد، ١٢، تشرين الاول، ٢٠١٧، من http://www. sahistorian. com/٢٠١١/٠٤/review. html

كيف تجنب طلابك خطأ الوقوع في السرقة العلمية؟ جامعة الملك سعود، المكتبة الرقمية السعودية ، تاريخ الاسترداد ٨ كانون الثاني، ٢٠١٩، من https://www. sdl. edu. sa /SDLPortal/ ar/post. aspx ?p=٧٨٢٤

ماهر، احمد. (٢٠١٤ ). كيف ترفع مهاراتك في الاتصال، الاسكندرية، دار الجامعية.

نحو كتابة افضل، البوابة الهدى للثقافة والاعلام، تاريخ السترداد، ١ مارس، ٢٠١٧، من http:// www. siironline. org/alabwab/alhoda-culture/٠٩٢. html

# سەرچاوە ئینگلیزیەکان


About iThenticate Plagiarism Detection Software. iThenticate,Retrived on Sep ٢٠, ٢٠١٨,from http://www. ithenticate. com/about

Abrams. A. R (٢٠١٧) Jeff Koons and Centre Pompidou Lose Copyright Infringement Case. Arnet news. Retrived on Nov١٢, ٢٠١٨. from https://news. artnet. com/art-world /jeff-koons-pompidou-lose-copyright-infringement-case-٨٨٧٣٢٤

Academic Writing Definition" Reference, Retrived on ٤ Feb, ٢٠١٧, from https:// www. reference. com/education/academic-writing-d٠ed١٩٦a٤٧١٤٢c٨e

Academic Code of Conduct (٢٠١٥) Concordia University. Retrived on January ٦, ٢٠١٩ . from http://www. concordia. ca/students/academic-integrity/plagiarism. html

Academic Integrity,The University of British Columbia. Retrived on January٤, ٢٠١٩ . from https://learningcommons. ubc. ca/academic-integrity/

Academic integrity and plagiarism,Leeds University Library,Retrived on January ٤, ٢٠١٩. from https://library. leeds. ac. uk/info/١٤٠١/academic_skills/٤٦/academic _ integrity and_plagiarism

Academic integrity ,Types of plagiarism, University Of Bradford, Retrived on Nov ٩, ٢٠١٨. from https://www. brad. ac. uk/library/find-out-about/plagiarism/types-of-plagiarism/

All types of plagiarism including examples (٢٠١٨) scribbr,Retrieved November ١٣, ٢٠١٨,from https://www. scribbr. com/plagiarism/types-of-plagiarism/

Avoiding plagiarism. SFU Library. Retrived on January٨, ٢٠١٩. from https://www. lib. sfu. ca/help/academic-integrity/plagiarism

Avoiding Plagiarism. Duke University Libraries. Retrived on January٨, ٢٠١٩. from https://library. duke. edu/research/plagiarism

Avoid Plagiarism, University of Texas Libraries, Teaching & learning Services، Retrived on January١, ٢٠١٧ . from https://legacy. lib. utexas. edu/ services /instruction /avoidplagiarism. html

Benefits of using Mindview. Matchware,Retrived on January ١٢, ٢٠١٩. from http:// www. matchware. com/en/products/mindview/mindmapping. htm

Bailey,J. (٢٠١٤). Top Plagiarism Scandals of ٢٠١٤. iThenticate, Plagiarism Blog. Retrived on Nov ٩, ٢٠١٨. from http://www. ithenticate. com/plagiarism-detection-blog/top-plagiarism-scandals-٢٠١٤#. XA١ECB-NzlU

Bailey,J . (٢٠١٧). The Top ١٠ Plagiarism Stories of ٢٠١٦. iThenticate. Plagiarism Blog. Retrived on Nov ٩, ٢٠١٨. from http://www. ithenticate. com /plagiarism-detection-blog/the-top-١٠-plagiarism-stories-of-٢٠١٦#. XCj٦SCyNzIU

Bailey,J. (٢٠١٧). South Korea Faces Massive Plagiarism Scandal. iThenticate . Plagiarism Blog. Retrived on Nov ٩, ٢٠١٨. from http://www. Ithenticate. com /plagiarism-detection-blog/south-korea-faces-massive-plagiarism-scandal#. XCkK٢SyNzIU

Bailey,J. (٢٠٠٨)The Obama Plagiarism Scandal. Plagiarism Today. February ٢٠, ٢٠٠٨. Retrived on Nov٣٠, ٢٠١٨. from https://www. plagiarismtoday. com /٢٠٠٨/٠٢/٢٠/the-obama-plagiarism-scandal/

Bole, D. (٢٠١٤). The Frost King: Defending Helen Keller and Other Non-SuperHuman Deaf-Blind. David Boles, Blogs. January ٢٧,٢٠١٤. Retrived on Nov٢٨, ٢٠١٨, from https://bolesblogs. com/٢٠١٤/٠١/٢٧/the-frost-king-defending-helen-keller-and-other-non-superhuman-deaf-blind/

Campbell, R. (٢٠١٢). Academic and professional publishing. Oxford: Chandos Publishing

Carey, B. (٢٠١١). Fraud case seen as a red flag for psychology research. The New York Times, A٢.

Citation FAQ. Document provided by Turnitin. com, Retrived on January٨, ٢٠١٩. from https://website. aub. edu. lb/it/acps/Documents/PDF/faq. pdf

Checkforplagiarism. Why plagiarism checking? Retrived on Nov٣٠, ٢٠١٨. from https : //www. checkforplagiarism. net/

Costly Price of Plagiarism. Hammertime٧, Retrived on Nov١١, ٢٠١٨. from https://hammertime٧. wordpress. com/٢٠١٤/٠٣/١٦/costly-price-of-plagiarism/

Connelly Library,la salle University, Retrived on January ٦, ٢٠١٧ . from http://www . lasalle. edu/library/plagiarismandcopyright

Dartmoauth Writing Program"darmouth. edu, Retrived on Sep ٨, ٢٠١٩. from http:// www. darmouth. edu/writing/materials/student/ac-paper/what. htm

Deepak Pental. Wikipedia, the free encyclopedia,Retrived on January ٥, ٢٠١٩ ,from https://en. wikipedia. org/wiki/Deepak_Pental

Define Academic Writing"Tutor Vista. com, Retrived on ٤ Feb,٢٠١٧. from http:// www. tutorvista. com/english/define-academic-writing

Definition of Academic Writing, yourdictionary, Retrived on ٤ Feb, ٢٠١٧. from http://grammar. yourdictionary. com/word-definitions/ definition-of-academic-writing. html ؛

Definition of plagiarism. KU Leuven Education, Retrieved on Sep ٢٠,٢٠١٨. from https ://www. kuleuven. be/cnglish/education/plagiarism/definition

DupliChecker. Free online Software For Plagiarism Detection, Retrived on Sep ٢٠, ٢٠١٨, from https://www. duplichecker. com/

Education with Integrity,Turnitin,Retrived on Sep ٢٠, ٢٠١٨, from. https://www. turnitin . com/

Eighteen High Profile Cases of Plagiarism. Ranker- vote on everything. Retrived on Nov٣٠, ٢٠١٨,from https://www. ranker. com/list/high-profile-cases-of-plagiarism/janaegreen

Ernest Hemingway,What make Biblio different. Retrived on Nov ٢٣, ٢٠١٨,from https: //www. biblio. com/ernest-hemingway/author/١٤٠

Essential Elements of Academic Writing, Los Angeles Pacific University, Retrived on January٨, ٢٠١٩. from http://elearning. uc. apu. edu/helps/course_helps/writing-rcsources. html

Features of Academic Writing, ٢. elc. polyu. hk,Retrived on Sep ٨, ٢٠١٧. from http:/// www. ٢. elc. polyu. hk/CILL/comsud١/acadwrit. htm

Features of academic writing,Uefap. com. Retrived on Sep ٨, ٢٠١٧. from http:// www. uefap. com/writing/featurc/featfram. htm

Ferret - Copy-detection software. University of Hertfordshire. . Retrived on Sep ٢٠, ٢٠١٨. from http://homepages. herts. ac. uk/~comqpcl/fcrret. html

Galvan, J. (٢٠٠٦). Writing literature reviews: a guide for students of the behavioral sciences ( ٣rd ed. ). Glendalc, CA: Pyrczak Publishing.

Geoffrey P. Webb (٢٠١٧) Diederik Stapel – eminent "pop star" psychologist and blatant fraudster. Dr Geoff. March ٢١, ٢٠١٧. Retrived on January١, ٢٠١٩ . from https:// drgeoffnutrition. wordpress. com/٢٠١٧/٠٣/٢١/diedcrik-stapel-eminent-pop-star-psychologist-and-blatant-fraudster/

Hoffman, A. , Barbra, G. & Irina. ,B . (٢٠٠٦) . An Academic Writing Module: Paragraphs. Retrived on ٤ Feb, ٢٠١٧, from http://www. victoria. ac. nz /١١c/academic-writing

Horne,T &Wootton,S . (١٩٩٧) Strategic Planning:The Nine Step Programme. Kogan Page.

Kent, C. K. , & Salim, N. (٢٠١٠). Web based cross language plagiarism detection. In ٢٠١٠ Second International Conference on Computational Intelligence, Modelling and Simulation (pp. ١٩٩-٢٠٤). IEEE.

Kirkpatrick, D. D. (٢٠٠٢). Two Accuse Stephen Ambrose, Popular Historian, of Plagiarism. The New York Times.

Leo,G. (٢٠١٧). Shahid Azam reprimanded for professional misconduct by_engineering association,CBC Investigates, Retrieved on ١٣ Dec,٢٠٢٠,from https://www. cbc. ca/news/canada/saskatchewan/u-of-r-engineering-professor -found-guilty-of-plagiarizing-student-s-work-١. ٤٠٣٣٤٤٧

Literature Review: What is a Literature Review? "Camden-Carroll Library" research. moreheadstate. edu. Retrived on ١٩ Dec,٢٠١٧. from http:// research. morehead state. edu/litreview

Maureen Dowd,American reporter and columnist,Encyclopaedia Britannica. Retrived on January ٦, ٢٠١٩ ,from https://www. britannica. com/biography/ Maureen-Dowd

McCambridge, J. , McAlaney, J. , & Rowe, R. (٢٠١١). Adult consequences of late adolescent alcohol consumption: a systematic review of cohort studies. PLoS Med, ٨(٢), e١٠٠٠٤١٣.

McGwin,J & Verfaellie,M. ( ٢٠١١). The case of Diederik Stapel. American Psychological Association. Psychological Science Agenda | December ٢٠١١, Retrived on Nov١٢, ٢٠١٨. from https://www. apa. org/science/about/psa/٢٠١١ /١٢/diederik-stapel . aspx

Melania Trump, Biography, Retrived on Dec٣١, ٢٠١٨. from https://www. biography. com/people/melania-trump-٨١٢٠١٦

Michael,J. (٢٠١٧). How to Write an Objective Essay,Penandthepad, Retrived on Dec ١١, ٢٠٢٠. from https://penandthepad. com/write-objective-essay-٦٩٣٢١٦٣. html

Michael Bolton,Biography,Retrived on January ٥, ٢٠١٩ ,from https://www. biography. com/people/michael-bolton-٢٠٩٨٥٢٥١

Monceaux, A. (٢٠١٥). Ending Plagiarism: Using Technology to Scaffold Article Review and Effective Source Material Integration into Student's Work. American Journal of Educational Research, ٣(٦), ٧٣٦-٧٤١.

Organizing Your Social Sciences Research Paper: Writing a Book Review"University of Southern California" Libguides. usc. edu, Retrived on ٢ Dec, ٢٠١٧. from http:// libguides. usc. edu/writingguide/bookreview

Organizing Your Social Sciences Research Paper: The Literature Review" University of Southern California,libguides. usc. edu,Retrived on ٢٠ Dec, ٢٠١٧. from http://libguides. usc. edu/writingguide/literaturereview

Overview of Terms: The Common Types of Plagiarism,CBB. Plagiarism Resource Site. Retrived on Nov ٩, ٢٠١٨. from http://abacus. bates. edu/cbb /quiz/intro/types. html

Parker,K . (٢٠١٨) . Top ١٠ Free Plagiarism Detection Tools. Medium. com. Retrived on Nov ٢, ٢٠١٨. from https://medium. com/@kesiparker/top-١٠-free-plagiarism-detection-tools-٥bd٤٥١٢c٧aa٨

Plagiarism: information and advice. University of Bristol. Library, Retrived on January ٦, ٢٠١٧ . from http://www. bris. ac. uk/library/support/findinginfo /plagiarism/

Plagiarism Tutorial. Indiana State University, Retrived on January١, ٢٠١٧, from http:// panther. indstate. edu/tutorials/plagiarism/index. html

Plagiarism and Copyright,University of Missouri Libraries,Retrived on January ٤, ٢٠١٩. from http://libraryguides. missouri. edu/plagiarism

Plagiarism Across Europe and Beyond . (٢٠١٥). Mendel University, Conference Proceedings. June ١٠–١٢, ٢٠١٥. Brno, Czech Republic,from gs. elaba. lt/object/elaba: ٢٢٩٥٩٥١٧/٢٢٩٥٩٥١٧. pdf

Plagiarism and academic honesty,University of Sydney,Retrived on January ٨,٢٠١٩,from https://library. sydney. edu. au/help/online-training/plagiarism/

Plagiarism Detect,Retrived on Sep ٢٠,٢٠١٨,from http://plagiarismdetect. org/

Plagiarism Checker. Smallseotools,Retrived on Sep ٢٠, ٢٠١٨. From https:// small seotools. com/plagiarism-checker

Plagiarisma, Free online plagiarism checker for teachers and students, Plagiarisma. Net, Retrived on Sep ٢٠, ٢٠١٨. from http://plagiarisma. net

Plagiarism definition and meaning, Collins English Dictionary, Retrieved on Sep ٢٠, ٢٠١٨, from https://www. collinsdictionary. com/dictionary/english /plagiarism

Plagiarism Tutorial. University of Maine. Farmington,Retrived on Sep ٢٠, ٢٠١٨, from http://plagiarism. umf. maine. edu/

Plagiarism,Fine Dictoinary,Retrieved on Sep ٢٠,٢٠١٨ , from http:// www. finedictionary. com/plagiarism. html

Plagiarism,The Tech Terms Computer Dictionary, Retrieved on Sep ٢٠, ٢٠١٨, from https://techterms. com/definition/plagiarism

Plagiarism,University of Oxford, Retrieved on Sep ٢٠,٢٠١٨,from https:// www. ox. ac. uk/students/academic/guidance/skills/plagiarism?wssl=١

Peterman,K. (٢٠١٧). How to Write a Summary. wikihow,Retrieved on ٤ Dec, ٢٠١٧,from https:// www. wikihow. com/Write-a-Summary

Plagiarism, Chambers, Retrieved on Sep ٢٠, ٢٠١٨, from http://www. Chambers. co. uk/ dictionaries/the-chambers-dictionary. php#

Plagiarize, Merriam-Webster, Retrived on Sep ٢٠, ٢٠١٨, from http://www. merriam - ebster. com/dictionary/plagiarize

Profiles in Plagiarism. René Diekstra,Academia,Retrived on Nov ٢٠, ٢٠١٨, fromhttps://is. muni. cz/do/econ/soubory/oddeleni/svi/osnova/um/plagiarists /academia. htm

Rajagopalan. J (٢٠١٤) what are the types of peer review? Editage Insights" editage. Com,Retrived on ٢٠ Dec,٢٠١٧,from https://www. editage. com / insights/what-are-the-types-of-peer-review

Recognizing and Avoiding Plagiarism. Cornell University,College of Arts and Sciences,Retrieved on Sep ٢٠,٢٠١٨,from http://plagiarism. arts. cornell. edu /tutorial/ index. cfm

Read. B. (٢٠١٤) Anatomy of a Serial-Plagiarism Charge. The Chronicle of Higher Education, August ٢١, ٢٠١٤. Retrived on January ٥, ٢٠١٩ ,from https:// w ww. chronicle. com/article/Anatomy-of-a-Serial-Plagiarism/١٤٨٤٣٧

René Diekstra, Centro Botin, Retrieved on ١٣ Dec, ٢٠٢٠, from https://www. centrobotin. org/en/investigador/rene-diekstra/

René Diekstra,Wikipedia,the free encyclopedia,Retrived on Nov ٢٠, ٢٠١٨,from https://en. wikipedia. org/wiki/Ren%C٣%A٩_Diekstra

Robins, H & Crystal, D . (٢٠١٥) Language, Encyclopaedia Britanica. https:// www. britannica. com/topic/language

Sabnis,D. (٢٠١٨). How to Author a Review Article|Avoiding Plagiarism . enago academy. Retrieved Sep ٢٧, ٢٠١٨. from https://www. enago. com /academy/fraud-research-many-types-plagiarism/

Selecting A Format For Writing A Synthesis Essay: ٩ APA Tips"Vegas Valley Dance Academy. Retrived on ١٣ January,٢٠١٨. from http://www. vegasvalleydanceacademy. com/how-to-compose-a- synthesis-essay-in-the-apa-style-٩-rules/

SFU Library's Plagiarism Tutorial,Canvas course management system. Retrived on January٨, ٢٠١٩. from https://www. lib. sfu. ca/help/academic-integrity/plagiarism-tutorial

Shahid Azam. Linkedin. Retrived on Dec٣١, ٢٠١٨,from https://www. linkedin . com/pub /dir/Shahid/Azam

Stephen Edward Ambrose-American historian and author, Encyclopedia Britannica. Retrived on January ٣, ٢٠١٩ . from https://www. britannica. com/biography/Stephen-Edward-Ambrose

Student Guide to Plagiarism. Heriot-Watt University:Created October ٢٠٠٥, updated January ٢٠٠٦; July ٢٠٠٧; April ٢٠٠٨; Feb ٢٠١٧. from https://www. hw. ac. uk/students /doc/plagiarismguide. pdf

Swales, J &Christine, F . (٢٠٠٥) . Academic writing for Graduate students: Essential Tasks and Skills (٢nd Edition), Tesl-EJ, The Electronic Journal for English as a second language Volume ٨, November ٤.

Ten Types of Plagiarism Ordered From most To Least Severe. WHITE PAPER The Plagiarism Spectrum, Retrieved on Sep ١٥, ٢٠١٨. from https:// www. ed. ac. uk/files/ atoms/files/١٠-types-of-plagiarism. pdf

The little book of plagiarism,What it is and how to avoid it,Retrived on Nov ٨, ٢٠١٨. ,from hec. gov. pk/. . . /Plagiarism/Little٪٢٠Book٪٢٠of٪٢٠ Plagiarism. pdf

The University of Chicago Press,Retrived on January ٦, ٢٠١٧ . from https://www. press. uchicago. edu/index. html

Thomas,D. (٢٠١٨). How to Write a Mini Research Paper Outline,students assignment help, Retrieved on Dec ١١, ٢٠٢٠,from https://www. students assignmenthelp. com/blogs/write-mini-research-paper-outline/

Top ٨ Plagiarism Detector Tools for Teachers, Educational Technology and Mobile Learning. Retrived on Nov ٢, ٢٠١٨. from https://www. educatorstechnology. com /٢٠١٢/٠٦/top-٨-plagiarism-detector-tools-for. html

Tucker,K. (٢٠١٧). Writing a Summary Paper in APA Style ,Classroom. Retrieved on ١٤ Dec, ٢٠١٧, from http:// classroom. synonym. com/writing-summary-paper-apa-style-٦٧٤٥ ١٣٨. html

Types of Essays: End the Confusion, Time٤writing, Retrieved on Dec ١١, ٢٠٢٠. from https://www. time٤writing. com/writing-resources/types-of-essays/

UNLV English professor fired for plagiarizing Updike, Said, Zizek, and more. Retraction Watch,Retrived on January ٥, ٢٠١٩ . from https:// retractionwatch. com /٢٠١٤/١٢/٠٤/unlv-english-professor-fired-plagiarizing-updike-said-zizek/

Vivienne Westwood,Biography, Retrived on January ٣, ٢٠١٩ ,from https:// www. biography. com/people/vivienne-westwood-٢٠٦٢٤٥٨٧

Wainwright . Lisa S. Jeff Koons, American artist. Encyclopedia Britannica. Retrived on January ٥, ٢٠١٩ . from https://www. britannica. com/biography/ Jeff-Koons

Wallenfeldt,J & Mendell, D. (٢٠١٨). Barack Obama-president of United States. Encyclopedia Britannica. Dec ٢٠, ٢٠١٨. Retrived on Dec٢١, ٢٠١٨. from https://www. britannica. com/biography/Barack-Obama

Wilk, A. I. , Jensen, N. M. , & Havighurst, T. C. (١٩٩٧). Meta-analysis of randomized control trials addressing brief interventions in heavy alcohol drinkers. Journal of general internal medicine, ١٢(٥), ٢٧٤-٢٨٣.

What is Research? Explorable. com,Retrived on ٤ Feb,٢٠١٧,from https:// explorable. com/what-is-research

What is Academic writing, waylink-english, Retrived on Sep ٨, ٢٠١٩, from http:/// ww w. waylink-english. co. uk/?page=٦١٢٠

What is peer review? Elsevier" elsevier. com,Retrived on ٢٦ Dec,٢٠١٧,from https:// www. elsevier. com/reviewers/what-is-peer-review

What is plagiarism? University Concordia. Student hub, Retrieved on Sep ٢٠,٢٠١٨,fromhttp://www. concordia. ca/students/academicintegrity/plagiarim. html

What is Plagiarism? English Language Institute. Research Guides,Retrived on Sep ٢٠,٢٠١٨,from https://guides. lib. umich. edu/c. php?g=٢٨٣٣٦٢&p= ١٨٨٧١٥٧

What is plagscan, Word finder? Retrived on Nov ٢, ٢٠١٨,from https:// findwords. info/term/plagscan

Zagros,N. (٢٠١٧). Academic writing,Soran university,Center of pedagogical training and academic development,course of academic capacity development,٢٠١٦-٢٠١٧.

Zimmerman. E (٢٠١٧) How to Write a Scientific Peer Review: A Guide for the New Reviewer" Canadian ,Scinece puplishing" cdnsciencepub. com. January ٣١, ٢٠١٧ http://www. cdnsciencepub. com/blog/how-to-write-a-scientific-peer-review-a-guide-for-the-new-reviewer. aspx

## سەرچاوە فەرەنسیەکان


Binet, A. & Simon TH(١٩٠٥);Nouvelles Méthodes Pour Le Diagnostic du niveau Intellectuel Des Anormaux. Annee Psychologique.

Comment écrire un essai ? “Par Edilivre " LE ٢٠ JANVIER ٢٠١٥, Récupéré le ٢١ novembre, ٢٠١٩. De https://www. edilivre. com/communaute /٢٠١٥/ ٠١/٢٠/comment-ecrire-un-essai/#. WJNQKNJEnlU

Dandrey. P (١٩٩٦). Dictionnaire des lettres françaises: Le XVIIe siècle. Collection: La Pochothèque. Paris: Fayard,١٩٩٦.

Éviter le plagiat. Université Paris Descartes. Bibliothèques Universitaires, Récupéré le ٢٠ novembre, ٢٠١٩. De http:// parisdescartes. libguides. com /droitauteur/plagiat

Jean-François Bauret. Contre jour. Récupéré le ٢٠ novembre, ٢٠١٩. De https ://www. editions-contrejour. com/project/jean-francois-bauret/

Le plagiat et la fraude, Cégep Saint-Jean-sur-Richelieu, Récupéré le ٢١ novembre, ٢٠١٩, De http://guidemethodologie. cstjean . qc. ca/index. php/ presentation-d-un-travail/le-plagiat-et-la-fraude

Plagiat,C'est quoi le plagiat? Université Angers. Récupéré le ٢١ novembre, ٢٠١٩. De http://www. univ-angers. fr/fr/formation/anti-plagiat/c-est-quoi-le-plagiat. html

Plagiat, Définition du plagiat. Qu'est-ce que le plagiat? Université de Namur, Récupéré le ٢١ novembre, ٢٠١٩. De https://www. unamur. be/ plagiat/definition

Plagiat,Dictionnaire de français Larousse, Récupéré le ٢١ novembre, ٢٠١٩. De https://www. larousse. fr/dictionnaires/francais/plagiat/٦١٣٠١